زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

٢٦






# چۆن بانگەوازی خەڵک بکەین؟

وەرگێڕانی
حەمە ئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێداچوونەوە و راستکردنەوەی
نەوا محمد سعید

تەفسیر

١٤٢٥ك هەولێر ٢٠٠٤ز

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

◆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەررێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

◆ ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداریی و رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

◆ شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەویی و رەوتگەرایی.

◆ بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# چۆن

# بانگەوازی خەڵک بکەین

نوسینی

محمد قطب

وەرگێڕانی

حەمە ئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێداچونەوە و ڕاستکردنەوەی

نەوال محمد سعید

التفسير

٢٠٠٤ز هەولێر ١٤٢٥ك

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | چۆن بانگەوازی خەڵک بکەین |
| نوسینی: | محمد قطب |
| وەرگێڕانی: | حەمە ئەمین ئەحمەد بەرزنجی |
| پێداچونەوەی: | نەوا محمد سعید |
| چاپ و بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٢٤ك ٢٠٠٤ز |
| چاپکردن: | چاپخانەی پەروەردە |
| تیراژ: | ١٥٠٠ دانە |
| ژمارەی سپاردن: | ٢١٢ ساڵی ٢٠٠٢ |

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشەکی

بانگەوازکردن بۆ خوا بۆ ئەم نەتەوەی ئیسلامە؛ ئەرکبارییەکی هەمیشەییە:

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾: با لەئێوە کۆمەڵێك هەبێت خەڵك بانگ بکەن بۆ خێر و فەرمان بکەن بەچاکە و قەدەغەی خراپە بکەن، هەر ئەوانەش سەرکەوتوەکانن.﴿آل عمران/١٠٤.

لەبەر ئەوەی ئوممەتی ئەو پێغەمبەرەنﷺ، نێرراوەکانی خوا بەو کۆتاییان هاتووە و دواین نێرراوە، لەبەر ئەوەی ئەوە نەتەوەیەن، کە هەڵگری پەیامی ئەو پێغەمبەرەنﷺ دوای خۆی، ئەو پەیامەی بەرەورووی هەموو مرۆڤایەتی کراوە لە هەموو سەردەمێدا، لەو کاتەوە ئەو پێغەمبەرە هاتووە، هەتا ئەو کاتەی زەوی و چی لەسەرە بە میراتی دەمێنێتەوە بۆ خودا.

ئەو پەیامەش دولایەنە، لایەنێکی ئاراستەی ئەوانە کراوە، کە هێشتا بڕوایان بەم ئایینە نییە بۆ ئەوەی بانگ بکرێن بۆ بڕواهێنان پێی.

لایەنەکەی تری ئاراستەی ئەوانە کراوە، کە بڕوایان هێناوە بۆ بیرخستنەوەیان و چەسپاندنی بڕواکەیان؛ ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾: تۆ هەمیشە ئامۆژگارییان بکە و بیخەرەوە یادیان، چونکە ئامۆژگاری و خستنەوە یاد سوود بە بڕواداران دەگەیەنن.﴿الذاریات/٥٥.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ﴾: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بەردەوام دامەزراوبن لەسەر بڕواهێنان بەخوا و بەو نێرراوەی ناردوویەتی و بەو

پەیامەی ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی و ئەو پەیامەی پێشتر نێرراوەتە خوارەوە(تەورات و ئینجیل).﴾النساء/١٣٦.

بەلام ئەمرۆ نەتەوەی ئیسلام بەبارودۆخێکی تایبەتیدا تێدەپەڕێت لەوانەیە لەوەپێش پێیدا تێنەپەڕیبێت.. ئێستا ئەم نەتەوەیە زانیاری بەرامبەر ئیسلام بەشێوەیەك دابەزیوە، کە لەمێژوی ئەو ئایینەدا بێوێنەیە، مومارەسەکردنی بۆ ئیسلام زۆرتر لەو دابەزیوە.

لەبەر ئەوە ئەمرۆ ئەرکی بانگەوازکردن زۆر مەترسی‌دارترە لە ئەرکەکانی بانگەوازکردنی سەردەمەکانی ڕابردو، ئەرکی ئەمرۆ تەنها بیرهێنانەوە نیە، بەڵکو ئەرکی بانگەوازکردنە بۆ دروست بونەوە، دروست بونەوەی ئەو تەلارەی بناغەکانی ڕۆچون و لە ڕماندان، چونکە ئێستا نەتەوەکانی تر لە هەموو لایەکەوە دەمیان ژەنۆتە سەر نەتەوەی ئیسلام، وەك پێغەمبەرﷺ ڕایگەیاندوەو فەرمویەتی: ((يُوشَكُ أن تَداعى عَلَيكُمُ الأُمَمُ كَما تَدَاعى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِها: خەریکە نەتەوەکان دەمتان تێبژەنن بتانخۆن، وەك خۆرە چۆن دەم ئەژەنێتە خواردنەکەی))، وتیان: ئایا ئەوە لەو کاتەدا لەبەر ژمارە کەمیمان دەبێت، ئەی نێرراوی خوا! فەرمووی: ((بَلْ أَنْتُم يَوْمَئِذ كَثير، وَلَكِنَّكُم غُثاءٌ كَغُثاءِ السَيل، وَلَيَنْزِعَنَّ اللهُ المَهَابَةَ مِنْ صُدُرِ أَعْدائِكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ في قُلُوبِكُم الوَهْن: ئەوکاتە ژمارەتان زۆرە، بەلام کەفن وەك کەفی لافاو، خوا ترسی ئێوە لە دلی دوژمنەکانتاندا دادەڕنێ و وەهن دەهاوێتە دلی ئێوەوە))، وتیان ئەی نێرراوی خوا! وەهن چیە؟ فەرمووی: ((حُبُّ الدُنْيا وَكَراهِيَةُ المَوْت: خۆشەویستی دونیا و ڕق بونەوە لە مردن)).[١]

ئێمە هەموومان لەو بڕوایەداین، کە بینای ئیسلام بە ئیزنی خوا دەگەڕێتەوە، کە گەڕایشەوە زۆر بلند دەبێت، وەك چۆن لەوەپێش بووە، هەموو ئەوانەی دلخۆشکەرن دەستنیشانی کایەیەکی تازەی ئیسلامی دەکەن، بەشێوەیەك دەسەلاتداری سەرزەوی بێت، سەرەڕای هەموو ئەو هێرشانەی نەفامی بۆ سەر ئیسلام دەیکەن.

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود.

بەڵام ئەمە لە نامۆیی دووەمدا کارێکی دژوارە بۆ ئیسلام: ((بَدَأَ الإسلامُ غَرِيبـاً وَسَيَعُودُ غَرِيباً كَما بَـدَأَ: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکردووە، دووبارە نامۆ دەبێتەوە وەك چۆن دەستی پێکردوە)).[1]

ئەم ئەرکە پێویستی بە هەوڵێکی زۆر و چاوێکی تیژ هەیە.

لە نامۆییەکەی یەکەمدا ئیسلام بەلای کەمەوە لە بنەما گشتیەکانیدا لای خەڵك ئاشکرا بوو، کە ئەویش بڕواهێنان بوو بە خوای تاك و تەنها و بڕواهێنان بە وەحی و پێغەمبەرایەتی و بڕواهێنان بوو بە زیندووبوونەوە، ئەوەی هاتبوە ناو ئایینە تازەکەوە، یان ئەوەی بەتوندترین شێوە دژایەتی دەکرد، هەموو تواناکەی خستبوە کار بۆ لەناوبردنی. جا بەڕاستی هۆی نامۆیی یەکەمی؛ کەمی بڕواداران و لاوازی و بێدەسەلاتیان بوو بەسەر خەڵکدا، هەروەها زۆری ئەوانەی ئەو ئایینەیان بەدڵ نەبوو و لەسەر زەوی ستەمیان دەکرد.

وەرەقەی کوڕی نەوفل، کاتێ خەدیجە هەواڵی هاتنی وەحی بۆ گێڕایەوە بە پێغەمبەرﷺی وت: خۆزگە منیش لاوێکی بەتوانا بومایە لەو ئایینەدا کاتێ هۆزەکەت لەسەر ئەو ئایینە لە مەککە دەرت دەکەن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ؟ ئەوان دەرم دەکەن؟ ئەویش وتی: کەسێك نیە وەك ئەوەی تۆی هێنابێت و دژایەتی نەکرابێت.[2]

پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: تۆ خەڵك بۆ چ شتێك بانگ دەکەیت؟ فەرمووی: ((أَدْعُوهُم لِلا إِلَهَ إِلاَّ الله: بانگیان دەکەم بۆ ئەوەی ئەو خوایە بناسن کە (الله)یە و جگە لەو شایستەی پەرستن نیە)).

وتی: ئەمە کارێکە عەرەب بۆ تۆی واز لێ ناهێنن!

بەڵام نامۆیی دووەم جیاوازە، ئەگەریش نامۆیی هەر نامۆییە لە هەموو بارێکدا.

ئیسلامی ئەمڕۆ، سەرەڕای نامۆییەکەی لەلای خەڵکانی تر، لای خەڵکەکەی خۆیشی نامۆیە، کاتێ ئەو ئایینە لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی دەخەیتە بەردەستیان، لێی دەسڵەمێنەوە و دەڵێن: تۆ ئەوەت لەکوێوە هێناوە؟ ئەوە ئەو

---

١ أخرجه مسلم.

٢ سەیری کتێبەکانی سیرە بکە.

ئیسلامە نیە، کە ئێمە دەیناسین!

یا کاتێك کەسێك بە دەوری گۆڕێکدا خول دەخوات و دەستی پێدا دێنێت و داوای بەرەکەت لە مردووەکەی ناوی دەکات، کە چەند ساڵە یان چەند سەدەیە مردووە، پێی دەڵێیت: ئەم کارە هاوبەش بۆ خودا دانانە و دروست نیە! پێت دەڵێ: ئەوەت لەکوێوە هێناوە؟ بەڕاستی تۆ دەتەوێ ئیسلام لە لایەنە گیانی(روحي)یەکەی داماڵیت!

کاتێ کەسێك یاسایەکی بێجگە لە یاسای خوا دادەنێت، یا کەسێك بە یاسای بێجگە لە خوا ڕازی بێت، کە پێی دەڵێیت: ئەوە هاوبەش بۆ خوا دانانە! پێت دەڵێت: ئەوەت لە کوێوە هێناوە؟ ئەوە توندڕەوی و دواکەوتوییە! دونیا گۆڕاوە و بەرەوپێش چووە! یان بەلای کەمەوە پێت دەڵێت: ئەوە کارێکە لە هاوبەش دانان خوارترە! هاوبەش دانانێکە لە ئیسلام دەرت ناکات!

کاتێ بە مامۆستای کۆمەڵناسی و مامۆستای دەروونزانی و مامۆستای پەروەردە و مامۆستای مێژوو، دەڵێیت: لەڕاستیدا ئەوەی ئێوە خوێندووتانە لە زانستە ڕۆژئاواییەکان و ئەوەی فێری قوتابییەکانتانی دەکەن، پێچەوانەی چەمکە ئیسلامیەکانە و هەندێ جار بەڕاشکاوی لەگەڵ بیروباوەڕ تێك دەگیرێ، پێت دەڵێن: —مەگەر ئەوانەی خوا ڕەحمی پێکردون—: ئیسلام چی داوە لەو کاروبارانە؟ دەتانەوێ ئیسلام بناخنە ناو هەموو شتێکەوە؟ ئەوە زانستە، ئیسلامیش ئایینە! ئایینیش خۆی لە زانست هەڵنادات!

لەگەڵ سەدەها کاروباری تر.. کاتێ حەقیقەتی ئیسلام پیشان دەدرێت، خەڵکەکە دەسڵەمێنەوە، بەلایەنی کەمەوە سەریان سوڕدەمێنێت و هەوڵێکی زۆری دەوێت بۆ ئەوەی وایان لێ بکرێت بڕوا بهێنن، کە لەلایەن خواوە هاتووە، نەك ئەوەی ئەوان بە ئیسلامیان داناوە.

ئەمانە هەمووی لە بواری (زانین)دا ڕوو دەدەن.. بەلام لەبواری کارپێکردندا کۆششی پێویست زیاترە!

بەڕاستی زانین بەتەنها بەس نیە، ئەگەریش سەرەتایەکە و دەبێت لەپێش هەموو شتێکدا دەستی پێبکرێت، یەکەم وشەی وەحی بە ﴿إقـرأ: بخوێنە.﴾

دەستی پێکرد، پاش ماوەیەك ئایەتی ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ: بزانە كە بەڕاستی جگە لە (الله) شایستەی پەرستن نیە.﴾محمد:١٩. بۆ سەر پێغەمبەر هاتە خوارەوە.

زانستیش -وەك سەلەفی صالح‌ﷺ لێی تێگەیشتوون- زانینێكی پەتی(مجرد) نیە، بەڵكو بریتیە لەو زانینەی دەبێتە كردەوە، پاشان ئەو زانینە لەشێوەی ناسینی حەقیقەتەوە دەگۆڕێت بۆ كارپێكردنی.

كاتێ ناساندنی وردی چەمكی (لا اله الا الله) لە نامۆییەكەی یەكەمی ئیسلامدا هەوڵێكی زۆری پێغەمبەریﷺ ویست، لەڕاستیدا هەوڵی ڕاستەقینەی پێغەمبەرﷺ -بەتایبەتی لە مەككە- پەروەردەكردنی ئەو بڕوادارانە بوو، كە حەقیان وەرگرت و بڕوایان پێ هێنا، لەسەر پێویستیەكانی (لا اله الا الله)، قۆناغ دوای قۆناغ هەتا كەوتنە سەر ڕاستە ڕێیەكە، یەكەمجار بنكە و بناغە پتەوە چەسپاوەكەی پەروەردە كرد، پاشان تێكڕای خەڵكی.

ئەمڕۆیش -لەنامۆیی دووەمی ئیسلامدا- بانگەواز لە هەردوو لایەنەكەوە - ناساندن و پەروەردەكردن- پێویستی بە هەوڵدان هەیە.

جا ناساندنی ئیسلام بە كۆمەڵێك كە هەندێكی بناسن و هەندێكی نەناسن و لە هەمان كاتدا وابزانن هەمووی دەناسن، گرفتێكە پێویستی بە هەوڵی زۆر هەیە، بەلام پەروەردە -بەلای كەمەوە بۆ بنكە(قاعدة)كە- گرفتێكە پێویستی بە هەوڵی زۆرتر هەیە؛ لەبەر زۆری بوارەكانی پەروەردەی پێویست لەلایەكەوە، لەلایەكی ترەوە چونكە دەرونەكان بە ئاسانی واز لەوانە ناهێنێت، كە لەسەری ڕاهاتون، خێرا ناچێت بەدەم ئەو ئەركانەوە، كە داوای لێكراوە.. سەرەڕای ئەوەی داواكراوەكان تەنها بۆ بنیاتنانی دەروونی بڕوادار نیە، بەڵكو ئامادەكردنی كەسایەتیی بەهێزە، كە شیاو بێت بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەركە گەورەیەی ڕوبەڕوی دەبێتەوە.

گرنگە -تا ئەوپەڕی- بزانین چۆن بانگەوازی خەڵك دەكەین.. ئەو قەیرانەی ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی پێیدا تێدەپەڕێت؛ قەیرانێكی توندوتیژە، لەوانەیە توندترین قەیران بێت لە مێژوودا، كە پێیدا تێپەڕیوە.. هەروەها كۆبونەوەی

دوژمنان بۆ جەنگی ئیسلام، لەوانەیە پێشتر بەو قەبارە و پەرداگرتنە نەبوبێت، هەروا پێویستی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی بە ئیسلام کەمتر نیە لە پێویستیەکەی ئەو کاتەی، کە بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی.

ئەگەر بە هەنگاوی بەرچاو ڕوون و ڕاگیراو، لەسەر ڕێگای بانگەوازەکەمان نەڕۆیشتین، بەڕاستی ناگەینە ئەو ئامانجەی دەمانەوێت و هەوڵێکی زۆرمان بەبێ هودە دەڕوات.

بەڕاستی ماوەیەکی زۆرە بابەتی بانگەواز بیرمی جەنجاڵ کردووە، پرسیارێکی گرنگ بە مێشکمدا دێت: چۆن بانگەوازی خەڵك بکەین؟ شێوازی ڕاستی بانگەواز چیە؟ بەتایبەتی کاتێ کە -جارجارە- کەمتەرخەمی لە هەندێ لایەن، یان پەلەکردن لە هەندێ لایەن، یان لادان لە هەندێ لایەنی کاروانی بانگەوازدا دەبینم.. لەدڵی خۆمدا دەڵێم: پێویستە پیاچونەوەیەکی هەمەلایەنەی کاروانی بانگەوازی زیاد لە نیو سەدە بکرێت؛ هەتا ئەو کەموکوڕیانەی لە کاروانەکاندا ڕویداوە تەواو بکەین و، ئەو هەڵانە دووبارە نەکەینەوە، کە تێیکەوتبوین، هەتا سود لە ڕابردوو وەربگرین بۆ بەهێزکردنی ئێستا و، ڕاستکردنەوەی کارەکان لەپێناو داهاتوودا، ئەمە ئەرکێکی گرنگە و پێویستە بانگخوازان لە هەموو قۆناغێکی ڕێکردنندا سەرقاڵیان بکات.

لەم چەند لاپەڕانەدا، هەوڵ دەدەم ئەو بیرۆکانەی بە ئاوەزمدا[1] دێت و دەچێت لەو بارەیەوە بخەمە ڕوو، ئەمەش لەسەرەتا تا کۆتایی تێکۆشانێکە هەڵە و ڕاستی هەڵدەگرێت، داوا لە خوا دەکەم پشتیوانم بێت بۆ گەیشتنە ڕاستی؛ ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ: من لەمەدا بەپێی توانا چاکسازیم دەوێت، سەرکەوتنیشم تێیدا بەدەست خوایە، پشتم پێی بەستوە و دەگەڕێمەوە بۆ لای.﴾هود/٨٨.

محمد قطب

١ ئاوەز: عەقڵ.

# پچەند سەرنجێک لە دروستبوونی ئەوەی یەکەمدا

پێویستمان بە هەڵوەستەی درێژ هەیە بۆ سەرنجدان لە دروستبوونی نەوەی یەکەم، چونکە توێشووی تەواوی ئەوانەی تێدایە، کە دەیانەوێت بانگەواز بکەن، یا ئەم ئایینە بجوڵێنێت لەو جیهانەی تێیدایە، بەڕاستی ئەو نەوەیە بە چاودێری خوا دروست بووە وەك خوای پاك و بێگەرد بە موسای فەرمووە: ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ: بۆ ئەوەی بەچاودێری من پەروەردە بیت.﴾طه/٣٩.

ئەو نەوەیە لەسەر دەستی گەورەترین پەروەردەکار لەمێژووی مرۆڤایەتیدا دروست بووە، کە محمدی نێرراوی خوایەﷺ، جا ئەو نەوەیە لە هەموو مرۆڤایەتیدا نەوەیەکی تاك بووە، خوا بە وەحی ئاڕاستەی دەکرد و پێغەمبەری بە پەروەردە و ڕێنمایی پێدەگەیاند، بەو شێوەیە هەموو هۆکانی دروست بوونی ڕاستی و دروستی لەسەر بەرزترین شێوە بۆ تەواو بووبوو، وەك وانەی نمونەیی لێهاتبوو، ئەو وانە نمونەییەی مامۆستا بە قوتابییەکانی دەڵێتەوە بۆ ئەوەی فێر بن کاتێ کاروباری فێربونیان دەخرێتە ئەستۆ، کە بەباشی بەڕێوەی بەرن.

پاشان خوای پاك و بەرز ویستی کاروباری ئەم ئایینە تەواو بکات لەسەر ڕێوشوێنی ئەو شتانەی، کە هەیە و لەتوانادایە -نەك دەرچوو لەتوانا- بۆ حیکمەتێك، کە خوا خۆی ویستویەتی بۆ ئەوەی بەرەیەك لە بەرەکان توشی تەمبەڵی بن و بڵێن نەوەی یەکەم بە شتی نائاسایی(خوارق) سەرکەوتون، شتی نائاساییش دوای پێغەمبەرﷺ بنەبڕ بوو.!

ئەوەی لەم ئایینەدا هەیە، جگە لە پێکهاتەی مرۆڤی، ئەو وەحییە، کە لەلایەن خواوە نێرراوەتە خوارەوە، ئەو وەحیەش هەر ماوە و پارێزراوە بە هۆی پاراستنی خواوە: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ: ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوەو خۆیشمان پارێزگاری

دەکەین.﴾الحجر:٩.

ئەو وەحیەش چۆن بۆ نەوەی یەکەمە؛ ئاواش بۆ نەوەی دواییە، ئەوە بەرنامەی خوایە بۆ ئەم نەتەوەیە و بۆ هەموو مرۆڤە بە گشتی، ڕاستیی ئەم ئایینە و پرۆگرامی خوایی هەلگرتووە، ئەو پرۆگرامەی خوا لە مرۆڤی دەوێت هەتا ڕۆژی دوایی، بۆ ئەوەی ژیانی خۆیانیان لەسەر ڕابگرن و خۆیانی پێ بنیات بنێن، جا ئەوەش قورئان بێت هاتبێتە خوارەوە، یان ڕوونکەرەوەی ئەو کتێبە بێت، کە پێغەمبەری خواﷺ بە سوننەتی گوتە و کردەوەی پێی هەلساوە: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ: ئێمە ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە بۆ تۆ، تا بۆ خەلکی ڕوون بکەیتەوە، کە چییان بۆ هاتۆتە خوارەوە، بەئومێدی ئەوەی بیربکەنەوە.﴾النحل/٤٤، ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ: بەهەواو هەوەسی خۆی قسە ناکات، بەلکو سروشێکە بۆی دێتە خوارەوە.﴾النجم:٣-٤.

بەلام ئەو بەشداریکردنەی فریشتەکان لەگەل بڕوادارەکاندا لە جەنگی بەدر کردیان، خۆی لە خۆیدا شتێکی نائاسایی نەبوو؛ ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ: ئەو کاتەی خوا فریشتەکانی تێگەیاندن کە: خۆشم دەگەل ئێوەدام، غیرەت وەبەر بڕوادارەکان بێنن، منیش ترس وەبەر خوانەناسان دەنێم، سا ئێوە لە ملیان دەن و ئەنگوستەکانیشیان ببەڕێنن.﴾الأنفال:١٢.

هاتنەخوارەوەی فریشتە بۆ چەسپاندنی مرۆڤەکان، تەنها بۆ جەنگی بەدر نابێت، بەلکو بۆ هەر بۆنەیەك دەبێت، کە بە فەرمانی خوا ڕوویدات:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ نَحْنُ

أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ: بەڕاستی ئەوانەی وتیان: پەروەردگارمان خوایە، پاشان بەردەوام بوون لەسەری، فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان دەڵێن: ترستان نەبێت لە ئاگر و غەمی دونیا مەخۆن، دڵخۆش بن بەو بەهەشتەی لەوەپێش پەیمانتان پێدرابوو، ئێمە لە ژیانی دونیا و لە ئاخیرەتیشدا دۆستی ئێوەین.﴾فصلت: ٣٠-٣١.

بەڵام شتە نائاساییەکە بینینی فریشتەکان بوو لەلایەن بڕوادارەکانەوە، کە دەیانبینین لەگەڵیان دژی بێبڕواکان دەجەنگن: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ: خوا ئەوەی تەنها بۆ دڵخۆشکردنی ئێوە کردووە، بۆ ئەوەی دڵنیابن خواتان لەگەڵدایە، چونکە سەرکەوتن تەنها لەخوای بەدەسەلات و لەکارزانە.﴾آل عمران/١٢٦.

گەر خوای پاك و بەرز ئەوەی تایبەت کرد بە بڕوادارانی ئەهلی بەدرەوە بەبێ بڕوادارانی تر، لەبەر ئەوە بووە جەنگی بەدر ڕوداوێکی دانراوی خوا بوو، هەموو ڕۆژێك دوویارە نابێتەوە: ﴿يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ: ڕۆژی جیاکەرەوەی حەق و باتڵ، ڕۆژی گەیشتنی بڕواداران بە بێبڕواکان لە جەنگی بەدردا.﴾الأنفال: ٤١.

ئەو جەنگە مێژووی نووسیەوە، مێژووش هەموو ڕۆژێك نانوسرێتەوە.. بەڵکو دێر لەدوای دێر دەنوسرێتەوە!

جگە لەم شتە نائاساییەی خوا تایبەتی کرد بە ئەهلی بەدرەوە، جگە لەوانەی تایبەت بوون بە خودی پێغەمبەرەوەﷺ، هەموو کردەوە و فەرمانەکانی تری ئیسلام لەسەر ڕێ و شوێنی ئاسایی ڕۆیشتووە(السنة الجارية)، هەر لە لاوازبوونی سەرەتا و، تاقیکردنەوەو ئارامگرتن و پاڵفتەکردن، پاشان زاڵ بوون بەسەر ترسدا، پاشان زاڵ بوون بەسەر جێگیربوون و هێزدا، پاشان بڵاوبوونەوە بە زەویدا. بۆیە ئەو وانانەی لە دروستبوونی نەوەی یەکەم وەریدەگرین؛ وانەی بەردەوامن و تەنها بە نەوەی یەکەمەوە تایبەت نین، بەڵکو توانای جێبەجێکردنیان هەیە لە هەموو

ئەو جارانەدا، کە سەردەم و شێوەیان وەك ئەوکاتە بێت، لەبەر ئەوەی سوننەتی جارین، نەك ڕوداوی سەربەخۆ بن و تێپەڕ بووبن و دووبارە نەبنەوە.

خوای پاك و بەرز کە لە قورئانەکەی ئاڕاستەی کردوین، بۆ بیرکردنەوە لە سوننەتەکانی پەروەردگار و توێژینەوە لە مێژوو -ئەو مێژووەی لە ڕاستیدا ڕاڕەوی سوننەتەکانن لە جیهانی واقیعدا- ئێمەش دەبێ توێژینەوەی پێکهاتووەکەی یەکەم بکەین، بۆ ئەوەی دەرس و عیبرەتی لێ وەربگرین و ببێتە ڕێنماییکەرمان بۆ هەر جولانێك کە دەیکەین، هەروا ببێتە سەنگی مەحەکی بەردەوام بون لە سەر ڕێگاکەمان، یان لادانمان لێی.

چەند شتێك دەربارەی دروست بوونی نەوەی یەکەم هەڵوەستەی پێکردم، کە وای لێکردم زۆر حەز بە بیرکردنەوە و ڕامانی بکەم، ئەوەی من جاروبار دەیبینم لەم کاروانەی ئێستاماندا دەکرێت، پێچەوانەی پێویستیەکانی دروستبوونی نەوەی یەکەمە، دەبینم ئەو سەرپێچیانە دەبنە ڕێگری کاروانەکە، بۆیە حەز دەکەم هەندێ لەو کارانە لەم چەند لاپەڕەیەدا نیشان بدەم، لەخوا دەخوازم هەمیشە بەدورمان بگرێت لە خلیسکان و ڕێنماییمان بکات بۆ سەر ڕێی ڕاست..

* * *

بەهێزترین شتێك، کە هەڵوەستەی پێکردم لە کاروانی نەوەی یەکەمدا، ئەو فەرمانە خواییە بوو کە داوای لێکردن جەنگ نەکەن لە قۆناخی پەروەردەکردنی مەککەدا، بە ئارامەوە بەرگەی سزا و ئازارەکان بگرن. بەڕاستی خوا ئاماژەی داوە بەوە لە ئایەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ: ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە، پێیان گوترا هەتا لە مەککەن شەڕ مەکەن؛ نوێژ بکەن و زەکات بدەن..﴾النساء:٧٧.

هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ کاتێ ئازاردانیان زیادی کرد لەلایەن بێبڕواکانەوە، بەپێغەمبەریان وت: شەڕیان لەگەڵدا نەکەین؟ ئەویشﷺ فەرمووی: ((ما أُمِرْنا بِقِتالِهِمْ: فەرمانمان پێنەکراوە لەگەڵیاندا بجەنگین)).[1]

---

١ سەیری کتێبەکانی سیرە بکە.

له دەقەکاندا —نە لە کیتاب و نە لە سوننەتدا— روونکردنەوەی حیکمەتی ئەو فەرمانە رەببانیە نەهاتووە، جا زانینی حیکمەتەکەی بۆ ئیجتهاد.واز لێهێنراوە، لەوانەیە ئاسانترین رێگا بۆ زانینی ئەو حیکمەتەی ئیجتهاد ئەوە بێ، ئەگەر وای دابنێین بڕوادارەکان ئەوکاتە دژی قورەیش جەنگابن، لەو جەنگانەدا چی بەدی هاتووە؟ پاشان بیر لەو سوودانە دەکەینەوە، کە لە نەجەنگانیان بەدی هاتووە.

ساناترین شتێك بتوانرێت لە ئەنجامەکانی ئەو جەنگە نا بەرابەرییە وێنا بکرێت ئەوەیە، کە قورەیش بڕوادارەکان لەناو دەبات، چونکە ئەوان کەمێکی لاوازی بێپشتیوان بوون و کاری ئەو بانگەوازە تازەیە لەیەك جەنگدا، یا لە چەند جەنگێکی دوابەدوای یەکدا کۆتایی پێ دەهات، بێئەوەی ئامانجەکە بێتە دی، بێ ئەوەی خەڵك ڕاستی ئەو بانگەوازەیان بزانیایە، بێ ئەوەی بڵاوبوونەوەی بۆ بنووسرایە.

ئەگەر وای دابنێین جەنگەکە —لەگەڵ نابەرابەری بونیدا— نەبێتە هۆی لەناوبردنی هەموو بڕوادارەکان، شتێکی گرنگتر هەیە، کە سەرنجمان زۆر ڕادەکێشێ، لەبەر ئەوەی پەیوەستە لەگەڵ ئەوەی لەم سەردەمەی ئێستادا ڕوودەدات. ئەویش ئەوەیە، کە ئایا لەو قۆناغەدا شەرعیەت لە مەککەدا بۆ کێیە؟ بەڕاستی خەڵك بەگشتی هەستیان وابوو، کە شەرعییەت بۆ قورەیشە!

ئەی باری بڕواداران ئەوکاتە چۆن بووە؟ باریان وابووە، کە بڕوادارەکان لە شەرعیەت دەرچوون..!

لەبەر ئەوە کێ هەقی خاوەن شەرعیەتە، تا لەڕێدەرچووەکان بێنێتەوە سەرڕێ.!

ڕاستە قورەیش ئەوەندە توندوتیژ بووە لە (سەرکپ کردن و تەمێ کردن) کە، گەیشتونە ڕادەی توندوتیژی و دڵڕەقی، بەڕاستی هەندێ کەس بەو توندوتیژییەیان دڵگران دەبوون، هەتا وای لێدەهات هەبو هەوڵی دەدا هەندێ لە ئازاردراوە بێکەسەکان بخاتە ژێر پاراستنی خۆی، واتە پەنای بدا، بەڵام هەر خەڵکەکە قورەیشیان بە خاوەنی شەرعیەت دەزانی و بڕوادارەکان لەو شەرعیەتە دەرچوون، مافی قورەیشی خاوەن شەرعیەتە ئەوانە تەمێ بکات کە لەیاسا دەرچوون!

جا ئایا لە بەرژەوەندی بانگەوازەکەدا دەبوو، کە بڕواداران ئەو کاتە بکەونە جەنگ لەگەڵ قورەیش، لەکاتێکدا ئەو بۆچوونە لەناوخەڵکدا بڵاوبوو؟!

نا، لە بەرژەوەندی بانگەوازەکەدا نەبوو!

با ئێستا سەیر بکەین کاتێ بڕوادارەکان ملکەچی فەرمانە رەبانیەکە بوون و جەنگیان نەکرد چییان بۆ ئەنجام درا.

لە حەقیقەتدا کاری زۆریان بۆ ئەنجام درا..

جا لەو ژینگە عەرەبیەی، کە ناسراوە بەوەی ستەم قبوڵ ناکەن و جەنگی زۆر و توندوتیژی تێدا رووی داوە بەهۆیەکەوە ئێمە ئەمڕۆ بەهیچی نازانین و شایستەی ئەوە نیە دڵۆپە خوێنێکی لە پێناودا بڕژێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جەنگانە چەندەها ساڵی دەخایان و، کەسانێکی زۆری تێدا لەناو دەچوو، وەك جەنگی (داحس و غبراء)[1].. لەو ژینگەی، کە (عەنتەرە) دەربارەی دەڵێ:

ولقد خشيت بأن أموت ولم تدر  للحرب دائرة على ابني ضمضم

الشاتمي  عرضي ولم أشتمهما    والناذرين إذا لم ألقهما دمي!

یەکێکی تر گوتویەتی:

ألا لا يجهلَنْ أحد علينا  فنجهل فوق جهل الجاهلينا!

ئا لەو ژینگەیەدا پیاوی نەجیب و خانەدان ئازار دەدرا، هەیانبوو لە ئەشرافەکانی قورەیش بوون.

بێگومان ئەوە شتێکی سەرنج راکێش بوو، چونکە بەتەواوەتی پێچەوانەی داب و نەریتی ژینگەکە بوو..

بە دەربڕینێکی تر، شتێك لە کردەوەی ژینگەکە نەبوو.. دەبێت لە کردەوەی شتێکی تری پێچەوانەی ژینگەکە بێت!

پاشان ئازاردان بەردەوام توندوتیژتر دەبوو، ئەوانیش ئارامیان دەگرت! لێرەدا

---

١ (داحس و غبراء) جەنگێك بوو لە کۆتاییەکانی سەردەمی نەفامیدا لەنێوان هۆزی (عەبەس) و (زیبان)دا هەڵگیرسا، بەهۆی پێشبڕکێی دوو ئەسپەوە کە یەکێکیان ناوی (داحس) بوو، ئەویتریان ناوی (غبراء) بوو، هەردوو هۆزەکە لەسەر ئەنجامی پێشبڕکێکە تێکچوون و شەڕ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، هەر هۆزەی هاوپەیمانەکانی چونە پاڵیان و جەنگەکە درێژەی کێشا و خەڵکێکی زۆر کوژرا، هەتا چونە نێوانیانەوە و صوڵحیان کرد و شەڕەکە وەستا.

واتایەکی نوێ پەیدابو، کە لە کردەوەکانی ژینگەکە نیە، ئەویش ئەوەیە لەرێگـەی چیدا ئەوانە بەرگەی ئـەو ئازارانـەیان دەگـرت، بـەردەوامیش دەبـون لەسـەر ئـەو کارەی بوویبووە هۆی ئەو ئازاردانەیان.؟

ئایا لـەرێگای شـەرەفی هۆزبـوو؟ ئایا بـۆ دەسـتکەوتێك بـوو؟ ئایا لـەرێگای ئارەزوویێك لە ئارەزووەکانی سەرزەویدا بوو؟

بۆ هیـچ لەوانـە نـەبوو.. بـەڵکو لـەپێناو بیروبـاوەڕێکدا بـوو، کـە بڕوایـان پێـی هەبوو. ئەم ژینگەیە وا تێگەیشتبوو، کە عەقیدە دەبێ داب و نـەریت بێـت، خـەڵك دەستی پێوە بگرێت و لە پێناویدا بجەنگێت، بەڵام بەرگـەگرتنی ئـازار لـە رێگـایدا لەسەر ئەو ژینگەیە -کە کەڵکی نەدەگرتن- شتێکی تازە بوو، کە ژینگـەی داب و نەریت بوو.

پاشان هەنگاوێکی بەرەوپێشتر دەنێین، کارێکی تازەترمان بۆ ڕون دەبێتەوە. کە بەردەوام ئازاردانەکە توندوتیژتر دەبوو، هـەتا دەبـووە دابڕانـی ئـابووری و کۆمەڵایەتی، کە دەگەیشتە ڕادەی برسیکردن، بەڵکو هەندێ کەس دەمردن، بەڵام ئەوان وازیان لە عەقیدەکەیان نەدەهێنا!

نابێت -نە لە عورفی ژینگەکـە و نـە لـە عورفـی مرۆڤـدا بەگشـتی- کـە خـەڵك لـەپێناوی شـتێکی پوچـەڵدا بەرگـەی ئـەو شـێوە ئازارانـە بگـرن.. بـەڵکو دەبـێ ڕاستیەك هەبێت خاوەنەکەی بڕوای پێی هەبێت و لەپێناویدا بەرگـەی ئـەو ئازارانـە بگرێت و بمرێت. بەڵکو ئەو ڕاستیەی بڕوای پێی هەیە لەلای بەنرختره لە ئاسایش و حەوانەوە و پلەوپایە و کەرامەتی، هەتا لە خۆی هەتا لە ژیانیشی.

هـەموو ئـەو واتایانـە لـەنێوان ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾دا هاتنـە دی، هـەر ئـەوەبوو ئـەنصارەکانی لـە مەدینـەوە هێنـا، کـە هێشـتا بـارودۆخ لـە مەککـە بەتـەواوی نەگۆڕابوو.!

دەتوانین بەکورتی بڵێین: بەڕاستی ئەهلی مەککە ئاگرەکـەیان کـردەوە، بـەڵام خەڵکی مەدینە لە دوورەوە پێی ڕۆشن بوونەوە، ڕاستیان دۆزیەوە، ئەو ڕاستیەی دۆزینەوەکەی ویستی خوای لەسەر بوو..

* * *

لەمیانەی ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾دا، بە تەنها هەر ئەوە بۆ ئەنصارەکان رون نەبوەوە.. بەڵکو کارێکی تر ڕون بوەوە، کە گرنگیەکی زۆری هەبوو لەسەر هێڵی بەردەوامی بانگەوازەکە، ئەویش کێشەی ((شەرعیەتەکە)) بوو..

خوای پاك و بەرز لە سورەتی (انعام)دا کە سورەتێکی مەککەییە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ: ئێمە ئاوا نیشانەکانی خۆمانیان تەواو بۆ شی دەکەینەوە و دەمانەوێ ڕێبازی تاوانباران ڕوون بێتەوە.﴾الأنعام:٥٥.

هاتنی ئەو واتایە لەو ئایەتە مەککەییەدا بەڵگەیەکی ڕونی هەیە، یا پێویستە ڕون بێت، جا ڕونکردنەوەی ڕێگای تاوانبارەکان ئامانجێکی ویستراوە، (لام التعليل) لە ئایەتەکەدا ڕونی دەکاتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿وَلِتَسۡتَبِينَ﴾، هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لەماوەی مەککەدا، واتاکەی ئەوەیە ڕونکردنەوەی ڕێگای تاوانباران ئامانجێکە لە ئامانجەکانی بانگەواز، بەڵکو لە پێویستیەکانی بانگەواز بووە لە سەردەمی یەکەمدا، کە کۆمەڵە موسڵمانەکەی تێدا پێکهاتووە.

ڕوونکردنەوەی ڕێگای تاوانباران، چی بۆ بانگەواز بەدی دێنێ؟

بەڕاستی ڕونبوونەوەی ڕێگای تاوانباران دوو شتی تێدایە: یەکەمیان ڕوونی دەکاتەوە تاوانباران کێن؟ دووەم دەرخستنی ئەو ڕێگایەی گرتویانە و لەپێناویدا بوونە تاوانبار.

تاوانباران کێن؟ ڕێگاکەیان چیە؟ پەیوەندی شیکردنەوەی ئایەتەکان بە ڕوونکردنەوەی ڕێگاکەیانەوە چیە؟

بەڕاستی ئایەتەکان کێشەی (الألوهية)ی شی کردەوە، ئەویش کێشەی یەکەم و گەورەیە لە هەموو قورئاندا و بەتایبەتی لە سورەتە مەککیەکاندا.

ئایەتەکانی ئەوەی شی کردەوە کە خوای گەورە، خوایەکی تاك و تەنها و بێهاوبەشە، نابێت هاوبەشی هەبێت لە دروست کردن و بەدیهێناندا و لەهیچ کارێك لە کارەکاندا هاوبەشی نیە، بەردەوام ئایەتەکان دەهاتنە خوارەوەو سیفاتەکانی ئەو خوایەیان ڕون دەکردەوە و بێ هاوبەشی بۆ بڕیار دەدا، هەتا وای لێهات

واتاکە بە تەواوەتی ڕوون بووەوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێنابوو و ئەوانەش بڕوایان نەهێنابوو، بەڕاستی بێبڕواکان وایان لێهاتبوو زۆر بەڕوونی دەیانزانی پێغەمبەر چی لێیان دەوێ بیزانن و بڕوای پێ بهێنن، هەتا دەیانوت، وەك خوا لێیان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿أَجَعَلَ ٱلۡأَلِهَةَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا إِنَّ هَـٰذَا لَشَیۡءٌ عُجَابٌ: ئایا خواکانی کردووە بە یەك خوا، بەڕاستی ئەوە شتێکی سەیرە.﴾ص:٥

کاتێ روون بووەوە، کە خوای گەورە خوایەکی تاك و بێهاوبەشە، داوا لەخەڵك کرا بە تەنها ئەو بپەرستن بێ ئەوەی هاوبەشی لەو پەرستنەدا بۆ بڕیار بدەن، چونکە خۆی بەتەنها شایستەی پەرستنە، پشت بکەنە ئەوانەی بەدرۆ دەیانوت ئەمانە خوان، شوێن ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتۆتە خوارەوە، ئیتر بێجگە لەو شوێنی کەسی تر نەکەون: ﴿ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ: شوێن ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە، بێجگە لەو شوێن ئەوانە مەکەون کە کردوتانە دۆستی خۆتان، ئێوە زۆر کەم عیبرەت وەردەگرن.﴾الأعراف:٣.

جا لەسەر ئەوە خەڵکەکە بوون بە دوو کۆمەڵەوە: کۆمەڵی بڕوادارەکان، ئەوانیش ئەوانەبوون، کە بڕوایان هەبوو خوا تاك و تەنهایە، کە بەبێ هاوبەش دەیانپەرست و شوێن ئەوە کەوتبوون، کە لە پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتبووە خوارەوە، کۆمەڵی تاوانبارەکان، ئەوانیش ئەوانەبوون، کە نەیاندەویست بڕوا بەو خوایە بهێنن و بە تەنها بیپەرستن و شوێن ئەوە بکەون، کە ئەو بۆی ناردونە خوار.

کەواتە، قورەیش دەکەوێتە کوێی ئەو دابەشبوونەوە؟

بەڕاستی پێش ڕۆشن و شی بوونەوەی ئایەتەکان قورەیش خۆی خاوەنی شەرعیەت بوو، بڕوادارەکان لەبەرچاوی قورەیش و لەبەرچاوی خەڵکیشدا لەو شەرعیەتە دەرچووبوون، جا دوای شیبونەوەی ئەو ئایەتانە هەڵوێست چی دەبێت؟ دوای ئەوەی قورەیش نەیویست بڕوابهێنێت بە خوای تاك و تەنها و بەبێ

هاوبەش بیپەرستێت و شوێنی ئەوە بکەوێت، کە خوا ناردویەتە خوارەوە؟ یان بارەکە بەلایەنی کەمەوە لای هەندێ خەڵك دەگۆڕێت و قورەیش و هاوێنەکانیان دەبنە تاوانبار و، بڕوادارانیش دەبنە خاوەنی شەرعییەت؟

ئەمە وەرچەرخانێکی زۆر گەورەیە لەسەر مێڵی ڕاڕەوی بانگەوازدا، کەوا بۆ خەڵك ڕوونی بکەنەوە تاوانبار کێن و ڕێگایان چیە و بەرامبەر ئەوەش ڕونی بکەنەوە، کێن ئەوانەی لەسەر هەقن و ڕێگای هەق چیە.

بەڕاستی ئاڵۆزیەکە بۆ قورەیش بوو، چونکە ئەوان دەرگاوانی کەعبە بوون، ئەو کەعبەیەی عەرەب بەگشتی بە گەورەیان دانابوو، بێجگە لەوەی خۆیان خاوەنی سامان و دارایی و خاوەنی حەسەب و پلەوپایە بوون، بەپێوانەی سەردەمی نەفامی هەموو بنەماکانی شەرعیەتیان بۆ کۆببووبۆوە، کە تێکەڵی پاشماوەی ئایینێکی گۆڕدراو بوون، کە دەیاندایە پاڵ ئیبراهیم و ئیسماعیل(سەلامی خوایان لێبێ)، لەق کردنی ئەو شەرعیەتە لەژێریاندا کارێکی ئاسان نەبوو، بەتایبەتی دەرچووەکان لە شەرعیەتیان بێدەسەڵات و هەژارەکان بوون، کە نەهێزیان هەبوو نە ماڵ و سامان، نە لەلایەن دەسەڵاتدارێکەوە پاڵپشتێکیان هەبوو!

بەڕاستی هەر عەقیدەی ڕاست بەتەنها دەتوانێ لەسەر ئەو شەرعیەتەیان هەڵبکەنێت و حەقیقەتیان دەربخات، کە ئەوان تاوانبارن و شەرعیەت بۆ ئەوان نیە، لەبەر ئەوەی نەیاندەویست بڕوا بەخوای تاك و تەنها بهێنن و بێهاوبەش بیپەرستن و شوێن ئەوەبکەون، کە ناردویەتیە خوارەوە.

لێرەدا دەپرسین: ئەگەر بڕوادارەکان لە مەککەدا دژی قورەیش بجەنگانایە، ئایا ڕێگای تاوانباران ڕون دەبوەوە؟ ئەگەر بجەنگانایە خەڵك وایان هەست دەکرد قورەیش خاوەنی شەرعیەتە و بڕوادارەکان لەو شەرعیەتە دەرچوون. جا ئایا لە دڵ و دەروونی کەسدا -وەك لە دڵ و دەروونی ئەنصارەکان چەسپا- دەچەسپێت، کە ئەو کێشەیە پێوانەیەکی تری هەیە جگە لە دەرگاوانی کەعبە و سامان و ماڵ و زۆری ژمارە و ڕەسیدی عورف و ڕەسیدی مێژوو؟ ئەو پێوانەیەش (لا اله الا الله)یە، کە بڕوابوونە بە خوایەتی خوای تاك و تەنها و بێهاوبەش و،

ئەوەی لەوەوە پێك دێت لە پێویستی شوێنكەوتنی ئەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە. هەروا بڕوابوون بەوەی هەر ئەو حەقە و شتی‌تر هیچی لەدواوە نیە و گومڕاییە، هەروا ئەمە ئەو كێشە گەورەیەیە، كە هەموو شتێكی پێ دەپێورێ، هەموو شتێكی لەسەر بنیات دەنرێت.

ئەگەر بڕوادارەكان دژی قوڕەیش بجەنگانایە، ئایا دەكرا ئەو هەقەی بڕوادارەكان هەڵیانگرتووە، بگاتە دڵی كۆمەڵێك لە خەڵك وەك گەیشتە ناو دڵی ئەنصارەكانەوە، یان تەپوتۆزی شەڕەكە ڕاستی كێشەكەی دادەپۆشی، پاش كەمێك كێشەكە دەبوە كێشەی لێدەر و لێدراو و ژێركەوتوو و سەركەوتوو، كێشەی (لا اله الا الله)ش دەچووە پەراوێزی وێنەكەوە، ئەوە ئەگەر لە هەستی خەڵكدا بەرەهایی شتێكی بمایەوە.؟!

وا دەزانم وێنەكە ڕونە.

﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾ نهێنی هەموو هەڵوێستەكان بوو!

ئەوەبوو ڕێی دا بە كێشەی لا اله الا الله -كە كێشەی هەموو نێرراوەكان بووە لە ئادەمەوە هەتا محمدﷺ- كە بە پاك و ڕونی دەركەوێت، بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك تێكەڵی كێشەیەكی تر ببێت و، بە پاكی و بێخەوشی بچێتە ناو ئەو دڵانەی خوا ویستی وابوو هیدایەتیان بدات بەبێ خڵت و خەوش، جا لەو دڵانەدا جێی خۆی دەگرت، ئیمان ڕەگی خۆی تێدا داكوتێ، وەك چۆن دەچێتە ناو ئەو دڵانەش، كە خوا نایەوێت هیدایەتیان بدات هەر بە پاكی و بێخەوشی خاوەنەكانیان بێبڕوا دەكەن بێبڕواییەك گومانی تێدا نەبێت، كوفرێك نە بەرگری لە گیان و، نە بەرگری لە ماڵ و، نە بەرگری لە هێمنی و ئاسایشی تێكەڵ نابێت؛ بەڵكو ڕەتكردنەوەی ئاشكرای (لا اله الا الله)یە. ئەوەش ڕێككەوتنێكە بۆ قەدەرێكی هاتوو لە قەدەرەكانی خوا و سوننەتێكە لە سوننەتە جاریەكان: ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ: تا مردن و ژینی هەر كەس، بە بەڵگەی ئاشكراوە بێ، خوا دەبیستێ و ئاگادارە.﴾الأنفال:٤٢.

ئەو رونیەی، کە بەکێشەی ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾ درا ئەوە لەپێویستیەکانی بانگەوازییە، جا بەبێ ڕونبوونەوەی ڕێگای تاوانباران لەسەر بناغەی ((لا اله الا الله)) و لە بەرامبەریش ڕێگای بڕواداران ڕوون ببێتەوە هەر لەسەر ئەو بنەمایەیە، کە قاعیدەکە بە ئەندازەیەکی گونجاو و ماقول ئەوەندە فراوان نابێت، بەڵکو بانگەوازیی لەجێی خۆی بەولاوە ناچێت، ئەگەر بەهەر هۆیەك لە هۆکان توشی شکستی نەبێت.

کاتێ کێشەکە لەسەر ئەو شێوەیە لە میانی ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾ ڕوون بووەوە، پشتیوانان(الأنصار) هاتنە پێشەوە!

کاتێك پشتیوانان هاتن بنکەکە فراوان بوو، لەمێژووشدا گۆڕان ڕوویدا.!

* * *

ئێمەش لای ئەو کێشەیە هەڵوێستێکمان هەیە.

پشتیوانان کێن؟

ئایا ئەوانە جەماوەرێکی بەپەرۆش و موتەحەمیس بوون، کە جەماسەتەکەیان وای لێکردن بە کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ سەرسام بن، بە شێوەیەك کە سۆز بەرامبەر ئەو کۆمەڵە بێ هاوتایە پەیدا بکات، ئەوانەی بەرامبەر بەلاکان بەئارام بوون، ئەو ئارام گرتنە دورو درێژە جوانە، ئەوانە لەگەڵ زەحمەتی و بەلا توندەکان چەسپاو و خۆڕاگر بوون؟!

یان کۆمەڵێك سەرباز بوون هاتبوون ئامادەیی بەسەرباز بونی خۆیان پیشان دەدا و دەچونە ڕیزی موجاهیدانەوە؟

ئای ئەمە و ئەوە چەند لەیەك دوورن لەهێڵی بەرەوپێش چوونی بانگەوازیدا!

بێگومان خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ بە بەردەوامی لە دڵیانا هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەوەندە سیفەتی جوانی ئەو پێغەمبەرەیان بینیبو و بیستبو، چونکە بەڕاستی تاکە نمونەی مرۆڤایەتی بوو کەس شانی نەدەدا لەشانی لەوانەی ناسیبویان، یان بیستبویان لەمێژوودا. بێگومان بەزەیی و سۆزێکی زۆر لە دڵیاندا سەری هەڵدابوو بەرامبەر بڕوادارە سزادراوەکان، چونکە بەچاوی خۆیان دەیانبینی و بەگوێی خۆیان دەیانبیست چ سزایەك دەدرێن، ئەوانیش چۆن لەسەری ئارام

دەگرن.

بەڵام ئەمە و ئەوە تاکە پاڵنەر نەبوون بۆ بزواندنیان؛ بەڵکو لەسەرەتاوە ئەوە بزواندبونی، کە بڕوایان بە (لا الـه الا الله) و (محمد رسول الله) هێنابوو، بڕوایان بەخوا هەبوو، کە پەروەردگارە، محمدﷺ پێغەمبەرە، ئیسلام ئایینە، جا هاتن پەیمان لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی و لەسەر مردن و ژیان بدەن.

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون: ((تَمْنَعُونِي؟: پارێزگاریم لێدەکەن؟)) وتیان دەتپارێزین لەوانەی ژن و منداڵەکانمانی لێ دەپارێزین، هەروا وتیان: ئەگەر بڵێی بڕۆن بیابان ببڕن، دەیبڕین و، ئەگەر بمانخەیتە ناو ئەو دەریاوە دەچینە ناوی.

بەڕاستی ئەمە نواندنی سەربازیی تەواوە بۆ بانگەوازی نوێ..

لەکاتێکدا هێشتا کاتی هاتنی جەماوەر نەهاتبوو! بەڵکو ئەمان بە قەدەری خوا هاتبوون.

بەڵام چی دەبوو ئەگەر پشتیوانانﷺ هەر جەماوەرێکی موتەحەمیس بوویان و هاتبن تەنها حەماسەت و خۆشویستن و بەزەیی هاتنەوە پاڵی پێوە نابن؟ ئایا حەماسەتەکەیات لە ژێر باری ناخۆشی و زەحمەتیەکانی ڕێگا ئارامی دەگرت؟ ئایا لە بەریەکداچوندا ئارامی دەگرت، کاتێ فەرمان لەخوای بەرز و بەتواناوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی دەستدرێژی بهاتایە خوارەوە؟

بەڵام پێغەمبەرﷺ بە هاتنیان بۆ ناو بانگەوازیی وموسڵمان بونیان دڵخۆش بوو، ئەمە کارێك بوو جێگومان نەبوو.. یان بڕوادارەکانیش لە ئەهلی مەککە بە بینینی برا هاوبڕواکانیان دڵخۆش بوون، ئەمەش کارێکە جێی گومان نەبوو.. بەڵام کە پێغەمبەرﷺ لەسەر هێڵی بانگەوازەکە دەیبزواندن، ئەمەیان کارێکە گومانێکی خەست دەوری داوە.. بەڵگەشی پرسیارەکەی پێغەمبەر بوو، کە لێی پرسین: ((تَمْنَعُونِي؟: پارێزگاریم لێدەکەن؟)) جا پرسیارەکە دەربارەی بڕواکەیان نەبوو، کە هاتبون بە ڕاست و ڕێکی و بێگومان دەیانخستەڕوو، بەڵکو پرسیارەکە دەربارەی هەنگاوێکی تر بوو لەدوای ئیمانەوە، ئەویش خۆ بەسەرباز کردنیان بو بۆ ئەو شتەی بڕوایان پێهێنابوو و دەیانزانی ئەوە هەقە.

ئەگەر پێغەمبەر بیزانیبایە ئەو حاڵەیان تەنها جەماوەرێکی موتەحەمیس بووە

و هێشتا خۆیان بۆ بانگەوازەکە نەکردووە بەسەرباز؛ نەیدەبزواندن، پێغەمبەرﷺ ئیعتباری نەدەکرد، کە قاعیدەکە بەو جەماوەرە موتەحەمیسە بڕوادارە فراوان بووە -بەڵێ- لەکاتێکدا خۆیان بۆ هەڵگرتنی ئەرکەکان نەکردبووە سەرباز.

* * *

کەی ئەنصارەکان خۆیان کردە سەرباز بۆ بانگەوازەکە؟

لەپێشەوە وتمان: ئەو ئاگرەی بڕوادارەکان لە مەککە هەڵیانگیرساند، ئەو نورە بوو، کە ئەنصارەکان لە مەدینە ڕێی خۆیان پێ ڕۆشن کردەوە، هاتن خۆیان نیشانی پێغەمبەرﷺ دا بۆ یارمەتیدانی خۆی و ئەو ئایینە تازەیە..

بەڕاستی ئەو یارمەتیدەرانە(الانصار) بەقەدەری خوا هاتبوون، -بەڵێ- بەلام بە سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوا.

بوونی نمونەیەکی واقیعی شاهێد بۆ ئەو بانگەوازە تازەیە، ئەو ناوکەیە، کە کۆبونەوە بەدەوریا دێنێتە کایەوە، هەروا بۆ خۆی کۆبونەوە لە دەوری ناوکە بنەڕەتەکە دێنێتە کایەوە، پاشان بەخێرایی دوای ئەوە فراوان دەبێت، هەر کاتێ قەبارەی ناوکە بنەڕەتەکە زیاد بکات.. ئەو کۆبونەوە و فراوانبونەش سوننەتێکی پەروەردگارییە؛ لە جیهانی مادی و ژیانی مرۆڤایەتیدا وەك یەك!

ناوکە بنەڕەتەکە ئەو کۆمەڵە بڕوادارە بوو، کە لە مەککە بەدەوری پێغەمبەرداﷺ دروست بوبوو، بە هاتنەخوارەوەی وەحی خوایی و بە سەرپەرشتیە گەورەکەی پێغەمبەر و تێکەڵکردنی گیانی خۆی بریقەی پێدرابوو، بە ئارام و هەوڵ و سنگ فراوانی و حیکمەت و دیدتیژیەوە هەمیشە سەیری گەشەکردنەکەی دەکرد، پاشان تاقیکردنەوەکان هاتن زیاتر بریسکەیان پێدا و پتەویان کرد و لەخوا نزیکیان کردەوە.

لە میانەی ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾دا نەواتە[1] سەرەکیەکە پێکهات، ئەو نەواتەی مێژووی دروست کرد. !

ئەگەر بڕوادارەکان لە مەککەدا دژی قورەیش بجەنگانایە، پێکهاتنی ئەو نەواتە زۆر دوادەکەوت، ئەو سیفاتانەش، کە وەریگرتبوو گۆڕانی بەسەردا دەهات، بێجگە

---

١ نەوات: نواة — ناوك

لەو تارمایی‌یەی بەسەر کێشەی (لا اله الا الله)دا دەھات، کاتێ بگۆڕێت بۆ کێشەی لێدەر و لێدراو و سەرکەوتو و ژێرکەوتو، هەروەها کۆبونەوە پتەوەکەی دەوری ناوکە پتەوە بریسکەدارەکە دوادەکەوت.

*    *    *

با ئێستا ئەوانە بخەینە ڕوو، کە لە میانەی ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾ بە ئەنجام گەیشتووە.

بەڕاستی لە کاروانی بانگەوازیدا زۆر کار لەوپەڕی گرنگیدا بەئەنجام گەیشت.. ڕاستتر بڵێین، ئەو شتانەی جێی کێشە بوون ڕوون بوونەوە، ئەویش کێشەی ((لا اله الا الله)) بوو بەبێ کێشەکانی تر.

کێشە و ململانێی نێوان قورەیش و بڕوادارەکان لەسەر سەروەرێتی خاك نەبوو، هەروەها لەسەر دەسەڵاتی ڕامیاری نەبوو (بەڕاستی دەسەڵات خرایە بەردەم پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی واز لەو کارە بهێنێ، بەڵام نەیویست و بەردەوام بوو لەسەر (لا اله الا الله) و بڕوادارەکان لەلایەن خۆیانەوە تەنها بزوانێکیش نەبزوان بۆ دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا)..

هەروەها کێشەکە لەسەر شەرەفی خزمەتکاری ماڵی خوا نەبوو، لەسەر گەورەیی خزمەتکردنی حاجی‌یەکان نەبوو..

کێشەکە لەسەر هێزی ئابوری نەبوو، ئەو هێزەی قورەیش هەیبوو بڕوادارەکان نەیانبوو، لە میانەی جەنگی ئابوری بەهۆی گەمارۆ و برسیکردنەوە دژایەتی بڕوادارەکانیان دەکرد، بڕوادارەکانیش نە لەدوور و نە لە نزیکەوە خۆیان لە قەرەی ئەوە نەدەدا.

بەڵکو جەنگەکە لەسەر کێشە گەورەکە بوو -کە هەر دەبێ هەمیشە لەسەر ئەوە بێت- کە کێشەی یەکەمیش بوو، کێشەی گەورە لەژیانی مرۆڤدا ئەوەیە، کە دەبێ کێ بپەرسترێت و لەپاشاندا کێ خاوەنی فەرمانەکە بێ؟ کێ یاسادانەرە؟ کێ دانەری پرۆگرامی ژیانە؟ قورەیش بەپێی ئارەزوو و ئەندێشە و بۆماوە و نەریتەکانی، دەیویست خۆی بێت، بەڵام بڕوادارەکانی دەوری پێغەمبەرﷺ دەیانویست بۆ خوابێت.

هەوڵەکان بەزۆری لەوە چڕکرایەوە، کە بۆ پەروەردەکردنی بنکە پتەوەکە بێت، ئەو بنکەیەی کە بینایەکە هەڵدەگرێ.[1]

شیبوونەوەی ئایەتەکان و ڕون بونەوەی ڕێگای تاوانباران، کێشەی شەرعیەت ڕوون بووەوە.

لەدواییدا بنکە تەواو فراوان کرا بەو سەربازانەی ڕێی خۆیان ڕۆشن کردەوە بەو ئاگرەی ئەولتەی ئەهلی ناوکە سەرەکیەکەی پێ داخ کرا.

جا بە قەدەری خوا کۆبونەوە و بەپێی سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوا بەدەوری ئەو ناوکەدا هێزی حەقیقەتی ململانێکەیان خستە سەر.

پاشان کارێکی زۆر گرنکی تر ئەنجام درا، ئەویش خۆ یەکلاکردنەوە بوو بۆ خوا.

خۆ یەکلاکردنەوە پێکهاتەیەکە لە پێکهاتە گرنگەکانی ئەو پێکهاتانەی بانگەوازیی پێویستی پێی هەیە، ئەگەرچی سەبارەت بە بنکەکە بەتایبەتی و، سەبارەت بە گشت کارکاران بەشێوەیەکی گشتی بە ڕەهایی گرنگ نەبێت.

بەڕاستی خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوا لەدلی کۆمەلە پوختە هەلبژێردراوەکەدا قوڵ بووەوە لە میانەی پەروەردەکردن لە مەککەدا، لە میانەی ئەو ئایەتە دابەزیوانەی لای خواوە دادەبەزین، کە داوای ئیخلاص بوون لە پەرستنی خوای دەکرد، هەروا لە میانەی پێشەواکەوە ڕاستەوخۆ، کە خودی پێغەمبەرﷺ بوو بەڕەفتاری کردەیی فێری دەکردن چۆن خوا بە دڵسۆزی دەپەرسترێت..

بەلام پێغەمبەرﷺ، خوا خۆی بەچاکترین پەروەردە پەروەردەی کردبوو.

پێغەمبەرﷺ لەسەرەتای هەڵسانی بانگەوازەکە زۆر هەستی بە ناخۆشی دەکرد، کە خەلك بەدرۆیان دەخستەوە، زۆر پەرۆش بوو بۆ ڕێنماییکردنیان، زۆر دلتەنگ بوو بەوەی پشتیان دەکردە ڕێگا ڕاستەکەی خوا، لەبەر ئەوەی فیترەتی وابووەﷺ حەزی بەخێر کردووە بۆ هەموو خەلك.

وەحی دەهاتە خوارەوە بۆ دلخۆشکردنی و پەژارە لابردنی ﴿قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ

---

١ لە بەشی داهاتو باسی پرۆسەی پەروەردەکردن دەکەین.

لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ: بەڕاستی ئێمە دەزانین ئەوەی بێبڕواکان دەیڵێن چەندە دڵتەنگت دەکات، بەڕاستی ئەوانە تۆ بەدرۆ ناخەنەوە، بەڵکو ستەمکاران ئینکاری ئایەتەکانی خوا دەکەن﴾الأنعام/٣٣. ﴿وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ: ئارام بگرە هەرچەند ئارام گرتنت بەخوا نەبێ بەکەسیتر نیە و غەم مەخۆ لەسەر قسەکانیان، ئەوەندە سنگ تەنگ مەبە بەو فێڵانەی لێتی دەکەن.﴾النحل:١٢٧.

وەحی بۆ دەهاتە خوارەوە، کە لە غەم و پەژارەی زۆری لەسەر لابدەن، لەبەر زۆر تێگەیشتنی لەو ئایەتانەی لای خواوە دەهاتن وای لێدەکردن بڕوا بهێنن ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا: ڕەنگە تۆ بۆ ئەو کەسانەی بڕوا بەم کتێبە ناکەن، خەمی وا بخۆی، تێبچی. هەرچی لەم سەرزەمینەیە ئێمە کردومانە بە زینەت و هۆی ئارایش و جوانی، تا تاقیان بکەینەوە کامەیان کارچاکتر دەبن. ئێمە ئەوەی وا لە ڕوی ئەم زەمینەیە دەکەینە بیابانێکی وشکارۆی کە هیچی لێ شین نەبێ.﴾الکهف:٦-٨.

﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِىَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ: ئەگەر پشت کردنە بڕوایانت زۆر لا ناخۆشە، ئەگەر دەتوانی کونێك بکە زەوی یا پەیژەیەك بەرەو ئاسمان دابنێ نیشانەیەکیان بۆ بهێنە هەتا بڕوا بهێنن، بەڵام ناتوانی، ئەگەر خوا بیویستایە

هەمویانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، ئیتر ناشێ تۆ لە ڕیزەی نەزانان بی، بەڕاستی کەسانێك دێن بەدەنگ بانگەوازەکەوە شت ببیستن، مردووەکان خوا لە گۆڕەکاندا زیندویان دەکاتەوە، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا.﴾الأنعام:٣٥-٣٦.

وەحی دەهاتە خوارەوە بۆ ئەوەی بەپێغەمبەرﷺ بلێت: کاری ئەو تەنها گەیاندنە و بەس، بەلاّم ئەنجامەکانی بەتەنها بەدەست خوایە؛ ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ: بەڕاستی تۆ توانای ئەوەت نیە هیدایەتی ئەوانە بدەیت، کە خۆشت دەوێن، بەلاّم خوا هیدایەتی ئەوە دەدات کە خۆی دەیەوێت، چونکە هەر ئەو شارەزای ئەوانەیە ڕێگای ڕاست دەدۆزنەوە.﴾القصص:٥٦.

ئەوەی زۆر سەرنج ڕاکێشەرە لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە کە، لەماوەی پەروەردەی مەککەدا بەلێنێك بۆ سەرخستنی شەخصی پێغەمبەرﷺ نەهاتۆتە خوارەوە، بەلکو پێی دەوترا: ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ: یان هێندێکت لەوەی بۆمان بڕیارداون نیشان دەدەین، یان بۆ خۆمانت دەبەینەوە، تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕاگەیێنی و بە حیساب ڕاگەیشتنیش لەسەر ئێمەیە.﴾الرعد:٤٠.

بەڕاستی پێغەمبەرﷺ دڵنیابوو لە سەرکەوتن و بەدەسەلاتبوونی ئەم ئایینە.

خەبابی کوڕی ئەرەتﷺ دەیوت -کاتێ ئازاردانی بڕوادارەکان لەلایەن بێبڕواکانەوە زۆربوو-: هاوارمان برد بۆ پێغەمبەرﷺ، کە لەسێبەری کەعبەدا بوردەیەکی خستبوە ژێر سەری، وتمان: ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت؟ ئایا بۆمان ناپاڕێیتەوە؟ فەرمووی: ((قَد كانَ مَن قَبْلَكُمْ يُؤخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ في الأرض فَيُجْعَل فِيها، ثُمَّ يُؤتى بِالمِنشار فَيُوضَع عَلى رَأسِهِ فَيُجْعَل نصفَين وَيُمْشَط بِأمشاط الحَديد ما دُونَ لَحمِهِ وعَظمِهِ، ما يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دينِه، وَاللهِ لَيُتِمَّنَّ اللهُ هذا الأمر حَتّى يَسيرَ الراكِبُ مِنْ صَنعاء الى حَضرَمَوت، لا يَخافُ إلاّ اللهَ والذِّئبُ عَلى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَستَعجِلُون: ئەوانەی لەپێش ئێوە بوون پیاو دەگیرا و چاڵێکیان بۆ هەڵدەکەند و دەیانخستە ناویەوە، پاشان مشارێکیان دەهێنا و سەریان دەکرد

بەدوو بەشەوە، هەر بە شانەی ئاسن گۆشت و ئێسقانیان دەدڕنی، ئەو سرێ
ئایینەکەیانی وەرنەگێڕا.. سوێند بەخوا ئەم فەرمانە تەواو دەبێت، هەتا وای لێدێت سوار لە صەنعاوە دەچێت بۆ حەزرەمەوت، لەخوا نەبێت لەهیچیتر ناترسێت، گورگ بەلای مەڕەکانیەوە دەبێت، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.))[1]

دڵی پێغەمبەر بەڕێنماییەکانی وەحی یەکلابۆوە، کە ئەم ئایینە لە کاتی ژیانیدا دەسەلاتی دەبێ، پێغەمبەر خۆی بۆ ڕاگەیاندنی ئایین یەکلاکردەوە، پاشان پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵەکانی لەسەر یەکلابوونەوە بۆ خوا پەروەردە کرد، هەتا خۆیانیان لەبیر کردبوو، وەك کتێبەکانی سیرە بۆمان دەگێڕنەوە، وای لێهات هەمو هیوا و ئاواتیان ئەوەبوو بە دڵسۆزی خوا بپەرستن. کاتێ خوا بە دڵیانی زانی، کە بۆ ئەو یەکلابوونەتەوە بە دەسەلاتی کردن لەسەر زەویدا و ڕێی پێدان بەرەنگاری دوژمنکاری ببنەوە: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ۝ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ۝ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ: ئەوانەی جەنگیان دژ دەکرا ڕێیان پێدرا دژی دوژمنەکانیان بجەنگن، چونکە ئەمان بەڕاستی ستەمیان لێکراوە، خوا بۆ سەرخستنیان بەتوانایە، ئەوانەی لەماڵ و نیشتمانی خۆیان بەدەرنران بەناهەق ئەوەنەبێت کە دەیانوت: پەروەردگارمان (الله)یە، ئەگەر خوا هەندێکی بە هەندێك لەناوبردایە واتە بێبڕواکان بە بڕوادارەکان- پەرستگای صابئیەکان و گاورەکان و جولەکەکان و مزگەوتی موسڵمانەکان دەڕوخێنران، ئەو مزگەوتانەی زۆر یادی خوایان تێدا

---

١ رواه البخاري.

دەکرا، دە خوا ئەوانە سەردەخات، کە ئایینەکەی ئەو سەردەخەن، بەڕاستی خـوا بەهێز و بەتوانایە و کەس دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەودا، ئەوانەی ئەگەر خوا لەسـەر زەویـدا.دەسـەڵاتیان بداتـێ نوێژ دەکـەن و زەکـات دەدەن و فــەرمان بەچاکــە و قەدەغــەی خراپــە دەکــەن و ســەرەنجامی هــەموو کــاریش هــەر بـۆ لای خــوا دەگەڕێتەوە.﴿الحج:٣٩-٤١﴾.

# شوێنی پێشەنگ لە نەوە تاقانەکەدا

زۆر لەم خەڵکە ڕایان وایە کە ئەوەی شتێکی سروشتی و گونجاو بوو بۆ نەوەی یەکەم لە ماوەی پەروەردەی مەککەدا بەسەر ژیانی ئێستاماندا جێبەجێ نابێت، بۆیە لەسەرمانە هەر بۆ مێژوو بیانخوێنین، نە بۆ عیبرەت لێوەرگرت نە بۆ چاولێکردن. !

ئەمە پێویستی بە ڕونکردنەوەی تەواو هەیە، چونکە ئێستا ئەوە چوارڕیانە لە کاری ئیسلامیدا ئەگەر بە تەواوەتی شێوەکە ڕوون نەبێتەوە؛ ئەوا تەوژمەکانی کاری ئیسلامی بەردەوام دەکێشن بەیەکدا و ناگەن بەیەك هەڵوێستی یەك پارچەیی چون یەك، لەکاتێکدا دوژمنەکانی ئەم ئایینە یەك ڕیز ڕاوەستاون لەوپەڕی ڕاستەوە هەتا ئەوپەڕی چەپ، هەموویان چنگیان لە ئوممەتی ئیسلام گیرکردووە، هەوڵ دەدەن لەناوی بەرن بەیارمەتیدان و پشتگرتنی یەك، وەك لە بۆسنە و هێرسك و کشمیر و چیچان و لە هەموو شوێنێکی سەر ڕوی زەوی.

ئایا ئێمە لە قۆناخی مەککەداین، کە بەو شێوەیە کۆمەڵگە هاوبەش دانەرە، هاوبەش دانەرێك شاردنەوەی تێدا نیە، بڕوادارەکانیش ئەو کەمینەن بڕوایان هێناوە بە ئایینی تازە، کە بێدەسەلات و بێزراون لەناو ئەو کۆمەڵەدا، بەپێی پێویستیەکانی ئەو کۆمەڵگەیە دەبزوێن؟ یان ئێمە لەناو کۆمەڵێکی موسڵماندایین و لەئیسلام لایانداوە، هەوڵ دەدەین بارودۆخەکەیان ڕاست بکەینەوە لەناو ئەو کۆمەڵەدا بەوەی بیانگێڕینەوە سەر ئیسلامە ڕاستەکە؟ یان بە تەواوەتی ئێمە چین؟

لەبەر مەترسی ئەم کێشەیە و ئەو دەمەقاڵێیەی وروژاوە بەدەوریا و، ئەو جیابوونەوەی لێی دەکەوێتەوە بەهۆی ئەو دەمەقاڵێیەوە، حەز دەکەین بەڕونی دیراسەی بکەین و بگەینە تێڕوانینێکی ڕوون، بۆئەوەی سۆزەکانمان کارمان تێبکات، یا بە چەند هەڵوێستێکی دیاریکراو، کە حەزی پێبکەین یا حەزی

پێنەکەین کاریگەر بین.

بەهەموو دڵنیاییەوە! ئێمە لە قۆناغی مەککەدا نین.. جا ئێمە –کارکەران لەکێڵگەی بانگەوازیدا و چون بەدەمیەوە– ڕۆژو دەگرین و حەج دەکەین، ڕۆژوو حەجیش لە مەدینە فەرزکرا! ئێمە هەموو ئەو شتانە بە حەرام دەزانین کە خوا حەرامی کردوە، هەرچی خوا پێویستی کردبێت بەپێویستی دادەنێین، تەنها ئەوانە بە حەرام نازانین، کە لە مەککەدا حەرامێتیان هاتۆتە خوارەوە، یا هەر ئەوانە بەحەڵاڵ نازانین کە لە مەککەدا حەڵاڵ بوونیان هاتۆتە خوارەوە..

بە هەموو دڵنیاییەوە! ئێمە لە قۆناخی مەدینەدا نین! چونکە بانگەوازەکە لە زەویدا دامەزراوو بەهێز نیە، شەریعەتی خواش لەبەشی زۆریی جیهانی ئیسلامیدا کارپێکراو نیە، ئەوانەش بە بانگەوازەکە هەڵساون ئێستا لە بەندیخانەکاندا بزرکراون، یا بە پەتی سێدارەکانەوە هەڵواسراون، یا بەهەموو شێوەیەك ڕێیان لێگیراوە.

بە وردیی ئێمە لەکوێین؟ کام پەیڕەو(منهج) بۆ ئێمە دەگونجێت؟ ئایا ئەو پەیڕەوەی پێغەمبەرﷺ لە مەککەدا بەفەرمانی خوا شوێنی کەوتبوو؟ یا بەرنامە و پەیڕەوی پێغەمبەر لە مەدینەدا بە فەرمانی خوا لەسەری دەڕۆیشت؟ یا شتێکی ترە نە ئەمە و نە ئەوە، بە ئارەزووی خۆمان و بەبێ ڕێسایەکی دیاریکراو ئیجتهادی تێدا دەکەین؟!

کێشەکە –وەك دەبینی– گرنگی خۆی هەیە و پێویستی بەدیاریکردن هەیە.

* * *

بێگومان لێرە جیاوازی ئاشکرا و ڕون لەنێوان ئێمە و کۆمەڵگەی مەککەدا هەیە، کە زۆر خەڵك شانیان داداوە لەسەری بۆ جیاکردنەوەی بارودۆخی ئێمە و ئەو کۆمەڵگەیە.

بەڕاستی خەڵك لە کۆمەڵگای مەککەدا بەڕەهایی نکوڵی فیکرەی (لا الە الا اللە)یان دەکرد، هەتا قورئان ئەو سەرسوڕمانەیان دەگێڕێتەوە، کە هەیانبووە دەربارەی ئەو یەکخواپەرستیەی، کە پێغەمبەرﷺ بۆی هێنابون: ﴿أَجَعَلَ ٱلْآلِهَةَ إِلَـٰهًا وَاحِدًا إِنَّ هَـٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾: ئایا خواکانی کردووە بە یەك خوا،

بەڕاستی ئـەوە شـتێکی سـەیرە.﴾ص:٥. لـەکاتێکدا ئێمـە لـە جیهانی ئیسلامیدا هەموومان دان دەنێین بەوە، کـە خـوا یەکـە و بڕوامـان نیـە خوایـەکی تـر هـەبێت لەگەڵ (اللە)دا.

خەڵك بەگشتی نکوڵی بیرۆکـەی زیندوبوونـەوەیان دەکـرد، هـەتا قورئـان ئـەو سەرسامیەیان دەگێڕێتەوە، کە هەیانبووە دەربارەی ئـەوەی پێغەمبـەر هێنـابووی لە بڕوا بون بـە زیندوبوونـەوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٍ جَدِيدٍ ۝٧ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۗ: خوانەناسەکان ئێژن: ئاخۆ ئێـوە گەرەکتانـە پیاوێکتـان بۆ دەسنیشـان کـەین، پێتـان ئێـژێ: ئەگـەر ئێسـك و پروسکیشـتان بـەرباد ببـێ، سەرلەنوێ زیندوو دەبنەوە؟ ئـاخۆ درۆی بـەدەم خـواوە هەڵبەسـتوە، یـان شـێت بووە.﴾سبأ:٧-٨.

لەکاتێکدا ئێمە -بەگشتی- بڕوامان بە زیندوبوونەوە و لێپرسینەوە و پاداشـت و بەهەشـت و دۆزەخ هەیـە، تـۆ واز لـەو کەمینـە بێبڕوایـە بێنـە کـە لـەم بـوارەدا کێشیان نیە.

خەڵك باوەڕیـان بـە نـاردنی پێغەمبـەر و پەیامەکـەیان نـەدەکرد، وەك قورئـان لێیانـەوە دەگێڕێتـــەوە؛ ﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ: لایـان سـەیر بـوو، کـە لـەخۆیان ترسـێنەرێکیان بـۆ بێـت، بێبڕواکان دەیانوت: ئەو پیاوە سیحربازێکی درۆزنە.﴾ص:٤. بەڵام ئێمە واز لـەو کەمینە مولحیدە بێنە کە بێکێشن- بڕوامان بە هاتنی پێغەمبەرﷺ هەیە و بڕوامان هەیە، کە لەلایەن پەروەردگاریـەوە نـێرراوە و قورئـان قسـەی خوایـە و ناردویتیـە خوارەوە بۆ سەر نێرراوەکـەیﷺ، ئـەو قورئانـە قسـەی مـرۆڤ نیـە و لـە چیرۆکـە پڕوپوچەکانی پێشوو نیە..

هەڵبەت ئەوانە هەموو ڕاست و هەقیقەتن..

بەڵام وەرە لەلایەکی ترەوە بنواڕین.

ئیسلام هات بـۆ ئـەوەی هـەرچی هـۆ و پێنـاو(وسـیط) هەیـە لـەنێوان بـەندە و

پەروەردگاریدا نەهێڵێ، پەیوەندیش لەنێوان بەندەکان و خوادا ڕاستەوخۆ بکات؛ ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ: ئەگەر بەندەکانم لەمەڕ من لەتۆ دەپرسن، من نزیکم؛ هەرکەس هانام وەبەر بێنێ، بێوەڵامی ناهێڵمەوە، با ئەوانیش لە فەرمانی من دەرنەچن، بڕوای تەواویان بە من بێ؛ بەشکو ڕێی ڕاست بەدی دەکەن.﴾البقرة:١٨٦.

جا صۆفیگەری چی لە بیروباوەڕی خەڵك کردووە؟ لە ڕاستیدا شێخ لە هەستی موریدەکەیدا خۆی بەرجەستە کردووە هەتا بووەتە واستە لەنێوان بەندە و پەروەرگار، بەندە خاوەنی ئەوە نیە، کە بە ناوە جوانەکانی خوا هاوار بۆ خوا بکات بەبێ ئیزنی شێخ، کە ئەو ئاگای لە دڵیەتی و بڕیار بۆ هەریەکێك دەدات کە چ ناوێك لەو ناوانەی بۆ دەشێت و ئەو ماوەیەی بۆی هەیە ئەو ناوە بەکاربهێنێ، شێخ بە بەردەوامی دڵی موریدەکانی داگیرکردووە هەتا دوای مردنیشی بە هەزار ساڵ، مردن نابێتە بەربەست لەنێوان دەسەڵاتی ڕۆحی و دڵەکاندا.. دەستهێنان بە گۆڕەکەیدا و پاڕانەوە لای و هاواربۆکردنی و داوای یارمەتی لێکردنی و قوربانی کردن بۆی لە نیشانەکانی دڵسۆزی موریدە بۆ شێخ، هەروەها ئەوانە هۆیەکن بۆ نزیك بونەوە لە خوا!

ئایا ئەو قسەیە چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ قسەی ئەوانەی دەیانوت: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ: ئێمە ئەم بتانە ناپەرستین، بەڵکو پەنایان بۆ دەبەین بۆ ئەوەی لەخوامان نزیك بکەنەوە.﴾الزمر:٣.. ئایا ئەوە هاوبەش دانانی ڕوون و ئاشکرا نیە؟

ئیسلام هات بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو یاسا دەسکردەکانی مرۆڤ، بۆ ئەوەی شەریعەتەکەی خوا بەتەنها بەرپا بێت، ئەمەشی بە بنەمای عەقیدەوە پەیوەست کرد؛ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ: هەرکەس بەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە حوکم نەکات، لە بێبڕواکانە.﴾المائدة:٤٤.

خـوا نیشـانەی ئـەو نیفاقـەی لابـەری بڕوایـە، کـردوە بـە پشـت کردنـە شـەریعەتەکەی: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ: دەڵێـن: بڕوامـان بـەخوا و بەپێغەمبەر هێنا و بەرفەرمانین. لەدوای ئەمەش بڕێکیـان ڕو وەردەگێڕن؛ ئەوانە هەر بڕوادار نین. هەر کاتێکیش بەرەو خـودا و ڕاسپاردەی بانگیـان دەکـەن، کە خـۆی بـەکاریان ڕابگـا؛ کـەچی دەستەیەکیان هـەر خـۆی لیّ دەبوێـرن. ئەگـەر لـە قازانجی وان بێ، دێنە لای و دەیسەلمێنن. ئاخۆ ئەمانە دەغـەزیان لەدڵدایە، یـان دوودڵن، یان دەترسن خودا و پێغەمبەری خودا ناهەقیـەکیان لیّ بکـەن؟ نا ئـەوان خۆیان ناهەقن. بەڵام ئەوەی باوەڕدارن، هەر کاتێ بانگ دەکرێن، کـە بێـن بـەرەو خودا و ڕاسپاردەی، هەتا بەکاریان ڕابگا؛ گورجێ دەڵێن: بیستمان و بەرفەرمانین. ئەوانە دیارە ڕزگارن.﴾النور:٤٧-٥١.

شوێنکەوتنی ئەو دەستور و یاسایانەی مرۆڤ دایناون بێئەوەی خوا ناردبێتیە خـوارەوە، وەك ئەوەیـە کردبێتیـانن بـە پـەروەردگاری خۆیـان، لەسـەر ئاسـتی پەرسـتنی جگـە لـەخوا وەك یـەك وایـە؛ ﴿ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ: لەبری خودا، زانـا و ڕەبەنەکانی خۆیان و مەسیحی فرزەندەی مەریەمیان کـردە خـوا؛ فەرمانیشـیان پێدرابو جگە لە خوای تاك و تەنیا نەپەرستن. لە غەیرەز ئەو هیچ شت بۆ پەرستن

ناشێ. خودا بێعەیبە و بەدوورە لەو شتانەی بە هاوتای ئەوی دەزانن.﴾التوبة: ٣١.

جا عەلمانیەت چ کارێکی کردۆتە سەر ژیانی خەڵك؟ چەند حکومەت لەسەر زەوی ئیسلامدا حوکم بەوە دەکات، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە؟ لەسەر زمانی عەلمانیەکانەوە چی بە شەریعەتەکەی خوا دەوترێ؟ ئایا ئەوە هاوبەش دانانی روون نیە؟

کەواتە چۆن حوکم لەسەر ئەم بارودۆخانە بدەین؟

لە حوکم دان بەسەر بارودۆخی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی خەڵك ئاشکرای دەکەن، کە عەقیدەیانە و لەنێوان ئەوەی لە واقیعدا کاری پێدەکەن.. پاشان جیاوازی لە حوکم دان بەسەر ئەو هاودژی(تناقض)انەدا، ئایا ئەوە دەرچوونە لە ئیسلام، یا لەخوار ئەوەوەیە؟ بە دەربڕینێکی تر ئاڵۆزیەکە بریتیە لە حوکم دان بەسەر خەڵکدا.

ڕای من -لەچەند ساڵێکەوە- ئەوەیە، کە ئەم کێشەیە پێویست ناکات سەرقاڵمان بکات لەبواری بانگەوازیدا، پێویست ناکات لەسەر ئەوە هەڵوێستە بکەین و جیابینەوە لێی و دەمەقاڵێ بکەین و بەش بەش ببین و هەر کەس لەئێمە بەلایەکدا بڕوات.

بەڕاستی ئەم خەڵکە -جگە لەوانەی پەروەردگارت رەحمی پێکردوون- بێگومان کەوتونەتە ناو هاوبەش دانانەوە، هاوبەش دانانی بیروباوەڕ بێت، یان هاوبەش دانانی پەرستن بێت، یا هاوبەشدانانی حاکمیەت(شوێنکەوتن) بێت وەك یەکە.. بەڵام حوکم دان بەوەی، کە ئەوانە هاوبەشدانەر(مشرك)ن، ئەوە کێشەکی ترە و جیاوازە، چونکە هەر کەسێ کەوتە ناو هاوبەش دانانەوە حوکمی هاوبەش دانەری بەسەردا نادرێ، مەگەر چەند مەرجێکی دیاریکراوی تێدابێت و ئەو بەربەستانەی تێدا نەبێت، کە ڕێبگرێت لەوەی حوکمی بێبڕوایی بەسەردا بدرێت..

ئیبن تەیمیمە -بەر ڕەحمی خوا بکەوێت- دەڵێت:

ئەوەم بۆ روون دەکردنەوە، کە لە پێشینەکان و پێشەواکان هاتوە دەربارەی بێبڕواکردنی گشتی ئەوانەی ئەوەو ئەوە دەڵێن، ئەویش هەر هەقە، بەڵام دەبێ وتنی بەگشتی و بە دیاریکردن جیابکرێتەوە. ئەوە یەکەم کێشەیە لە کێشەکانی بنەما گەورەکان کە نەتەوەی ئیسلام کێشەیان لەسەری هەیە، کە ئەویش کێشەی

هەڕەشەیە(الوعید)، جا بەڕاستی دەقەكانی قورئان دەربارەی هەڕەشەكە ڕەهایە وەك ئایـەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا: بەڕاسـتی ئەوانـەی بەستەم ماڵی هەتیوان دەخۆن.﴾الآیة.. هەروەها هەموو ئەو دەقانەی هاتوون؛ كە هەركەس ئەوەی كرد ئـەوەو ئـەوەی بۆ دەبێت، ئەمانـە هـەموو ڕەهـای گشـتین! ئەویش وەك ئەوە وایە، كە یەكێ لە پێشینەكان وتبێتی: هەركەس ئەوە بڵێت ئـەو كەسە ئەوەیە، پاشان كەسێكی دیاریكراو حوكمی هەڕەشـەكەی لەسـەر لادەبرێـت بە تۆبەیەك، یا بە كردنی چاكەیەكی سڕەرەوەی تاوان، یا تـووش بوونـی بەڵایـەك ببێتە كەفارەتی، یا شەفاعەتێكی قبوڵ كراوی بۆ بكرێـت.. بێبڕواكردن خـۆی لـە هەڕەشـەیە، هەرچـەندە ئـەو قسـەیە بەدرۆخسـتنەوەی فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ بێت، بەڵام لەوانەیە پیاوەكە تازە موسڵمان بوبێت، یا لە بیابانێكی دور پەروەردە بوبێت، ئەو جۆرە كەسانە بەبێ بڕوا دانانرێن بە ئینكـاركردنی ئەوانـەی ئینكاریـان لێدەكات، هەتا بەڵگەی لەسەر دروسـت دەبێت، دەشـبێ پیاوەكـە ئـەو دەقانـەی نەبیستبێ یا بیستبێتی، بەڵام لای نەچەسپابێت، یا دەقێكی تر بەرهەڵسـتی بـووە تەئویلكردنی پێویست كردووە، ئەگەر بە هەڵەش تەئویلی بكات.[1]

لەشوێنێكی تردا وتویەتی:[2] بەڕاستی ئەو دەقە هەڕەشـەییانەی لـە قورئـان و سوننەتدا هەن، دەقی پێشەواكانیش هاتوون بە بێبڕواكردن و فاسق كردنی خـەڵك و ئەو شێوانە، چەسپاندنیان پێویست نابێت دەربارەی كەسێكی دیاریكراو، مەگەر مەرجەكانی هەبن و بەربەستەكانی نەبن، لێرەدا جیاوازی ئەصڵ و فەرع نیە.

لە شوێنێكی تردا وتویەتی:[3] بەڵام بێبڕواكردنیان و مانـەوەیان لـە ئـاگردا بـۆ هەمیشە دوو گوتەی زانایانی بەناوبانگی لەسەرە، دوو ڕیوایەتیش لە ئەحمەدەوە، دوو گوتـەش لـە خەواریجـەكان و دەرچـووە حەروریـەكان و ڕافیزەكـان و هاوشێوەكانیان.

بەڕاستی هـەر قسـەیەك بكرێت پێچەوانـەی ئەوانە بێـت، كـە پێغەمبـەر ﷺ

---

١ مجموع الفتاوى-المجلد الثالث ص٢٣٠-٢٣١.

٢ مجموع الفتاوى-المجلد العاشر ص٣٧٢.

٣ مجموع الفتاوى-المجلد الثامن والعشرون ص٥٠٠-٥٠١.

هێناویەتی بێبڕواییـــە، هـەروەها ئـەو کردارانـەیان، کـە لـە ڕەگـەزی کردەوەکـانی بێبڕواکانـە، کـە بەرامبـەر موسـڵمانەکان دەیکـەن بێبڕواییـە، جگـە لـەم شـــوێنە بەڵگەکانی ئەمەم باس کردووە، بەڵام بێبڕواکردنی یەکێکی دیاریکراو و حوکم دان بە مانـەوەیان بـۆ هەمیشـە لـەئاگردا، لەسـەر چەسپاوی مەرجـەکانی بـێبڕوایی و لەسەر نەبوونی بەربەستەکانی دەوەستێت، بـەڵکو قسـە دەکـەین بـە دەقـەکانی (وەعد و وەعید و تەکفیر و تەفسیق)، حوکم نادەین بۆ دیاریکراوێك بچێتە ناو ئـەو گشتیەوە، هـەتا ئـەو پێویسـتیەی تێـدا دەبێـت، کـە بەرهەڵسـتی نیـە، ئـەو قاعیدەیەشم لە قاعیدەی تەکفیردا خستۆتە ڕوو.

ئا ئەوە کلیلی کێشەکەیە سەبارەت بە بانگەوازیی و بەرنامەی بزوتنەوە.

جا خەڵکی –مەگەر کەسێك خوا ڕەحمـی پـێکردبێت– کەوتونـە نـاو هاوبـەش دانانێکەوە، کە لە هاوبەش دانانی سـەردەمی نـەفامی دەچێـت، ئەگـەریش لەبـەر زەرورەت نـەبێت هـەموویان حوکمـی هاوبـەش دانانیـان بەسـەردا دەدرێ، ئـەوەی لامان گرنگە لەم بانگەوازیەدا، ڕوونکردنەوەی حەقیقـەتی ئیمانـە، ڕوونکردنـەوەی هەڵوەشێنەرەکانی ئیمانە، هەروا بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ وازهێنان لەوەی تێـی کەوتون لەو هاوبەش دانە –بەچاوپۆشین لەوەی بێبڕوان یا بێبڕوا نـین لـەحوکمی خـوا–، بانگکردنیـان بـۆ وەرگرتنـی ئیســـلامەتیەکی ڕاسـت و کـارپێکردنی لـەم جیهانەدا، نەك لە جیهانی خەیاڵ و ئەندێشەدا.

بۆ ئێمە گرنگ نیە بە فلانەکەس بڵێین: تۆ هاوبەش دانەری(یا دەربارەی ئـەوە بڵێین)، بەڵکو ئەرکەکەی ئێمە ئەوەیە پێی بڵێین: ئـەوەی تـۆ دەیکـەیت هاوبـەش بۆخوادانانە و بانگی بکەین –بەحیکمەت و ئامۆژگاری چـاك– بـۆ دەرچـوون لـەو هاوبەش دانانە و هاتنەناو حەقیقەتی ئیسلام.

ئەوە لەو لایەنەوە کە خەڵك تێیدا دەژی و ئەرکی ئێمەش بەرامبەری، لەلایەکی ترەوە ئەو بارودۆخـەی جیـهانی ئیسـلامی تێدایە –جگـە لەوانـەی پـەروەردگاری ڕەحمی پێکردون– ئەو ڕەوشەی دژی بانگەوازیی وەستاوە و نایەڵێ بانگبەران بە تەواوەتی حەقیقەتی بڕوا و هەڵوەشـێنەرەکانی ئیمـان ڕوون بکاتـەوە، بەتایبـەتی ئەوانەی پەیوەستن بـەو یاسـایانەی، کـە خـوا نەیناردونـە خـوارەوە؛ بەندیخانـە و سێدارەکان لەسەر ڕێگای بانگەوازیدا زۆر زۆرە، چاو دەبڕنە ئەو کەسەی دەیەوێت

حەقیقەتی (لا الـه الا الله) ڕون بکاتەوە بەو شێوەی، کە لای خواوە هاتۆتە خوارەوە. جا گونجاوترین بەرنامە و پەیڕەو بۆ بانگەوازیی چیە؟ بۆ چ شتێك بانگەوازیی بکەین؟ لەسەر چ شتێك بەچڕی بانگەواز بکەین؟ کام لە هۆکان دەمانگەیەنێ -یا نزیکمان دەکاتەوە- لەوەی مەبەستمانە؟

ئەگەر ئەو بارودۆخەی، کە ئێستا هەیە لەسەر شێوە ڕاستەکەی وێنا بکەین و خۆمان لەو ئالۆزیانە رزگار بکەین، کە دەرکردنی حوکم بەسەر ئەوەی ئێستای لێ دەکەوێتەوە، بەر لە بیانو دروست کردن لەسەریان بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك، ئەوا خۆمان دەبینینەوە، کە لە بانگەوازیدا لە قۆناخی مەککەوە نزیکترین، ئەگەرچی بەهۆی هەندێ جیاوازی نێوان ئەم ڕەوشە و ئەو ڕەوشەدا بە تەواوی وەك یەکیش نەبین، ئەویش جیاوازیەکە دەبێتە هۆی حوکمی جیا بەسەر خەڵکدا، بەڵام حوکمەکە بەسەر ڕەوش و بارەکاندا ناگۆڕێت و ڕەوشەکان خۆیان بڕیاری حەقیقەتی بەرنامەی بانگەوازەکە دەدەن و بڕیاری نزیکترین هۆکان دەدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان.

لێرەدا دەبینین شوێنی چاولێکردن لە ئەوەی یەکەم زۆر فراوانترە لەوەی لە یەکەم کاتدا دەردەکەوێت، بەڕاستی کێشەی زۆر هەیە وامان لێدەکات کە تیایاندا بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمە و، بەچاوی تیژی کراوەوە لێی وردبینەوەو ڕێگای بانگەوازەکەمانی تێدا بدۆزینەوە، بە تەمای فەزڵی خواین ڕێگای ڕاستمان نیشان بدات.

* * *

ئەگەر توێژینەوەی باری ئوممەی ئیسلامی بکەین -کە پێویستە بیکەین-، لەماوەی چواردە سەدەی ڕابوردودا لادانی زۆر دەبینین کەوتۆتەوە کاروانی ئوممەتەوە، کە بەردەوام خەڵکی وردەوردە لە حەقیقەتی ئیسلام دورخستۆتەوە، هەتا ئیسلام گەیشتۆتە نامۆییەکەی دووەمی، ئەو نامۆییەی پێغەمبەر دەربارەی فەرموویەتی: ((بَدَأَ الإسلامُ غَرِيباً وَسَيَعُودُ غَرِيباً كَمَا بَدَأَ: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکردووە، دووبارە نامۆ دەبێتەوە وەك چۆن دەستی پێکردوە)).[1]

---

١ أخرجه مسلم.

ئەگەر بەدوی ئەو لادانانە بکەوین -پێویستە ئەوە بخەین- کە دەبێت دەردەکە دیاری بکەین بۆ دانانی جۆری چارەسەرکردنی- دەبینین لادان هەر تەنها لەسەر ڕەفتار نیە، بەڵکو چەمکەکانیشی گرتۆتەوە، بەڕاستی هەموو چەمکە ئیسلامیەکان توشی لادان هاتووە، هەتا چەمك(مفهوم)ی (لا الـه الا الله) بەڵکو بە چەمکی (لا الـه الا الله) دەستی پێکردووە -هەروا چەمکی پەرستن و چەمکی قەزاوقەدەر و چەمکی دونیا و ئاخیرەت و چەمکی شارستانیەت و چەمکی پەروەردە و چەمکی جیهاد و..هتد.[1]

ئەگەر کار بەو شێوەیە بێت بەچی دەست پێبکەین؟ ئایا هیچ ڕێیەك هەیە تا دەست بکەین بە ڕاستکردنەوەی چەمکی (لا اله الا الله)؟ ئایا دەکرێ ژیانی خەڵك لەسەر بنەمای ئیسلامیی ڕاست بکرێتەوە، ئەگەر چەمکی (لا اله الا الله) لە مێشك و دڵی خەڵکدا ڕاست نەکرێتەوە؟ جا لەبەر ئەوەی ژێریی ئەرکەکەی بریتیە لە هەست کردن بە هەق و ڕاستی، بەڵام دڵەکان ئەرکیان گۆڕینی هەستی بیریی(ذهني)یە بۆ شەحنەیەکی ویژدانی پاڵنەر بۆ ڕەفتاری کردەیی لەجیهانی واقیعدا.. ئا ئەوە ڕێگای چاکسازیە.

با ئێستا ببینین چەمکی (لا اله الا الله) لە هەستی خەڵکدا تووشی چ بووە؟

بەڕاستی زۆر کز بووە، هەتا (لا اله الا الله) بووە بە وشەیەکی پەتی، هەر بە زمان دەوترێت، کاریگەری لەسەر واقیعی زۆرینەی خەڵك نەماوە، جگە لەوانەی پەروەردگارت ڕەحمی پێکردوون، بەڵکو وای لێهاتووە لەلای زۆرینەی خەڵك هاوبەشدانانی تێکەوتووە، جا چ هاوبەشدانانی بیروباوەڕ بێت، یان هاوبەشدانانی پەرستن بێت، یان هاوبەشدانانی یاسادانان.

جیاوازی نێوان واقیعی ئێستامان و واقیعی کۆمەڵگەی نەفامی لە کاتی هاتنی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە، کە ئەوان شیرکی ڕون و ئاشکرایان دەکرد و لە هەمان کاتیشدا نەیاندەویست بڵێن: لا اله الا الله.. بەڵام خەڵکی ئەم سەردەمەی ئێمە - جگە لەوانەی پەروەردگارت ڕەحمی پێکردوون- بەدەم دەڵێن: لا اله الا الله، پاش ئەوە دەکەونە ناو هەموو جۆرەکانی هاوبەشدانانەوە یا جۆرێك لە جۆرەکانی.

---

[1] ئەگەر ویستت سەیری کتێبی (مفاهيم ينبغي أن تصحح) بکە.

لەبەر ئەوە ئێمە پێویستمان بە بەرنامەیەك هەیە زۆر لە بەرنامەکەی پێغەمبەرﷺ بچێت لە مەککەدا، بۆ دەرخستنی حەقیقەتی (لا الە الا الله) پاشان گۆڕینی بۆ ناو ژیانی ئەوانەدا، کە ئەم ئایینەیان وەرگرتووە.

بەڕای من ئەوە ئەرکێکی زەحمەتە و هیچی کەمتر نیە لەو زەحمەتی و هەوڵدانەی هەوڵدراوە لە جەولەی یەکەمدا بۆ لابردنی نامۆیی لەسەر ئیسلام، بەڵکو لەوانەیە لابردنی نامۆیی دووەم گرانتر بێت لە نامۆیی یەکەم، لەبەر ئەوەی خودی پێغەمبەرﷺ ئامادەبووە خۆی نمونەی پێشرەوی زیندوو سەرچاوەی ئیلهام بووە.

زەحمەتیی لابردن لەجەولەی یەکەمدا ئەنجامی توندوتیژی دوژمن دروست بووبوو، لەگەڵ توندی دەستگرتن بە عورفی باووباپیرانەوە: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا: بەڕاستی ئەم قورئانەمان لەسەر زمانی تۆ ئاسان کردووە بۆ ئەوەی لەخواترسەکان دڵخۆش بکەیت و دوژمنە سەرسەختەکان بترسێنی.﴾مريم:٩٧.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ: کاتێ پێیان دەوترا شوێن ئەوە بکەون، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە، دەیانوت: بەڵکو ئێمە شوێن ئەوە دەکەوین، کە باووباپیرانمان ئێمەیان لەسەر ڕاهێناوە، ئەگەریش باووباپیرانیان عەقڵیان بەهیچ نەشکابێت و ڕێی ڕاستیان نەدۆزیبێتەوە﴾البقرة:١٧٠

بەڵام لەجەولەی دووەمدا، هەست بە زەحمەتی ناکەین، بۆ ئەوەی خەڵك وا لێبکەین بەدەمیان بڵێن: لا الە الا الله، ئەوان بەیانی و ئێوارە دەیڵێن، بەڵام زەحمەتی لەوەدایە وا دەزانن هەر بەدەم بڵێن (لا الە الا الله) دەبنە موسڵمان و سیفەتی ئیسلامیان پێوە دەلکێ جا ڕەوشتیان هەرچۆنێك بێت و هەرچی بکەن بۆ نەهێشتی پێویستیەکانی (لا اله الا الله) لەجیهانی واقیعدا. ئەگەر پێیان بڵێیت: (لا اله الا الله) چەند پێویستیەکی هەیە، هەتا لەسەریان نەڕۆن ئیسلامەتیتان بۆ ناچەسپێ، ئەگینا بەبڕیارە زمانیەکەی وەردەگیرێ و بە هەڵگەڕاوە(مرتد) دادەنرێت، بەدرۆت دەخەنەوە! دەڵێن ئێمە لە باووباپیرانمانەوە ئەوەمان

نەبیستووە. !

بەڕاستی ئەوانە –بەشی زۆریان– کەوتونە ناو پیسی و لەکەی بیری ئیرجائیەوە، ئەوانەی ئەڵێن: ((هەرکەس وتی: (لا الە الا الله) ئەو کەسە دەبێتە بڕوادار، ئەگەریش کردەوەیەك لە کردەوە ئیسلامیەکان نەکات))! ئەوانەی دەڵێن: ((بڕوا تەنها تەصدیقە یا تەصدیق و ئیقرارە، کردەوە ناچێتە ناو ناوی بڕواوە))! ئەوەی هەموو شێوە سەرپێچیەکان تەنها گوناهە، پاشان دەڵێت: لەگەڵ بڕوادا سەرپێچی و گوناه زیانی نیە. !

لابردنی شوێنەواری ئەو لەکە و پیسیە لەژیانی خەڵکدا و گێڕانەوەیان بۆ چەمکی ڕاستەقینەی ئیمان ئەوەی پێشینە چاکەکان لەسەری بوون و ئەوەی دەڵێت: ئیمان گوتە و کردەوەیە، ئەوە ئەرکی ڕاستەقینەی نامۆکان(الغرباء)ە، ئەوانەی پێغەمبەرﷺ مژدەی پاداشتی زۆری پێداون بە فەرموودەی ((طوبى للغرباء))، فەرموویەتیﷺ: ((فطوبى للغرباء يصلحون ما أفسد الناس من سنتي: طوبى کە شوێنێکی زۆر خۆشە لە بەهەشتدا بۆ ئەو نامۆیانەی، کە خەڵك سوننەتی منیان تێکداوە، ئەوان چاکی دەکەنەوە)).[1]

پاشان لە بەشێکی سەربەخۆیدا باسی پەروەردە دەکەین، بەڵام ئێمە لێرەدا بڕیار دەدەین خاڵی دەست پێکردن لە بانگەوازیدا پێویستە ناساندنی (لا الە الا الله) بێت، کە حەقیقەتەکەی لە نامۆییەکەی دووەمی ئیسلامدا نادیارە، وای لێهاتووە کاتێ حەقیقەتەکەی نیشان بدرێت خەڵك لێی دووردەکەونەوە. !

هەروەها بڕیار دەدەین ناساندنی لا الە الا الله لەگەڵ پەروەردە و پێویستیەکانی–زانیاریەکی پەتی نیە بدرێت بەگوێی خەڵکدا، وتار و دەرس و ئامۆژگاری پەتی نیە، بەڵکو هەوڵێکی ڕاستەقینەی بەردەوامە، پێویستی بە بەدواداچون و هەوڵی بەردەوام هەیە و پێویستی بەدواداچونی ئەوانە هەیە، کە دێن و دەچنە ناو دەرونەوە، بۆ ڕەواندنەوەی ئەو تەمەی، کە بیرۆکەی ئیرجائی هێناویەتیە کایەوە، بێجگە لەو تەمەی بیرۆکەی عیلمانی داهێنراو دایهێناوە، هەردوکیان خۆرەن بینای عەقیدە لاواز دەکەن و لەو شتە زیندوانەی ناوی، بەتاڵی

---

[1] رواه الترمذي وقال حديث حسن.

دەكەنەوە و هێزە بەكارەكەی ناهێڵن، ئەو هێزەی كە ڕۆژێك هەیبووە، كە لەسەر ئەو هەقیقەتە بووە، كە خوا ناردویەتیە خوارەوە.

پاشان بڕیار دەدەین پەلەكردن لەم كارە -لەسەر ئەو بناغەیەی، كە ئەو كارە بەڵگەنەویست و ئاشكراو ڕونە، پێویستی بە هەوڵ و كۆشش نیە، یا لەسەر ئەو بناغەیەی ئەو هەوڵ و كۆششەی تێیدا دراوە بەسە بۆی، یا لەسەر ئەو بناغەیەی كە ئەركێكی زۆرمان لەدەست دایە، كاتی زۆرمان بەدەستەوە نیە بۆ ناساندنی (لا اله الا الله) سەرەڕای پەروەردە و پێویستیەكانی، چونكە ئەگەر پەلەمان كرد كارەكەمان خێر ناهێنێ و خزمەتی بانگەوازەكە ناكات، لە كۆتاییدا ئەنجامێكی بەرداری نابێت.

ئەوەی دەبێت باش سەرنجی لێ بدرێت لە نەوە تاقانەكەدا ئەوەیە، دەبێ بزانین قورئان چەند گرنگی داوە بەم كێشە و، پێغەمبەرﷺ چەند گرنگی داوە بۆ ڕون كردنەوەی لەگەڵ پەروەردە و پێویستیەكانی. چونكە ئەو كێشەیە بەشی زۆری ماوەی بانگەوازەكەی خایاندووە و بەشی زۆری هەوڵەكانی بردووە. گەر زانیمان لەبەر چ هۆیەك قورئان لە سورەتە مەككییەكاندا بەخەستی باسی ئەو كێشەیەی كردووە، بۆمان دەردەكەوێت كە ئەوانەی بەو قورئانە قسەیان لەگەڵدا كراوە، یەكەم جار ئەوان هاوبەش دانەر بوون، با وەبیرمان بێتەوە ئێمە ئەمڕۆ بەرەو ڕوی كۆمەڵێك بوینەوە كەوتونە ناو هاوبەش دانانەوە، ئەگەریش هەموویان لەبەر زەرورەت هاوبەش دانەر نەبن، ئەو هاوبەشدانانەی ئەمانی تێكەوتووە هەر لەوجۆرە هاوبەش دانانەیە، كە عەرەبە هاوبەشدانەرەكانی تێكەوتبوو، كە ئەویش هاوبەشدانانی بیروباوەڕ و پەرستن و حاكمیەت بووە.

هەروەها لە سەرمانە ئەوەمان لەیاد بێ، كە تەركیز كردن لەسەر ئەم كێشەیە هەمیشە هۆكەی ئەوە نەبووە، كە قسە لەگەڵكراوەكان هاوبەشدانەر بون، بەڵكو بڕوادارەكانیش پێویستیان بەوە هەیە بەردەوام بیریان بخرێتەوە و بیری پێویستیەكانیانی بخرێتەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە، كە باسی (لا اله الا الله) لە قورئانی پیرۆز نەبڕاوە، تەنانەت دوای ئەوەی كۆمەڵە موسڵمانەكە پێك هات و لە زەوی دامەزرا دژی بێبڕواكان و جەنگا لەپێناوی (لا الـه الا الله)، خوا لە سورەتی (النساء)دا ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە كە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا: ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە، بڕوابهێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی و ئەو پەیامەی ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی و ئەو پەیامەی لەوەوپێش ناردویەتیە خوارەوە، هەر کەسێکیش لە بڕوا بەخودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی حاشا بکا، لەڕادەبەدەر گومڕایە.﴾النساء:١٣٦.

خوای گەورە لەسورەتە مەدینەییەکاندا ئایەتی زۆری ناردۆتە خوارەوە، کە ڕێنماییە رامیاریی و ئابوریی و کۆمەلایەتیەکان دەبەستێت بە (لا الـه الا الله) و پێویستیەکانیەوە:

﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَـٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ: بڵێ: خوایە! خاوەنی هێز و دەسەلات! هەر کەس بۆ خۆت مەیلت لێ بێ دەستەلاتی پێ دەدەی و کێش تۆ حەز کەی دەستەلاتی لێ دەستێنی؛ هەر کەسێکی وەقەدر خەی و هەرکەسێ زەبون بکەی، خۆت دەیزانی؛ چاکە هەر بەدەستەخۆتە و تۆ لەسەر هەمو شت توانای. شەو دەناو ڕۆژ هەڵدەکێشی، ڕۆژ دەخەیە ناو شەوەوە؛ زیندو لە مردو دەردەخەی، مردو لە زیندو دەردێنی؛ هەرکەسێ خۆت مەیلت لێبێ، بێ هەژمار بژێوی دەدەی. باوەڕداران، با جگە لە باوەڕداران نەگرن بە دۆست.﴾آل عمران:٢٦-٢٨.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ

فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بن. هەر کاتێکیش لەسەر شتێ لەنێو خۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بەخودا و بەڕۆژی قیامەتێ هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خودا بکەن. ئەم کارە بۆتان باشترە و ئاکامی چاکتری هەیە.﴾النساء/٥٩.

نمونەش لەسەر ئەوە زۆرە.

پاشان (لا اله الا الله) وانەیەك نیە بگوترێتەوە و پاشان بچینە سەر وانەیەکی تر، بەڵکو (لا اله الا الله) وانەیەکە دەخوێنرێت و لەگەڵیدا دەچینە سەر وانەیەکی تر و بەردەوام باس و خواسی ئەم نەتەوە مسوڵمانە دەبێت هەتا ڕۆژی دوایی.

* * *

ئەو ڕێگایە کامەیە (لا اله الا الله)ی پێ دەناسرێت؟

ئەو ڕێگایە وەك خوای بەرز دیاریکردووە؛ کارزانی و ئامۆژگاری پەسندە:
﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ: بە کارزانی و ئامۆژگاری پەسند، مەردم بەرەو ڕێگەی پەروەردگارت بانگ بکە و بە چاکترین شێوە لە گەڵیانا بدوێ. پەروەردگارت لەو کەسانەی لە ڕێگەی ئەو لایانداوە لە گشت کەس- ئاگادارترە و هەر خۆیشی باشتر دەزانێ کێیە لەسەر ڕاستەڕێیە.﴾النحل:١٢٥.

پێویستە بزانین کە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك چاودێر نیە بەسەر هەڵەکان و لەڕێ لادانەکانی خەڵکەوە و ختوکەدانی هەستیان بێت بۆ ئەوەی لێمان ڕازی بن یا لێمان وەربگرن!

زاناترین کەس بە مەبەستی پەروەردگاری، پێغەمبەرﷺ بووە، کە ئەو فەرمانەی ڕاستەوخۆ لە پەروەردگاریەوە پێگەیشتووە، جا چۆن پێی هەڵسا؟ ئایا لەگەڵ هاوبەش دانانەکەی خەڵکی گونجا؟ ئایا لەوە دوور دەکەوتەوە ڕاستی

کارەکەیان پێ بڵێت؟ لەکاتێکدا لە پەروەردگاریەوە فەرمانی پێگەیشتبوو ڕاستیەکە ئاشکرا بکات: ﴿فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ: ئەو فەرمانەی پێتدراوە ئاشکرای بکە.﴾الحجر:٩٤.

هاوبەشدانەرەکان شکاتیان لەپێغەمبەرﷺ کرد لای ئەبوتالیبی مامی، وتیان: خەونەکانی تێکداوین و جوێنی داوە بە خواکانمان و باووباپیرانمانی بێبڕوا کردووە!

بەرەنگاربونەوەی عەرەب بە هەموو ئەمانە، ئەوپەڕی کارزانیە، هەروەك پێغەمبەرﷺ پیادەی کرد.

کارزانی و حیکمەت ئەوەبو، کە جەنگ نەکرێ و لەو کاتەدا نەکەونە شەڕی هاوبەشدانەرەکان و دەمارنەگرتنیان، کەوا پاساو بدەنە دوژمن بۆ دەستدرێژی، وێڕای ئاشکراکردنی هەموو ڕاستییەکان بێکەم و کوڕی.

لێرەدا دەگەینە مەسەلەیەکی گرنگی ئێستا، با سەیری شوێنی پێشەنگ لە نەوەی تاقانەدا بکەین؛ ئایا لەم کاتەی ئێستادا بۆمان چاکە بکەوینە جەنگی چەکداریی لەگەڵ خاوەن دەسەڵاتەکان؟

دەستدرێژی لەلایەن ئەو دەسەڵاتەی حوکم بە یاسای خوا ناکات، کارێکە دەبێ هەمیشە چاوەڕوانی بکەین؛ چونکە سوننەتێکە لە سوننەتەکانی خوا و هەرگیز ڕوی نەداوە دەسەڵاتێکی جاهیلی بەبانگەوازی (لا الـه الا الله) رازی بێت، یا تەنانەت جەنگ ڕاگرتن لەگەڵیا، کاتێ داوای جەنگ ڕاگرتنی لێکرابێت.!

کاتێ شوعەیبؑ بە قەومەکەی وت: ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ: ئەگەر هێندێك لەئێوە بڕوای هێناوە بەو شتانەی کە منی پێ ڕاسپێراوە و هێندێکیشتان بڕوایان پێ نەهێناوە، خۆ ڕابگرن هەتا خوا بۆ خۆی لە بەینی ئێمەدا داوەری کا، خۆی چاکترین داوەرە.﴾الأعراف:٨٧.

دەسەڵاتدارانی خۆ بەزلزان جەنگ ڕاگرتن قبوڵ ناکەن، بەڵکو بەردەوام دەبن لەسەر دەرکردنی بڕوادارەکان و زۆر لێکردنیان بۆ وازهێنان لە ئایینەکەیان:

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ﴾
ئەوانەی خۆیان بەزل دادەنا لەناو قەومەکەیدا وتیان: ئەی شوعەیب! تۆ و ئەوانەی بڕوایان هێناوە لەشارەکەمان دەردەکەین، یا دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینەکەمان، ئەویش وتی: ئەگەر حەزیش نەکەین هەر دەمانگێڕنەوە.﴾الأعراف:٨٨.

لە نەفامی‌یەکانی تازەدا بێبڕوا خۆی ناوناوە ((دیموقراتیی)) ڕێ بە هەموو کۆمەڵ و پێڕ و دەستەیەك دەدات کاریکەن و ئازادن، جگە لەو کۆمەڵەی بانگەوازی (لا اله الا الله) دەکات! ئەوەی لە جەزائیردا ڕوویدا بەسە بۆ نمونەی ئەوەی دەیلێین، موسڵمانەکان بەشێوەیەك پابەند بوون -بەچاوپۆشین لە هەڵە و ڕاستی ئەو کارە- بە بنەماکانی نەفامی و پرۆگرامەکانیانەوە، تا گەیشتە بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان لەڕێگای سندوقەکانی هەڵبژاردنەوە وەك نەفامێتی کردبویە مەرج، پاشان ئەو نەفامێتی‌یە ئینکاری ڕێبیر(مبدأ)ەکەی خۆی کرد، کە ڕێی دابوو بەهەموو کۆمەڵەکان و هەموو بانگەوازەکان، کەچی بە تەنها بەرامبەر موسڵمانەکان وەستان و پێیان وتن یا دەرتان دەکەین... یا دەگەڕێنەوە. !

بوار نیە کەسێك بپرسێت: ئایا وەسیلەیەکی تر نەبوو لەوێدا بانگەوازەکە بەکاری بهێنێت تورەیی دەسەڵاتدارە نەفامەکە نەوروژێنێ؟ کارەکە تازە کۆتایی هاتووە! ئەو پرسیارەی ئێمەش کردمان: ئایا بۆ ئێمە چاك نیە جەنگی چەکداری بکەین لەم کاتەدا لەگەڵ خاوەن دەسەڵاتەکان؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەگەڕێینەوە سەر ئەو وانەیەی کەڵکمان لێوەرگرتووە لە مێژووی دروستبوونەکەی یەکەمدا، کە لە بەشەکەی ڕابوردوودا باسمان کرد، جا لە سەرەتاوە دەپرسین: چ کاتێك خوا ڕێی دا بە موسڵمانەکان بەرەنگاری دەستدرێژیەکان ببنەوە بە ئایەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ ئەوانەی جەنگیان دژ دەکرا ڕێیان پێدرا

بجەنگن دژی دوژمنەکانیان، چونکە ئەمان بەڕاستی ستەمیان لێکراوە، خوا بۆ سەرخستنیان بەتوانایە.﴾الحج:٣٩.

ئەو ڕێپێدانە کاتێ هات، کە ئەمانەی خوارەوە بەجێ گەیەنران:- یەکلاکردنەوەی کێشەی لا الـه الاّ الله.. یەکلاکردنەوەی کێشەی شەرعیەت.. دروستکردنی بنکە(قاعدة) لەسەر بنەمایەکی پتەو.. فراوانکردنی بنکەکە بە هاتنی پشتیوانان(الأنصار).. پەروەردەکردنی بنکە لەسەر یەکلابونەوە بۆ خوا..

ئێستا با سەیر بکەین، لە کاروانی ئێستادا کام لەم کارانە بەجێ هاتوە، چەندیشی لێ بەجێ نەهاتووە؟

ئایا بە تەواوەتی کێشەی (لا الـه الا الله) یەکلابۆتەوە، ناڵێین لای جەماوەر، بەڵکو لای بانگخوازەکان خۆیان؟

ئایا لای بانگخوازەکان ڕوون بۆتەوە، کە یاسادانان بەوانەی خوا نەیناردونە خوارەوە؛ هاوبەش دانانێکە مرۆڤ لە ئیمان دەردەکات، هەروەها ڕازیبون بەو یاسادانانە هەر هاوبەش دانانێکە مرۆڤ لە ئیمان دەردەکات؟ یان هێشتا لەسەر ئەم کێشەیە مشتومڕ لەنێوانیاندا بەردەوامە، لەنێوان گومان هەبون و قەناعەت بون دایە؟

کێشەی حوکم دان بەسەر خەڵکدا لێگەڕێ، ئەوە کێشەیەکە لێرەدا خۆمانی لێنادەین، هەردەم داوا دەکەین ئەم کێشەیە لە گرنگی بانگەوازەکە بۆ ڕونکردنەوەی حەقیقەتی (لا اله الا الله) سەرقاڵمان نەکات. لە ڕاستیدا ئەو دوانە کێشەیەکی لەیەك جیان -یا پێویستە لەیەك جیابن-.

یەکێکیان کێشەی فێرکاری(تعليمي)یە، کێشەی ڕونکردنەوەی ڕاستیەکان بۆ خەڵك، ئەو ڕاستیانەی لای بەشی زۆری خەڵك نادیارە بەهۆی نامۆییەکەی دووەمی ئیسلام، ئەویش سپاردەیەکی خواییە، دەبێ بەجێبگەیەنرێت و نەشاردرێتەوە، با خەڵکیش لێی دووربکەونەوە، کە لەسەر شێوە ڕاستەکەی پیشان بدرێت..

دووەمیان کێشەی جێبەجێکردنە، جێبەجێکردنیش دەبێ یەکەمجار بیانو دروست کردن لەسەر خەڵك پێشی بکەوێت، بەڕونکردنەوەی زۆر بێ ئەوەی تێکەڵی هیچ کێشەیەکی تر ببێت و لێڵی بکات، ئەو کێشەیە ئەوەندە تاریك کراوە خەڵکی لەڕاستیەکەی دورکەوتونەوە.

دەگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکە: ئایا کێشەی یاسادانان، کە خوا نەینارد‌ۆتە خوارەوە لای بانگخوازان خۆیان ڕون بۆتەوە –ئێستا واز لە جەماوەر بهێنە–، یان هێشتا قسەکەی ئیبن عەباسیان لێ تێکەڵ بوە، کە وتویەتی: ((کفر دون کفر، کفر لا يخرج من الملّة)) بێبڕوایی لەخوار بێبڕواییەوەیە، بێبڕواییەکە، کە لە ئیسلام دەرناچێت؟!

ئەوەی کە ئیبن عەباس وتویەتی﵁ (کفر دون کفر: بێبڕواییەکە لەخوار بێبڕواییەوەیە)، ئەوە یاسادانان نیە، کە خوا نەینارد‌ۆتە خوارەوە، بەڵکو حوکم کردنە لەکێشەیەکی دیاریکراودا بەوەی خوا نەینارد‌ۆتە خوارەوە، بەنەزانی یا بە تەئویل، یا بە ئارەزو، یا بەرامبەر بەرتیل، یا ئارەزویەك، بێئەوەی ئەو حوکمە بکرێت بە یاسایەکی پێچەوانەی حوکمی خوا.

ئەو قازیەی کەسێکی بۆ دەهێنرێت، کە دەرکەوتوە ئارەقی خواردۆتەوە و بۆنی عارەقەکە لە دەمی دێت، جا ئەو قازیە حەدی بەسەردا نادات لەبەر ئەوەی لەکەس و کاری پیاوەکەوە بەرتیلی پێگەیشتووە، خۆی لە حوکمی خوا بە حوججەیەك لە حوججەکان لاداوە؛ ئەوە قازیەکی فاسقە، بەڵام بە فاسقیەکەی کافر نابێت، بەلام ئەو ڕۆژەی بڵێت: عارەق خواردنەوە تاوان نیە، یا تاوانە و حەدی لەسەر نیە، بەڵکو سزایەکی تری لەسەرە، ئەو قازیە بەوە کافر دەبێت، کافرییەك لە ئیسلام دەری دەکات، چونکە لە کێشەیەکدا حوکمێکی دروست کردوە پێچەوانەی حوکمی خوایە، ئەوەش بە کۆڕای هەموو شەرعزانەکانە.

کاتێ تەتارەکان حوکمیان بە (یاسق) دەکرد –وەك فەرموودە ڕەوان (ئیبن کەثیر) وتویەتی: یاسق کۆمەڵێك یاسایە، هەندێکیان لە قورئان وەرگیرابوو، هەندێکیان لە ئینجیل و هەندێکیان تەورات و هەندێکیان لە جەنگیزخان خۆی داینابوو، (ئیبن کەثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتە ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾المائدة: ٥٠. وتویەتی: خوای گەورە ئینکاری لەو کەسانە دەکات، کە لە حوکمی خوا دەردەچن، ئەو حوکمەی هەموو خێری تێدایە و قەدەغەی هەموو شەڕی تێدایە و ڕاستترە لە هەموو ئەوانەی بە ڕای ئەو پیتۆڵانەی خەڵك بەبێ پاڵپشت لە شەریعەتی خوا دایاناوە،

وەك ئەهلی جاهیلی لە گومڕایی و نەزانی حوكمیان پێدەكرد، ئەو حوكمانەی بە هەواو ئارەزوو ڕای خۆیان دایاننابوو، هەروەك تەتارەكان بە سیاسەتی پاشایەتی حوكمیان دەكرد، كە لە جەنگیزخان وەرگیرابو، كە یاسقی بۆ دانابون، یاسقیش بریتی بوو لە كتێبێك كە كۆمەڵێك حوكمی تێدابوو، لە چەندەها شەریعەت وەری گرتبوو لە جولەكە و دیان و ئیسلام و جگە لەوانیش، زۆر یاسای تێدابوو بە هەواو ئارەزوی خۆی وەریگرتبوو، تا وای لێهات بە یاسایەكی دانراو مایەوە بۆ نەوەكانی، ئەوانیش دەیانخستە پێش حوكم كردن بە كتێبەكەی خوا و سوننەتەكانی پێغەمبەرﷺ، جا كام لەوان ئەو كارەی كردبێت ئەوە كافرە، پێویستە جەنگی لەدژدا بكرێت، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ حوكمی خوا و پێغەمبەرەكەی، هەروا حوكم بە غەیری ئەوانە نەكات نە لە كەم و نە لە زۆردا.[1]

ئیبن كەثیر بەر ڕەحمەتی خوا بكەوێت، بەڕاستی و بێگومان قسەكەی ئیبن عەباسی بەباش دەزانی، لێی تێكەڵ نەبوبو، چونكە بەزانستیەكەی و بە فیقهەكەی دەیزانی، دەیزانی جیاوازی نێوان حوكم كردن بەوەی خوا نەیناردۆتە خوارەوە لە كێشەیەك لە كێشەكاندا و، یاسادانان بەوەی خوا نەیناردوۆتە خوارەوە چیە.

شێخ موحەممەدی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی عبداللطیف ئالی شێخ،[2] كە شایەتی بۆ دراوە بە زانستی زۆر و بەهێز لە حەقدا، لە (رسالة تحكيم القوانين الوضعية)دا لەسەر ئەو كێشەیە دواوە، پاش ئەوەی قسەكەی ئیبن كەثیری هێناوە، وتویەتی:

((سەیركە چۆن خوای پاك و بەرز كوفر و ستەم و فیسقی لەسەر ئەوانە تۆمار كردوە، كە حوكم دەكەن بەوەی خوا نەیناردۆتە خوارەوە، ناگونجێت خوای پاك و بەرز بەو حاكمە بڵێت كافر، كە حوكم بە یاسا و كتێبی خوا ناكات و، كافر نەبێت، بەڵكو ئەوە كافری موتڵەقە، یا كوفری كردەوەیی یا كوفری بیروبڕوایە. ئەوەی لە ئیبن عەباسەوە هاتووە دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە كە تاوس ریوایەتی

١ سەیری تەفسیری (ئیبن كەثیر) ب٢ ل٦٨ بكە.

٢ موفتی پێشووی عەرەبی سعودی بووە و لە گەورەزانایان بزوە.

کردووە، هەروەها گەلێکی تر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حوکم کردن بەوەی خوا نەیناردۆتە خوارەوە کافربوونە، یا کافربونی بیروبڕوایە، کە مرۆڤ لە ئیسلام دەردەکات، یا کافربونی کردەوەیە، کە مرۆڤی پێ لەئیسلام دەرناچێت؛ بەلام یەکەمیان کە کوفری بیروبڕوایە چەند جۆرێکە:

یەکەمیان: ئەوەیە ئەو کەسەی حوکم بە یاسا و کتێبی خوا ناکات، بڕوای بە ڕاستیەتی حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی نەبێت، ئەوەش دەقاودەق مانای گێڕانەوەکەی ئیبن عەباسە، چونکە ئەوە ئینکاری کردنە لەو یاسا شەرعیانەی خوا ناردونیە خوارەوە، ئەمەش لەنێوان زانایاندا کێشەیان لەسەر نیە، بنەما بڕیاردراوەکانی نێوانیان بەکۆڕا ئەوەیە، کە هەرکەس ئینکاری لە بنەمایەك لە بنەماکانی ئاین بکات، یا لقێکی، یا ئینکاری پیتێك لەو پیتانە بکات، کە پێغەمبەری خوا پێی هاتووە، ئەو کەسە کافرە بەجۆرێك، کە لەئیسلام دەردەچێت.

دووەمیان: ئەوەیە حاکم ئینکاری نەکات لەوەی حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی لەپێشترن حوکمیان پێبکرێت، بەلام بڕوای وابێت، کە حوکمی غەیری پێغەمبەرﷺ چاکترە لە حوکمی پێغەمبەرﷺ و تەواوترە و گشتگیرترە بۆ ئەوانەی خەڵك پێویستیان پێی هەیە لەکاتی ناکۆکیاندا، یا بە ڕەهایی، یا سەبارەت بەو ڕوداوە تازانەی لە ئەنجامی پێشکەوتنی سەردەم و گۆڕانی بارەکان دروست دەبێت، هەروەها ئەوەش بێگومان کافر بووە، چونکە فەزڵی یاسای زادەی بیری کورت بینی مرۆڤی بەسەر حوکمی خوای کاربەجێ و گەورەدا داوە.

حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی خۆی لەخۆیدا بە جیاوازی سەردەمەکان و گۆڕانی بارەکان و ڕوداوە تازەکان گۆڕانی بەسەردا نایێت، چونکە کێشەیەك نیە لە کێشەکان لە هەرکوێ بن حوکمەکەیان لەناو قورئانەکەی خوای بەرز و سوننەتەکانی پێغەمبەردا نەبێت، جا بە دەقی ڕوون بێت، یا هەڵێنجان بێت لێی، یا بێجگە لەوانە بێت...

سێیەمیان: حاکم بڕوای وانەبێت کە یاسای دەسکرد لە یاسای خوا و پێغەمبەرەکەی چاکترە، بەلام بڕوای وابێت وەك ئەو وایە، ئەوەش وەك دوانەکەی پێشی‌یەتی، کە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەردەچێت، لەبەر ئەوەی ئەو قسەیە

خوای بەدیهێنەر و خەڵك یەكسان دەكات و پێچەوانە و نكوڵی كردنی فەرموودەی خوای بەرزە، كە فەرمویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ: هیچ شتێك لەو ناچێت.﴾، پێچەوانەی ئەو ئایەتانەی تره، كە بەڵگەن لەسەر ئەوەی تەنها خوا سیفەتی تەواومەندێتی(كمال)ی هەیە و دورە دروستكراوەكانی وەك ئەوبن لە زات و سیفەتەكان و كردەوەكانیدا و لە حوكمی نێوان خەڵك كردن لە كاتی گێرەوكێشەیاندا.

چوارەم: بڕوای وا نەبێت، كە یاسای دەسكرد وەك حوكمی خوا و پێغەمبەرەكەیەتی، لەگەڵ ئەوەی بە چاكتری دەزانێ، بەڵام بڕوای وابێت دروستە حوكم بەوانە بكرێت، كە پێچەوانەی حوكمی خوا و نێرراوەكەیەتی. ئەمەش وەك ئەوەی پێشوە، حوكمی ئەو چۆن بێت حوكمی ئەویش وایە، لەبەر ئەوەی بڕوای وایە دروستە حوكم بكرێ بەوەی پێچەوانەی حوكمی خوا و پێغەمبەرەكەیەتی، جا بە دەقە ڕاستە ڕوونەكان كە ئەوە حەرامێتی ئەوەیان براندۆتەوە.

پێنجەم: گەورەترین و شمولیترین و ڕونترینیانە بۆ عینادی كردنی شەرع و خۆ بە گەورەدانانە بەسەر یاساكانی و دژی خوا و پێغەمبەرەكەیەتی، لە ڕوی ئامادەكردن و كۆمەكی و ڕوانگە و لق و تەشكیل و جۆر و حوكم و سەپاندن و سەرچاوە و بەڵگەنامەكانەوە لێكچوی دادگای شەرعیە، وەك چۆن دادگا شەرعیەكان سەرچاوەو بەڵگەنامەیان هەیە، كە سەرچاوەكانیان هەموو دەگەڕێتەوە بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەكەیﷺ، ئاواش ئەم دادگایانە سەرچاوەی تریان هەیە، كە یاسایەكە دەرهاتووە لە دەستووری جۆراوجۆر وە لە یاسای زۆرەوە وەك یاساكانی فەڕەنسا و ئەمەریكا و بەریتانیا و جگە لەوانەش لەو یاسا و بۆچونانەی هەندێ بیدعەچی دایناون بەناوی شەریعەتی ئیسلامەوە.

شەشەم: ئەوانەی بەشی زۆری سەرەك هۆز و عەشیرەتەكان لە بیابانەكان و هاوشێوەكانیان، كە حوكم بە وتەی پێشینان(سوالف) دەكەن، كە بریتییە لە بەسەرهاتی باووباپیرانیان و عادەتەكانیان.

بەڵام بەشی دووەم لە هەردو بەشەكەی كافر بوونی ئەوەی حوكم بەیاسای خوا ناكات ئەوەیە، كە مرۆڤی پێ لەئیسلام دەرناچێت، لەپێشەوە باسی تەفسیرەكەی

(ئیبن عـەباس)مـان کـرد کـە دەربـارەی ئایـەتی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ: هەرکـەس بـەوەی خـوا ناردویەتیـە خـوارەوە حوکـم نەکات، لە بێبڕواکانە.﴾المـــائدة: ٤٤. وتویـەتی: ئـەوە ئـەو بەشـەش دەگرێتـەوە، بـەپێی قسـەکەی دەربـارەی ئایەتەکـە وتویـەتی (کفـر دون کفــر) کوفــر لــەخوار کوفرەوەیە، هەروەها وتویەتی: ئەو کوفـرە نیـە کـە ئێـوە بـۆی چـون.-تـەواو-، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئارەزووەکەی پاڵی پێوەناوە، کە لە کێشـەیەکدا بـە یاسـای خوا حوکم نەکات، بەڵام بڕوای وایـە کـە حوکمـی خـوا و پێغەمبەرەکـەی حەقـە و ڕاستە، دان بەوەدا دەنێ خۆی هەڵە و گوناهی کردووە و ڕێی ڕاستی وەلا ناوە.

ئەمـە و ئەگـەر کوفرەکـەی لەئیســلام دەری نــەکات، تاوانەکــەی لــە تاوانــە گەورەکان زلترە، وەك زینا و عارەق خواردن و دزی و سوێندی بەدرۆ و شــتی تـر، جا ئەو تاوانەی خوا لە قورئانەکەیدا ناوی ناوە کوفر، گەورەترە لەو تاوانەی ناوی نەناوە کوفر. داوا لەخوا دەکەین موسڵمانەکان لەسەر حوکم کردن بە قورئانەکەی بە ملکەچی و ڕەزامەندیەوە کۆبکاتەوە، چونکـە ئـەوە بەدەست خوایـە و توانـای بەسەردا هەیە.

*    *    *

جا ئایا کێشەکە لای خودی بانگخوازەکان ڕون بۆتەوە، یان هێشتا هــەندێکیان کارەکانی لێ تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت، جارێك بەقسەکەی ئیبن عـەباسﷺ و جـارێك بە کاریگەری بیرۆکەی ئیرجائی، ئەو بیرۆکەیەی ئیمان و کردەوە لەیــەك دەبڕێـت، هەتا ئەگەر کردەوەکەش بە ئاشــکرا پێچەوانـەی (لا الـه الا الله) بێـت، وەك حوکم کردن بەو یاسایانەی خوا نەیناردۆتە خوارەوە.؟

جا ئەگەر کارەکە بەردەوام لای هەندێ لە بانگخوازەکان تێکەڵ و پێکەڵ بێت، ئەدی چی لەجەماوەر چاوەڕێ دەکرێ؟

ئای چەند هەوڵ و تێکۆشان هێشتا لەبەردەمماندایە، بـۆ ئـەوەی ئـەو کێشـەیە بەبێ تەم ومژ لە هەستی خــەڵکدا ڕوون ببێتــەوە، کـە بەشـێوەیەك بتوانن ڕاسـتی خوایی بەدی بکەن، بێ ئەوەی خۆیان لە ڕاستی بەدور خەن؟!.

ئەمـە سـەبارەت بـە کێشـەی فـەرمانڕەوایی(حاکمیـەت)، کـە هـەر تەنـها ئــەو

پێویستی بە ڕۆشن بونەوە نیە لەناو کێشەی (لا اله الا الله)دا.. جا یەکلاکردنەوەی کێشەکە پێویست دەکات لەو کێشە نیشتمانیە و نەتەوەییە و کۆمەڵایەتیانەی تێی ئالاوە رزگار بکرێت، ئەو کێشانەی هاتونە ناو کاروانی بانگەوازەکە.

بەڕاستی لەبەردەم پێغەمبەرداﷺ کێشەی زۆر هەبوو دەیتوانی بیانوروژێنێ بۆ زۆرکردنی (جەماوەر).

فارسەکان بەشێکی دورگەی عەرەبیان داگیرکردبوو، ڕۆمەکانیش بەشەکەی تریان داگیر کردبو، خۆ پێغەمبەرﷺ دەیتوانی دەمارگیری نەتەوەیی عەرەب بوروژێنێ بۆ ئەوەی جەماوەر لە دەورەی کۆبێتەوە، هەتا ئەوکاتەی کۆدەبونەوە و بەسەرۆکایەتی ئەو بڕوایان دەهێنا، ئینجا پێی دەوتن: بڵێن لا اله الا الله.

هەروەها کێشەی کۆمەڵایەتیش هەبوو، دەوڵەمەندەکانیان گەیشتبونە ئەوپەڕی دەوڵەمەندی و هەژارەکانیان گەیشتبونە ئەوپەڕی هەژاری و برسێتی، کەس بیری نەدەکردەوە لە سنوردانان بۆ دەوڵەمەندی دەوڵەمەندەکان بە لابردنی سوو(ریبا) -بەلایەنی کەمەوە-، هەروا وەرگرتنی بەشێك لەو زیادەیەی لای دەوڵەمەندەکان هەبوو و دابەشکردنی بەسەر هەژاراندا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویان، خۆ پێغەمبەرﷺ دەیتوانی ئەو کێشەیە بوروژێنێ و کۆمەڵە هەژارەکە چواردەورەی بدەن و لێی کۆببنەوە و هێزێکیان لێ دروست بکات، کە بەرامبەر توندوتیژی قورەیش بیانوەستێنێ و لەکاتی گەرم بوونی جەنگدا پێیان بڵێ: بڵێن لا الە الا الله.

جگە لەم کێشانەش بابەتی تری بەکەڵك هەبوون بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر و وروژاندنی حەماسەتیان، پاشان ڕاکێشانیان بەلای بانگەوازەکەدا لەنێوان ئەو کێشانەوە ئەو کێشانەی بە سروشتی خۆیان زۆر کەس حەزی لێدەکەن و بەئاسانی بەدەوری ئەوەدا کۆدەبنەوە، کە جارێ بۆ لێدەدات و خۆشەویستی و حەماسەتیانی دەدەنێ.

بەڵام پێغەمبەری خواﷺ -بەڕێنمایی پەروەردگار- لە ماوەی پەروەردەی مەککەدا هیچ کێشەیەك لەو کێشانەی نەوروژاند، بەڵکو یەك کێشەی وروژاند، ئەو کێشەیەی بوە مایەی ئەوەی پیاوەگەورەکان و جەماوەری دەوریان دژایەتی بکەن، ئەویش هەر سور بو لەسەر ئەو کێشەیە و پێداگیری دەکرد، هەتا خوا ڕێی

دا باشترین دڵی بۆ بکرێتەوە دوای نێرراوەکانی خوا -سەلامی خوایان لێبێ-.

ئەوەش بۆ ئەوە نەبوو، کە ئەو کێشانە لە ژیانی نەتەوەکەدا هیچیان گرنگیان نەبووە، نەخێر لەبەر ئەوە نەبووە! چونکە بەڕاستی بزوتنەوەی ئیسلامیی دوابەدوای یەك ئەو کێشانەشیان گرتۆتە خۆ، بەڵام لەبەر ئەوە بووە، کە کێشە گەورەکە لە پەیڕەوی پەروەردگار و واقیعی بەشەردا- کێشەی (لا اله الا الله)یە، ئەو کێشەیەی بەرنامەی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر وەستاوە لە دونیادا و لە ڕۆژی دواییدا، لەبەر ئەوەی کێشەکانی ژیان هەموو لە بەرنامەی ڕەبانیدا- پێویستە لە (لا اله الا الله) هەڵقوڵابێت و بە توندی پێوەی پەیوەست بووبێت، کە ڕاستی و پاکی و خۆ یەکلاکردنەوەی بۆ زۆر بکات. لەپاش ئەوە پەیڕەو و بەرنامەی خوایی بەرەو یەکلاکردنەوەی کێشەی (لا اله الا الله) ڕۆیشتووە و داماڵینی لەوەی کە لە قۆناغی دروست بووندا لێڵی بکات، بۆ ئەوەی پەرستن بەپاکی بۆ خوا بێت، کە ئامانجەکەی تەنها ڕازیبوونی خوا بێت، هەتا ئەگەر بە پاکی چوە دڵی خاوەنەکانیەوە، گشت ئەو کێشانەی پێوە پەیوەست دەکرێت کە بە ژیانی ئوممەتەوە بەندە، بێ ئەوەی ترسی ئەوە هەبێت لەم دڵانەش تێکەڵ و پێکەڵ بێت، بەڵام ترسەکە لەقۆناخی دروستبووندایە، کاتێ لێتێکچوون لە دروستبووندا ڕوودەدات، جا خێرا بەرژەوەندیەکان زاڵ دەبن و شوێن پێی شەیتان دەکرێتەوە.

ئایا کێشەی (لا اله الا الله) لە دڵی بانگخوازاندا تۆ ئێستا وازبێنە لە دڵی جەماوەر- بۆ بڕیاردانی بەندایەتی پاك بۆ خوا یەکلابۆتەوە، کە بەشێوەیەك کێشەکانی نەتەوەیی و نیشتمانی و دادگەری کۆمەڵایەتی تێکەڵ نەبێت، بانگخوازانیش -لەپێناوی ڕاکێشانی جەماوەردا- باسی (سۆشیالیستی ئیسلام) و (دیموکراتی ئیسلام) و فرەلایەنی لە ئیسلامدا) دەکەن.

* * *

ئایا بە تەواوەتی کێشەی شەرعیەت یەکلابۆتەوە، ناڵێین لای جەماوەر، بەڵکو لای خودی بانگخوازەکان؟

تێگەیشتنمان بۆ شەرعیەت چیە؟

لە نامۆییەکەی دووەم بۆ ئیسلام بەتایبەتی دوای لابردنی شەریعەتی ئیسلام لە حوکم لە بەشی زۆری وڵاتانی ئیسلامیدا- پێوانەکانی ئیسلامیمان

لەبیرچوەتەوە، گۆڕیومانن بە پێوانەکانی ڕۆژئاوا، بە تایبەتی لە بواری (سیاسەتی شەرعی)دا.

ڕۆژئاوا دەڵێ: پێوانەکانی شەرعیەت بریتیە لە سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکاندا.. جا هەرکەسێ دەنگی زۆری بەدەست هێنا، ئەوە خاوەنی شەرعیەتە و شایستەیە حوکم بگرێتە دەست.

بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ ئەو گۆڕانە توندە لێگەڕێ، کە توشی ئەو پێوانەیە هات، کاتێ ئیسلامی‌یەکانی جەزائیر گەورەترین دەنگیان بەدەست هێنا! بەڕاستی ڕۆژئاوای (گەورە) ڕای‌هێناوین، لە هەر کێشەیەکدا کە مسوڵمانان تێیدا لایەنێکن، بە دوو پێوانە پێوانە بکات، ئەوەش لەبەر ئەوەیە، کە زۆر بڕوایان بە بەها(قیەم) و ڕێبیر(مبادیء) و ریز گرتنی لایەنی تر و ڕێزی مافەکانی مرۆڤ هەیە.!!

تۆ لە هەڵوێستەکانی ڕۆژئاوا گەڕێ، وەرە لە ئیسلامیەکان بپرسین: ئایا لەم کێشەیەدا ئەمە پێوەری ئیسلامیە؟ وا دانێ کەسێك یا پارتێك یا کۆمەڵێك یا با لەشێوە رامیاریەکان نەبێت- لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگە هەرە زۆرەکان بەدەست بهێنێت، بەشێوەیەك لەسەداسەدی دەنگەکان بەدەست بهێنێت، پاشان بە یاسای خوا کار نەکات، ئایا لە ئایینی خوادا شەرعیەتی هەیە؟!

بەڕاستی دوو شتی جیاوازمان لەئامۆیی دووەمی ئیسلامدا- لێتێکەڵ بووە: چۆنیەتی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا(حاکم) و جۆری ئەو حوکمەی حوکمی خەڵکی پێدەکرێت..

کاتێ ئیسلام لەسەر زەوی ئیسلامیدا دەسەڵاتدار بوو، شەرعناسەکانی سیاسەتی شەرعیەت باسی مەرجە پێویستەکانیان دەکرد، کە دەبێ لە حاکم و دەسەڵاتداردا هەبن، باسی بەیعەتی ئازادیان دەکرد، باسی ڕاوێژ(شوری)یان دەکرد، هەروەها ئەو کارانەش کە پەیوەستن بە سیاسەتی حوکمەوە، باسی (فقە الضرورة)یان دەکرد، هەروا باسی ئەوانەیان دەکرد کە دەتوانرێ لەژێر فشاری پێویست(ضرورة)دا واز لە مەرجەکان بهێنرێت، جا دەیانگوت: ((سەرکەوتو بۆی هەیە گوێڕایەڵی و ملکەچی بکرێ)).. بەڵام هەرگیز بەبیریاندا نەهاتووە حاکمێك بێت حوکم بە یاسای خوا نەکات، پاش ئەوەش ببێتە فەرمانڕەوای شەرعی بەسەر موسڵمانانەوە!!

بەڕاستی مەرجی بنەڕەتی بۆ شەرعیەتی حوکم لە ئیسلامدا ئەوەیە، ئەو یاسایەی هەیە یاسای خوایی بێت، پێشتر گوتەکەی ئیبن کەثیرمان باسکرد، کە دەربارەی ئەو حاکمە کردبووی کە حوکم بە یاسای خوا ناکات، بەڵکو بە شەرعێك حوکم دەکات، کە پێچەوانەی شەریعەتە.

ئایا ئەم کێشەیە لە بیر و زەینی خودی بانگخوازان بە جەماوەریشەوە یەکلابۆتەوە.. یان قسەکانمان گشتی لەسەر هەڵبژاردن دەڕوات، ئایا ئەو هەڵبژاردنە ئازادە یا سەختەیە؟ ئایا لە پەرلەماندا چەند دەنگمان بەدەست هێنا؟ بۆ زیادکردنی دەنگەکان چەند هەوڵی ترمان دەوێت؟!

ئەگەر گومانمان وابێ کاتێ بەشی زۆری دەنگەکانمان لە پەرلەماندا بەدەست هێنا، بوارمان بۆ دەرەخسێ بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی خوا، ئەوە ئەوپەڕی سادە و ساویلکەییە، ئەو بارودۆخەی لە جەزائیر دروست بووە بەسە بۆ بەڵگەی ئەوە.

بەلام هەڵبژاردنی ئەو ڕێگەیەمان وەك مەبدەئێك- لەپێناوی گەیشتن بە حوکم پاشان هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی خوا لەو ڕێگایەوە، پێچەوانەی شەریعەتە؛ چونکە خەڵکەکە دەکرێن بە سەرچاوە بۆ هەڵبژاردنی جۆری ئەو حوکمەی حوکمیانی پێدەکرێت، (لێرەدا باسی هەڵبژاردنی حاکم ناکەین) ئەگەر ئیسلامیان هەڵبژارد ئیسلام حوکم دەکات، ئەگەر جگە لەویان هەڵبژارد جگە لەو حوکم دەکات! ئایا ئا ئەوە ئیسلامە؟!

ئێمە لەکوێی فەرمودەی خوای بەرزداین، کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ: بۆ هیچ بڕوادارێکی ژن و پیاو نیە کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی حوکمێکیان دا، ئەوان بە ئارەزووی خۆیان کاربکەن لەو حوکمەدا.﴾الأحزاب:٣٦.

بەڕاستی سەرچاوەی سەپاندنی حوکمکردن بەشەریعەتی خوا، بە پەسەند و ناپەسەندی خەڵك نیە، ئەگەر موسڵمان بن.. جا کە موسڵمانن، هەردەبێ حوکم بە شەریعەتی خوا بکەن، ئەگینا بڕوادار نین ئەگەر پشت بکەنە شەریعەتی خوا و ڕوو بکەنە یاساکانی تر، با نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و بڵێن ئێمە موسڵمانین!

﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ: دەڵێن بڕوامان بەخوا و بەپێغەمبەر هێنا و ملکەچی فەرمانەکانیانین، پاش ئەوە کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن، ئەوانە هەر بڕوادار نین، ئەگەر بانگ بکرێت بۆ ئەوەی خوا و پێغەمبەر حاکم بێت لەنێوانیاندا، کەچی کۆمەڵێك لەوان پشت هەڵدەکەن.﴾النور:٤٧-٤٨.

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا: نا سوێند بەخوا بڕوادار نابن، هەتا تۆ نەکەنە داوەر لە کێشەکانیان، پاشان هەرچی حوکمێکت دا ئەوان هەست بەگرێ نەکەن لە دەروونیاندا و خۆیان تەسلیم دەکەن بە تەواوەتی.﴾النساء:٦٥.

بەڕاستی ناتوانرێت لە جیهانی واقیعدا ئیسلام حوکم بکات، گەر بڕوادار بونیان نەبێت، کە سور بن لەسەر حوکم کردن بە یاسای خوا و یاساکانی تر وەلا بنێن، دڵنیاش بن کە ڕازیبون بە یاسای جگە لە یاسای خوا کوفرە و دەرچوونە لە ئیسلام.. بەڕاستی ئەو جۆرە بڕوادارانە ئێستا لە کۆمەڵگەدا کەمن، نەفامیی هێزیان لێدەگرن و دەچن بە گژیانا.. ئەمە ڕاستیە، بەڵام وا پێویست دەکات ئێمە بەردەوام بانگەواز بکەین و بەردەوام ئەو ڕاستییە بۆ خەڵك ڕون بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە، کە هەرکەس ڕازی بێت بە یاسایەك جگە لە یاسای خوا، بێئیمانە، هەر بەردەوام خەڵك لەسەر پێویستیەکانی ئەو ڕاستیە پەروەردە بکەین، هەتا بنکە(قاعدە) بڕوادارەکە بەهێز بێت بەشێوەیەك کاروبارەکان بکەونە دەستی، لەم کاتەدا ئا ئەوە ئەرکی بانگەوازە هەرچەندە بەجێهێنانی کارەکە درێژە بکێشێ، ئەرکی بنکە ئەوە نیە لەڕێگای سندوقی هەڵبژاردنەکانەوە دەنگی خەڵك وەربگرێت، کە ئایا دەیانەوێ موسڵمان بن یا نایانەوێت!

جا ئایا ئەم کێشەیە لە هەستی خودی بانگخوازاندا بە جەماوەریشەوە ڕون بۆتەوە، بەبێ ئاگایی خزاونەتە ناو پێوانەکانی دیموکراتی کە جەماوەر وا دەکات-

لەڕواڵەتدا بەلای کەمەوە–[1] ئەوان دانەری جۆری حوکمەکانن نەك ئەو خوایەی دروستکردن و فەرمانی بەدەستە؛ ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ: هەرچی دروست کردن و بڕیاردانە بۆ خوایە﴾الأعراف: ٥٤. ئەوە دووڕیانی سەرەکی نێوان نەفامیی و ئیسلامە!

*　　　*　　　*

ئایا بنیاتی بنکەکە لەسەر بنەمایەکی پتەو داڕێژراوە؟

لەسەرەتاوە دەڵێین: ئەوە ئەگەر هێشتا کێشەی (لا الە الا الله) و، کێشەی شەرعیەت بە لایەنی کەمەوە لە هەستی هەندێ لە بانگخوازەکاندا ڕون نەبێت، ئەی چۆن بنکەکە لەسەر نیشانکار(مواصفات)ە پێویستەکان دامەزراوە؟

بەڕاستی بنکە(قاعدە)ی پێویست لە بنەماوە لە ئەوەی بانگخواز پێکدێت، ئەوانەی بەشێوەیەکی فراوان بۆ بانگەوازیی ئامادە دەکرێن، لە سەر دوو بناغەی گەورە دادەمەزرێ: تێگەیشتنێکی هۆشیارانە لە حەقیقەتی ئیسلام، پەروەردەیەکی قوڵ لەسەر پێویستیەکان و ئەرکەکانی ئەم ئایینە.

ئێمە بینیمان تێگەیشتنی هۆشیارانە بۆ حەقیقەتی ئیسلام هێشتا تووشی کەموکوڕی بووە لە دوو کێشەی سەرەکی کێشەکانی ئیسلامدا، ئەوانیش کێشەی (لا اله الا الله) و کێشەی شەرعیەتە، لەگەڵ چەندەها کێشەی تر کە لەدواییدا باسی دەکەین بەستراوە بە پەیڕەو(مەنهج)ی بزوتنەوەکەوە، بەلام پەروەردەکردنەکەی ترسناك ترە و کەموکوڕی لەبوارەکانیدا زۆرترە.

ئەگەر گەڕاینەوە بۆ دروست بوونەکەی یەکەم، بەڕاستی غەمی گەورەی پێغەمبەرﷺ لە قۆناغی مەککەدا، پەروەردەکردنی بنکە(قاعدە)کە بووە لەسەر بنەمایەك لەوپەڕی پتەوی وڕەگداکوتاو و، سەرکەوتوو لە هەموو بوارەکانی: ئیمانی و ڕەوشتیی و تێڕوانین و ڕەفتاریی و عەمەلیدا.

ڕەنگە نەوەیەك وەك نەوەی صەحابە‌ دووبارە نەبێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی –

---

١ لە شانۆی دیموکراتیدا جەماوەر واتیدەگات خۆی حوکم دەکات، بەلام لە ڕاستیدا حوکم بەدەست سەرمایەدارەکانە! بەلام لەڕوانگەی ئیسلامەوە حوکم چ بۆ جەماوەر بێت یا بەدەستی سەرمایەدارەکانەوە بێت، لە هەردو حالەتدا هەر حوکم کردنە بەو شەرعەی خوای نەیناردۆتە خوارەوە.

هەرچەند ئەوەیەك نیە لەو ئاستە بەرزانەی تێدا نەبێت- بەلام شوێنی پێشەنگ بۆ ئێمە لەو نەوە تاقانەیە، بنکە(قاعدە) پێویستە لە توانستەکانی عەقیدەیی و رەفتاریی، بەرزتر بێت لەوەی کە هەیەتی بۆ نواندنی ڕاستگۆییانەی حەقیقەتی ئیسلام، چونکە بانگەوازەکە لەسەر شانی ئەوەوە هەلدەستێت، لە کەسایەتیەکانیدا پێشەنگ دروست دەبێت، لەسەر هەولی ئەو و بەرووبومی بزوتنەوەکە دەوەستێ لەلابردنی نامۆیی دووەم بۆ ئیسلام، وەك چۆن ئەرکی لابردنی نامۆیی یەکەم بۆ ئیسلام کەوتبوە سەر شانی کۆمەلی یەکەم.

بۆ بابەتی پەروەردە بەشێکی سەرەکی دادەنێین لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا، بەلام لێرەدا دەلێین: بەڕاستی پێویستە لەسەرمان لەسەرەتاوە بزانین، ئەوەی لە جەولەی یەکەم داوا دەکرێ سەبارەت بە بنکە(قاعدە)کە هیچ ئاستێکی لەسەروی خۆی نیە، بەلکو ئاستێکی تایبەتی؛ چونکە بە ئەرکێکی تایبەتی هەلدەستێت، ڕوبەڕوی چەند کۆسپ و لەمپەرێك دەبێتەوە، کە لەجۆری ئاسایی نین، هەروا ڕوبەڕوی دژایەتیەکی تاك دەبێت لە فێلْ و تەلەکە و زانیندا، ڕوبەڕوی ئەو ئەندازە ڕق و کینە دەبێتەوە کە لەدلیایە بۆ ئیسلام.. هەموو ئاستێك ناشێت بۆ ئەو ئەرکە گەورەیە و هەموو ڕوبەڕوبونەوەیەك ناشێت بۆ ئەو کۆسپ و تەگەرە و دژایەتیانە.

سەرەڕای ئەو بارەگرانە ئاشکرایەی گەیشتن بۆ ئاستی پێویست، کارێکە نە فێلی تێدایە و نە دەتوانرێت وازی لێبهێنرێت، ئوممەتیش کە لە پێشەوەیەتی- نرخی تەمەلی و دواکەوتن و دەربازبوون لە هەلگرتنی ئەرکەکانی ئەم ئایینە دەدات، ئەو تەمەلی و دواخستنەی، کە گەیاندویەتی ئەوەی نەتەوەکانی تر دەمی تێبژەنن وەك چۆن خۆرە دەم دەژەنێتە خواردنەکەی.. ئەمڕۆ دەبێ هەولی زۆر بدرێت، تا هەندێك قەرەبوی ئەو تەمەلی و دواخستنە بکاتەوە، کە زیاتر لە دوو سەدەی خایاندووە، کە دوژمن تێیدا زالْ بوە، خۆی خستۆتە سەر سنگی نەتەوە و نایەوێت جولە بکات.

نەوەی یەکەم، کە پێغەمبەرﷺ لەناویاندا بو، سروش(وحی)یشیان بۆ دەهاتە خوارەوە، بەو شێوەیە هەولی زۆریان دەدا بۆ لابردنی نامۆیی یەکەمی ئیسلام، ئێمە خودی پێغەمبەریشمان لەناودا نیە، وەك نەوەی یەکەم سروش(وحی) ئاڕاستەی ڕاستەوخۆمان ناکات- پێویستمان بەوپەڕی هەولدان هەیە، بە پشت

بەستن بەخوای بەرزی گەورە و میهرەبان و حەلیم، بۆ ئەوەی هەوڵەکەمان پیرۆز بکات و هەنگاوەکانمان ڕاستەڕێ بکا، نامۆیی دووەمیش لەسەر دەستمان لاببات.

ئەو بوارانەی زۆر پێویستی بە هەوڵدانی زۆر هەیە دروست کردنی بنکەیە، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە ئەو ساتمە و هەڵنوتانانەی لەکاری ئیسلامیدا دەیبینین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە هەنگاوی پەلەمان ناوە، لە مەسەلەی پەروەردەدا هەوڵی شایستەمان نەداوە، بەڵکو هەندێ جار نەمانزانیوە ئەو کارە، یان ئەوی تر پێویستی بە پەروەرکردن و ئامادەکردن هەیە!

* * *

ئایا بنکەکە هەتا ڕادەی باش فراوان بوە، کە بگونجێت بۆ خستنە ئەستۆی ئەو ئەرکەی، کە لە جەولەی یەکەم داوای لێدەکرێت؟

جا ئەگەر مەبەستمان بنکەی جەماوەری بێت، بەڕاستی و بێگومان لەماوەی کاری بانگەوازیی بەردەوامدا لە نیوسەدە زیاترە و لە میانەی ئەو شەهیدانەوە، کە گیان و خوێنی خۆیان بەخت کردووە لەڕێگای بانگەوازەکەدا، هەروا لە میانەی بێئاوەزی نەفامەکان لە خوێن ڕشتندا و بەندکردن و دەربەدەرکردن و سزادانی موسڵمانان، فراوان بوە، ئەوە دەستوری خواییە ستەمکارەکان هەمیشە لێی بێئاگان: کە ئەو بانگەوازەی خوێنی پێشکەش بکرێت نامرێت! ستەمکاران وادەزانن، ئەگەر خوێنی زۆریان ڕشت و بەندکردن و دەربەدەری و سزایان بەکارهێنا، بانگەوازەکە لەناو دەبەن، ئەو بانگەوازە بە تەحەدای بەردەوام دەزانن لەبەردەمیاندا، کە دەبێ سەرکەون بەسەریا.. ئەوە خۆی قەدەری خوایە بۆ پاڵفتەکردن و پاکردنەوەی بڕواداران و لەناوبردنی بێبڕواکانە لە کۆتاییدا:

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾: سست مەبن و زویر مەبن هەر ئێوە لەسەرەوە دەبن ئەگەر بڕوادار بن، ئەگەر ئێوە

بریندار بوون، ئەوانیش هــەمان شێوە بریندار بــوون، ئەمــە ڕۆژگــارە دەیــهێنین و دەیبەین لەنێوان خــەڵکدا بــۆ ئــەوەی خــوا بڕوادارەکـان بزانێـت و لـە ئێـوە چـەند کەسێك هەڵبژێرێ بۆ خۆی و بیگێڕێ بە شەهید، خوا ستەمکارەکانی خۆش نـاوێت و بۆ ئەوەی خوا ئەوانە پاك بکاتەوەو بێبڕواکان لەناویەرێت.﴾آل عمران:١٣٩-١٤١.

بەڵێ بنکە جەماوەریەکە فراوان بووە، پــەلی لێبۆتــەوەو لـق لـق فـراوان بـووەو جیهانی ئیسلامی هەموو گرتۆتەوە، هەزارەها لاوی چووەتە نــاو، کـە لـە سـێبەری ڕژێمی نەفامیدا لەدایك بوون، بەڵام خوا ویسـتی وابـوو ڕێگـای ئیسـلام هــەڵبژێرن، چالاکی بانگەوازیی و بێئاوەزی و گەوجێتی نەفامی کاری تێکردوون، بەڵام کێشــی ئەو جەماوەرە بزوتنەوە چیە.

بەڵام دڵخۆش بوونی بانگخوازان بە فراوانی بنکە لەسەر ئــەو شـێوەیە، کارێکـە گومانی تێدا نیە، بەڵام ئایا ئەو جەماوەرە خۆی کردۆتە سـەربازی ئــەو بانگــەوازە وەك ئەنصار خۆیان کردە سەرباز بۆ بانگەوازەکەی پێغەمبەرﷺ، ئەوەیان کارێکــە گومانی لەسەرە!

یەکەمجار پرسـیار دەکـەین: ئایـا ئــەو جــەماوەرە بەپەرۆشـە بـۆ ئیسـلام هــەر لەسەر ئەو بەپەرۆشیە دەمێننــەوە، کاتــێ جاهیلیــەت گــەوجێتی خـۆی دەنوێنــێ، کــەوا موســـڵمانان دەکــوژێ و ســزایان دەدا و دەربــەدەریان دەکـــا، ئاســـایش و دڵنیاییان لێزەوت دەکات و ئازاریان دەدا و کۆت و بەندیان دەکات، یان ئــەو کاتــە یەکێکیان دەڵێ: تا ئەو ڕادەیە نەبوینەتە هاوڕێ! جا لە ڕێگاکە وازدەهێنێ؟!!

گریمان موسڵمانان لە یــەکێ لـە وڵاتــەکاندا کاروباریـان گرتـە دەسـت، نــەفامی جیهــانیش: صــەلیبی ســەهیۆنی بــە گــەمارۆی ئــابوری دژیــان بجــەنگێ واز لــە هۆیەکانی تر بهێنە-، ئایا ئەو جەماوەرە بەپەرۆشە ئارام دەگرێت لەسەر برسێتی لەپێناوی مانەوەی حوکمی ئیسلامدا؟ یان پاشگەز دەبێتەوە و دەگەڕێت بەشـوێن پارویەك نانداا؟

یان گریمان موسڵمانان حوکمی یەکێ لــە وڵاتــەکانیان کەوتــە دەسـت، نــەفامی جیهانی خۆی تێنەگەیاندن بە جەنگ و گەمارۆی ئابوری و جۆرەکانی تری جەنگ، بەڵام خۆیان تەنها گۆرانی ناشەرعی لە وێستگەی ڕادیۆدا لابرد و فلیمی ڕوتیان لــە تەلەفزیۆن قەدەغەکرد و ڕوتی ئافرەتیان لەڕێگادا حەرام کرد، ئایا ئەو جەماوەرە

بەپەرۆشە هەموویان هەر لەسەر ئەو بە پەرۆشیەیان دەمێننەوە، یان هەندێکیان بەرەو دواوە دێن و بەلایەنی کەمەوە دەڵێن: ئەوە توندڕەوییە پێویست ناکات!!

ئایا ئەو جەماوەرە بەلایەنی کەمەوە پێویستی بەوە نیە هەندێك پەروەردە بکرێت، بۆ ئەوەی خۆی بکاتە سەربازی ئەرکەکانی ئیسلام و لەو ئەرکانە ڕانەکات، کاتێ دوژمن بە جەنگ بەرەوڕووی دەبێت، یا ئەو کاتەی ئەحکامەکانی ئیسلام دادەمەزرێت؟

ئایا کێ ئەو جەماوەرە پەروەردە دەکات، لەکاتێکدا خودی بنەکەکە بەشی خۆی لە پەروەردەکە تەواو نەکردووە، خۆی ئامادە نەکردووە بۆ فراوان بوونی جەماوەر، جەماوەر زۆر بە پەرۆشەوە هاتوو، پەروەردیاریان نەدۆزیەوە؟!

بەڵام باسی یەکلاکردنەوە بۆ خوا باسێکی دڕکاوییە! دەرهەقی کەسێکی دیاریکراو نادوێین، پاکانەی خۆمان ناکەین، خوا خۆی بەتەنها ئاگادارە بەسەر دڵ و دەروونەکاندا: ﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ: خواش دەزانێ کێ چاوی ناپاکی هەیە و چیان لە دڵدا شاردۆتەوە﴾غافر ١٩.

ئێمە ئەوەندە دەڵێین دیاردەی ئەو ناکۆکی و دوبەرەکی و کۆمەڵ کۆمەڵەی ئەمڕۆ، کە دەوری کاری ئیسلامی داوە، نیشانەی ئەوەیە، کە کەموکوڕی هەیە لە پەروەردەی برایەتی ئیسلامی(الأخوة الإسلامية) لە دەروونی ئەوانەدا کە لە بواری بانگەوازدا کاردەکەن، هەروا کەموکوڕی هەیە لە خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خوا.

جیاڕایی خۆی لەخۆیدا عەیب نیە، هەرچەندە پێویستە چەند ڕێکخەرێکی هەبێت ڕێکی بخات، بەشێوەیەك نەبێتە دەمارگیری ئارەزووی دەروون، یا بۆ کەسێکی تایبەتی، یا بۆ کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکان، بەڕاستی هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ لەنێوانیاندا جیاڕایی هەبوو، بەڵام لە یەك جیانەدەبوونەوە، ئا ئەوەش تەوەری کێشەکەیە. کاتێك جیاوازیمان لەسەر شتێك هەبو و ئێمەش بۆ خوا یەکلا بوین، بۆ حەق و ڕاستی یەکلابوین، بێگومان ناکۆکی و دوبەرەکی و جیابوونەوە کەم دەکات، دیاردەی دروستبوونی حیزبایەتی، کە ئەمڕۆ لەکاری ئیسلامیدا بەرچاوە کەم دەکاتەوە، ئەو حیزبایەتیەی دەبێتە مایەی دەمارگیری بۆ بیروڕا، بۆ سەرۆك، بۆ کۆمەڵ، بۆ ڕێگا.

یەکدەنگی و کۆڕایی خۆی لەخۆیدا خوازراو نیە، با لەسەر هەڵەیش بێت، چونکە هەڵە خزمەتی بانگەوازیی ناکات، بەردەوام بوون لەسەری تێکدەرە، بەڵام خۆ یەکلاکردنەوە لە ڕونکردنەوەی حەق پێویستترە بۆ یەکخستنی دڵەکان، لە لەیەك جیابوونەوە بەناوی ڕاستکردنەوەی هەڵە و دەرخستنی ڕاستی!

بە کورتی: ئێمە لەڕێگادا پەلەمان کردووە، لە بەردەممماندا ڕێگایەکی دوور و درێژ هەیە، دەبێ هەر بیبڕین بۆ ئەوەی لای خوا شایستەی دەسەڵات پێدان بین.

بەڕاستی خوا ڕێگای دەسەڵات پێدانی بۆ ڕون کردوینەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٦٢ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝٦٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٦٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ..: هەر ئەویش هاتە هاواری خۆت و خاوەن باوەڕان و یاریدەی دان. بە دڵ ئەوانی کردە هۆگری یەکتری. ئەگەر هەرچی لەم سەرزەمینەدا هەیە، هەموت بەخت بکردایە، نەت دەتوانی وا لێکیان بکەیتەوە؛ بەڵام خودا وا لێکی کردون بە هۆگر؛ هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتی لەکارزانە. ئەی پێغەمبەربۆ تۆ و بۆ باوەڕدارانێ شوێنت کەوتون، خودا بەسە ئەی پێغەمبەر! هانی بڕواداران بدە بچنە خەزا..﴾الأنفال:٦٢-٦٥.

ئەوە چوار مەرجە، لە چوار ئایەتی یەك بەدوای یەکدا، لە یەك سورەتدا هاتون، کە مەرجە بنەڕەتیەکانی سەرکەوتن دەردەخەن، ئەو مەرجانەش: بوونی بڕوادارانێکە، کە لە ئیمانەکەیان ڕاستگۆ بن، دڵەکانیان هۆگری یەك بێت، خۆیان بۆ خوا یەکلاکردبێتەوە، ئامادەی جەنگ بن. کاتێ ڕەوشەکە جیهادی گەرەك بێت.

جا ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی ئەو مەرجانەدا سەیری واقیعی بانگەوازەکەی ئەمڕۆ بکەین، بێگومان بۆمان دەردەکەوێت هەنگاومان ناوە، بەڵام لەڕێگادا پەلەمان کردوە!

# هۆیەکانی پەلەکردن لە بزوتنەوەی ئەم سەردەمەو ئەو ئەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە

لێرەدا سێ هـۆی سـەرەکی هەیە، کـە بـوە مایـەی پەلـەکردن لـە بزوتنـەوەی سەردەمدا:

یەکـەم: ئـەندازە نـەگرتنێکی وردکارانـە بـۆ دووریـی ئوممـەت لـە حەقیقـەتی ئیسلامەوە.

دووەم: هەڵخەڵەتان بە حەماسەتی جەماوەر، گومان بردن بەوەی، کە کارەکـە هەرچەندە زۆر گرانە؛ بەدەست هێنانی نزیکە.

سێیەم: ئەندازەگیریی نەکردنێکی پێویست بۆ کاردانەوەی دوژمن.

بۆ هەر یەك لەم هۆیانە، کەمێك ڕون کردنەوەی لەسەر دەکەین.

پێش نیو سەدە و زیاتر کاتێ بانگەوازکردن سـەری هـەڵدا، هـەموو لایەنـەکانی باری ئوممەت روون و ئاشکرا نەبوو، پاشماوەی دیـاردە ئیسـلامیەکان ئەندێشـەی سـەرنجدەرانی وا لێ دەکـرد وابزانێـت هێشـتا خـێری تێـدا مـاوە.. داگیرکردنـە فیکریەکە نەیتوانیبوو وەك ئێستا لەناو ئوممەتدا زاڵ بـێ، پاشمـاوەی نەریتـەکان دواکەی داپۆشی بوو وێنە ڕاستیەکەی دەرنەدەکەوت.

بەڵام داگیرکردنی فیکریی لەو کاتـەوە دەسـتی پێکـرد، کـە جیـهانی ئیسـلامی کەوتە دەست ڕۆژئاواوە، جیهانی ئیسلامیش لەلای خۆیەوە بە پێشکەوتنی مـادیی و زانسـتیی ڕۆژئـاوا سەرسـام بـو، موسـڵمانان لـەو کاتـەدا لـە هــەموو ڕوویەکــەوە دواکەوتبوون، پاشان پرۆگرامی فێرکردن و هۆکانی ڕاگەیاندن کاری خۆیان کرد بە قوڵکردنەوەی داگیرکردنەکە، هەروا دەرچواندنی نەوەیەك، کە وردەوردە لەئیسلام خۆیان دادەماڵی و وردەوردە دەچوونە ناو پرۆسەی بـەڕۆژئاواکردن.. بەڵام کاتـێ بانگەوازەکە پێش نیو سەدە زیاتر دەستی پێکرد، بەری تـەواوی نـەدا، ئـەو کاتـە

لەسەر کەنارەکان ئافرەتانی چینی نوروستقراتی[1] نەبێت کەس بە ڕوتی نەدەبینرا! بەڵام ئافرەتانی چینی ناوەندییەکان بەردەوام شەرمیان لەو خۆ ڕوت کردنەوە دەکرد هەرچەندە حەزیان پێدەکرد، لەبەر زۆری نوسین و بڵاوکردنەوەی لەناو گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، کە بڵاویان دەکردەوە لە وێنە و دەنگ و باسەکانیدا، بەڵام کچە شەعبیەکان لێیان ڕادەکرد و ئینکاریان لێدەکرد، دۆستایەتی خاوێن لەنێوان کوڕان و کچاندا بە شەرمێکی زۆرەوە دروست دەبوو، لە باوکەکان و دایکەکان دەشاررایەوە، ئەو کچەی ئاشکرای بکردایە؛ ئەوا لەبەرچاوی خەڵك دەکەوت! بیرۆکەی ڕۆژئاوایی لە گۆڤار و نامیلکەکاندا بڵاودەکرایەوە، یان دەدرایە پاڵ خاوەنی ئەسڵی لە بیریار(مفکر)ە ڕۆژئاواییەکان ئەگەر نەقڵکەرەکە ئەمین بوایە و ڕێزی خۆی بگرتایە، یا دەدزرا و زۆرجار دەدرا پاڵ نەقڵکەرەکە خۆی، شانۆ و سینەما و ئێستکە هەمویان کاریان بۆ داگیرکردنی فیکری ڕۆژئاوایی دەکرد، بەڵام پێشەنگەکانی هێشتا کەم بوون، کاریگەریەکەی هێشتا لە سەرەتادایە.

بەکورتی کاری وەرچەرخانەکە بەو پلەیەی ئێستا خێرا نەبوو، بەتایبەتی دوای جەنگی جیهانی دووەم کاری وەرچەرخانەکە کەوتە بازی خێرا و بەپەلە.

لەلایەکی ترەوە پاشماوەی نەریتەکان هەر مابوون، وا بە بیری هەندێکدا دەهات کە خۆی دەگرێت بەرامبەر فشاری داگیرکاری فیکریی، وەك نزیکەی نیو سەدە پێش ئەوە خۆی گرت! ئێستاش بەردەوام کۆمەڵێك لاو دەچنە مزگەوتەکان، هەتا لە پایتەختە گەورەکانیشدا، کە داگیرکردنی فیکریی تەرکیزی کردۆتە سەریان، لە مانگی ڕەمەزاندا گەورە و بچوك کەس ناوێری بە ئاشکرا خواردن و خواردنەوە بخوات، ئەگەریش لەراستیدا بەڕۆژوو نەبن! ژنهێنان و شوکردن هێشتا بە ئاگاداری باوك و دایك دەکرێت، زۆرجار هەر لەڕێگای ئەوانەوە پەیمانەکە دەبەسترێت، خێزانەکان هێشتا بەیەکەوە بەندن و لەیەك نەترازاون، گەورەی خێزان قسەڕەوایە، کوڕ و کچەکان بەسراون بە نەریتە گشتیەکان و لێی دەرناچن، هەرکە لێی دەربچێت خەڵك پشتی تێدەکەن و لێی دووردەکەونەوە؛

١ گەورەپیاوان و پیاوماقوڵان.

بەلام گوندنشینەکان بەگشتی لەسەر ئەو بارە ماون، کە چەندەها نەوەی لەسەر بووە، ئینکاری ئەو فەسادە دەکەن، کە لە شاردا هەیە، ئاخ هەلدەکێشن بۆ (ڕۆژانی رابردوو).

لەم جۆرە ڕەوش(ظروف)ەدا، دەکرێ زۆر حەقیقەت بشاررێتەوە!

بەڕاستی ئیسلام ماوەیەکی کەم نیە بوەتە کۆمەلێك نەریت، زۆرتر لەوەی بارگە(شحنة)یەکی ڕاستەقینەی زیندوبێ.. ماوەیەکی دیاریکراو لەژیانی ئوممەتدا خەلك بەتوندی دەستیان گرتبوو بە نەریتەکانەوە بەشێوەیەك مرۆڤ وا تێدەگەیشت، کە خەلکەکە لەسەر ئایینی ڕاستی بن! بەلام نەریتەکان دوای ماوەیەك، کە کۆمەکی زیندوی لێ دەبڕرێ، کە زیندوێتی و کاریگەریی پێ دەبەخشێ، وشك دەبێت، جا دەست دەکا بە وشکبوونەوە و بەستن لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە یەکگرتنەکەی ون دەکات، ئەگەر گۆڕانی توند بەسەر کۆمەلدا نەیێت؛ چەندەها سەدە بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، هەرچەندە لە کۆتاییدا بەکاری هۆکاری (روت بوونی فیکریی) ئەگەر تەعبیرەکە ڕاست بێت ورد و خاش دەبێ! بەلام کاتێ دەڕوخێ و گۆڕانکاریی توند و کاریگەر ڕوو دەدات، نەریتەکان ناتوانن بەرگە بگرن، بەپەلە دادەڕمێن.

ئەوەی لەجیهانی ئیسلامیدا رویدا ئەوەبوو پاچ(قازمە) –کە لە داگیرکردنی فیکریی خۆی دەنوێنێ– زۆر توند و تیژ بوو، کە بەرەو ڕووی روخانی خودی ئیسلام کرابو بێجگە لە نەریتە ڕواڵەتیەکانی، هەڵبەت نەریتەکان بەپەلە دادەڕمێن لەژێر دەمی پاچەکاندا کە شەو و ڕۆژ ئیش دەکەن لە دابونەریتێکدا، کە ماندووبونیان نیە و بەردەوام لە ئامانجەکانیان ناگۆڕێ.

لەماوەی نیو سەدەدا کارەکان گۆڕانێکی ترسناکیان بەسەرداهات وەك ئەوەی ئوممەی یەکەم بەڕاستی ڕۆیشت و نەما، لەجیاتی ئەو ئوممەیەکی تر هات، کە پەیوەندیان بەیەکەوە نیە جگە لە لەیەك چوونی ناوەکان، ئەو فەسادەی ناوی (ڕاپەڕین) بوو، بە پەلە هەمووی گرتنەوە وەك بلاوبوونەوەی ژەهر لەناو لەشی ئەو کەسەی شتێکی پێوە دراوە. ئیتر هەر ئافرەتی چینی ئوروستقراتی بە تەنها لەسەر کەناری دەریاکان خۆیان روت نەدەکردەوە، بەلکو کچەکانی چینی مام

ناوەندیشی گرتـەوە و بەرەبـەرە پەتاکـە لادێکانیشـی گرتـەوە ! هـەتا وایلێـهات پەیوەندی نێوان کوڕان و کچان –پاك و ناپاك– لە کۆمەڵگەدا شتێکی ئاسایی بوو، بەڵکو بووە یـەکێ لـە بنـەماکانی، شیرازەی خـێزان پچڕا، ئیـتر گـەورەی خـێزان دەسەڵاتی بەسەریا نـەما، وایلێهات کوڕەکـان و کچـەکان کـاری تایبـەتی خۆیـان هەبوو، نابێت دایك و باوك خۆیان تێ هەڵقورتێنن.. ئایین بەگشتی وای لێهات بووە نیشانەی دواکەوتوویی و داخران، بوە نیشانەی دواکەوتن لە کەشتی ژیانی زیندوی بزوێن، وای لێـهات مانـەوە لەسـەری شـتێکی عـەیب بێـت و خـاوەنی پـێ عـەیبدار بکرێت، چونکە بنەما لە هەموو شتێکدا بەرەوپێش چونە نەك مانـەوە، لـە مـاوەی نیو سەدەدا ئەوانە هەموو ڕوویان دا و درانە پاڵ پێشکەوتن و ڕاپەڕین، درانە پـاڵ کـەژاوەی جیـهانی پێشـکەوتوو و درانــە پـاڵ شۆڕشـی تـەکنۆلۆجیا و شۆڕشـی گەیاندن. !

بەپێی سروشتی بارەکە نەدەبوو جیهانی ئیسلام لـە دەرەوەی ئـەو ڕوداوانـەدا بێـت، ئـەو ڕوداوانـەی زەوی پێـدا تێدەپـەڕێ، بـەڵام ئەگـەر ئیسـلام لـەدەروونی خاوەنەکانیدا زیندووبوایە، نەك کۆمەڵێ نـەریتی پـەتی بێگیـان، ئـەوا شـێوەیەکی تری زۆر جیاواز نزیك بوو ڕو بدات.

پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی، گرفت بۆ مرۆڤی موسڵمان دروست ناکـات، لەوەپێش موسڵمانەکان هـەموو بزوتنەوەیـەکی زانسـتیان وەرگرتـوە، کە لەسـەر زەوی هـەبوە، پاشـان دەسـتیان کـردووە بـە زیـادکردنی ڕیشــەیی، دیارترینیـان بەکارهێنانی بەرنامەی ئەزمونیی لە لێکۆڵینـەوەی زانسـتیدا، بێجگـە لـە چـەندەها دۆزینەوەی زانستی تر، کـە نـاوك و کرۆکـی پێشـکەوتنی ئێسـتا بـووە. موسـڵمان بیروباوەڕەکەی لەنگ نابێت کاتێ فێری زانست ببێت، ئیمانی بەخوا و ڕۆژی دوایی لەنگ نابێت، چونکە خاوەنی کیانێکی هاوسەنگە، کە لایەنگری خواسـتی ئیمـان و خواستی زانسـتی تێدایـە، یارمــەتی یــەك دەدەن بێبەرەنگاربوونـەوەی یــەك و دژایەتی یەك کردن: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ: لە بەندەکانی خـوادا بەڕاستی زاناکانیان لەخوا دەترسن.﴾فاطر ٢٨.

ئەو دژایەتی و لەبەریەکدا چونەی لە ئەورووپا ڕوویدا، لە ئەنجامی ناتــەواوی ئـەو

ئایینەی ئەوان کردویانەتە ئایینیان، ناتەواویەك لەو کیانەی کە ئەو ئایینە بەجێی هێشتوە، نەك لەبەر ئەوەی ئاین بە سروشتی خۆی هاودژی زانستە، نەك لەبەر ئەوەش زانست ببێتە جێگری ئاین! جا ئەگەر ئیسلام لەدەرونی خاوەنەکانیدا زیندوبوایە، نەك کۆمەڵێ لاسایی کردنەوەی پەتی بێگیان، نزیك بوو ئوممەتی ئیسلامیی نمونەیەکی شارستانی جیاواز لە نمونە نەفامیەکەی ڕۆژئاوا پێشکەشی مرۆڤ بکات، کە لە تێکچونێکەوە دەچێت بۆ تێکچوونێکی تر، کە لە هەر قۆناخێکدا بێت لە قۆناخەکانی یەکێ لەلاکانی مرۆڤ نەبێت وەری ناگرێت، جا یان لایەنە رۆحیەکەی وەری دەگرێت، یان لایەنە مادییەکەی.. یا ئەو لایەنەی لەپێناوی ڕۆژی دوایی کار دەکات و ژیانی دونیا پشتگوێ دەخات؛ یا ئەو لایەنەی لەپێناوی دونیادا کار دەکات، ئاخیرەت پشتگوێ دەخات. لە هەموو بارەکاندا مرۆڤ ناتوانێ هەمووی وەربگرێت، وەك خوا دروستی کردووە بە هەردو لاکەیەوە کە بەیەکەوەن و پەیوەستن: مستەقوڕەکە و فوە گیانەکەیە:

﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ۝٧١ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ: کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی ڕاگەیاند وا خەریکم مرۆیەك لەقوڕ دروست بکەم، هەرکاتێ لەشیم تەواوکرد و لەگیانی خۆم فوم پێدا کرد، هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص: ٧١-٧٢.

ئوممەت کە ناتوانێ پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی لەسەر زەوی وەربگرێ، هەروا ناشتوانێ نمونەیەکی شارستانی جیاکار پێشکەش بکات، ئەوا واتایەك دەگەیەنێ، کە نابێ خاوەنی بانگەوازەکە لەدەستی بدات، واتا گشتییەکەی ئەوەیە، کە مەشخەڵە زیندوەکەی ئەو ئایینە لە دەرونی خاوەنەکانیدا کوژاوەتەوە، یان ئەوەندە لاواز بووە، کە لەگەڵ ڕوداوەکان توانای کارلێکردنی زیندوی نیە، وەك چۆن لە پێشدا لەگەڵ ڕوداوەکانی مێژوودا کاری لەیەك نەکردووە.. بەپێی سروشتی بارەکە ئەم لاوازیە هەر دەبێت چەند هۆی هەبێت، ئەو لاوازیە لە سروشتی ئەو ئایینە زیندووە نیە، کە لەژیانی مرۆڤایەتیدا چەندەها شتی سەرسوڕهێنەری دروست کردووە، کاتێ خاوەنەکانی بڕوایەکی ڕاستگۆیانە و هۆشیارانەیان پێ هێنا، لە دونیای واقیعدا پێی جوڵاون.. وادیارە دڵ توشی چەند

نەخۆشیەك بووە، دڵیش كە نەخۆش كەوت لاشە هەمووی نەخۆش دەبێت:

((أَلا في الجَسَدِ مُضْغَةٌ إذا صَلُحَتْ صَلُحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَت فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، أَلا وَهِيَ القَلب: بەڕاستی لە ناو لەشدا پارچەگۆشتێك هەیە ئەگەر ئەو چاك بوو هەموو لەش چاك دەبێت، ئەگەر خراپ بوو هەموو لەش خراپ دەبێت، ئەو پارچە گۆشتەش دڵە.)).[1]

ئەگەر ئەو نەخۆشیانە لەسەرەتای ڕێگاوە بۆ بانگەوازكاران دەركەوێت، پێش ئەوەی بكەونە ڕێ؛ هەوڵی چارەسەركردنیان دەدەن.. ئەگەر هەموو ئەو دواكەوتنە جۆراوجۆرانەی كە موسڵمانانی تێی كەوتبوون، كە بریتی بوون لە دواكەوتنی زانستیی و مادیی و ڕامیاریی و جەنگی و شارستانیی و ڕۆشنبیریی، كە لە ئەنجامی دواكەوتنی عەقیدەیی، كە لەم ماوەی دواییەدا بەشێوەیەكی تایبەتی توشیان بووبوو، بۆیان ڕون بوبایەوە.. ئەوا بەرنامەیەكیان بۆ بانگەوازەكە دادەنا، وەك ئەو بانگەوازە نەدەبوو، كە لەسەری ڕۆیشتن، هەروا دیدی جیاوازیان دەبوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگای چارەسەركردنی. هەڵبەت دوری ئوممەت لە شێوە ڕاستەكەی ئیسلام بەتەواوەتی بۆ بانگخوازەكان ڕوون بوو، چونكە لەوە دیارتر بوو، كە لەكەس شاراوە بێت.. بەڵام ماوەی ئەو دورییە و جۆرەكەی شاراوە بوو، كە لەژێر توێكڵی نەریتی خەڵەتێنەردا، كە وا لە بینەر دەكا وا بزانێ بیناكە ژێرەوەی هێشتا ساغە، یا لێرە و لەوێ پێویستی بە نۆژەن كردنەوەیەكی كەم هەیە.!

بۆ بانگەوازەكە پێویست بوو لە بناغەوە خۆی دەربخات، بۆ ئەوەی ببینرێت بەساغی ماوەتەوە، یان لە میانەی ئەو هەژاندن و ڕاتەكاندنە دوابەدوای یەكانەی كە لە مێژودا بەسەر ئوممەتدا هاتووە تێكچوە، بۆ ئەوەی لە ناخیدا بڕیاری خاڵی دەست پێكردنەوە بدات: ئایا نۆژەن كردنەوەی بیناكەیە، یا نوێكردنەوەی بناغەیە.

ئەو گەندەڵیەی تووشی ئوممەت هاتووە، تەنها گەندەڵی ڕەفتار نیە، بەڵكو گەندەڵی چەمكەكانیشی گرتۆتەوە، گەندەڵی چەمكەكان زۆر ترسناك تر و چارەسەركردنیان گرانترە لە گەندەڵی ڕەفتار و كردەوە.

---

[1] أخرجه البخاري.

کاتێ ڕەفتاری کەسێك یا کۆمەڵێك یا نەتەوەیەك تێك دەچێت، لەگەڵ بوونی چەمکانێکی ڕاست، چاکسازیی –گرانیەکەی هەرچەندە بکات– بەئاسانی بەدەست دێت و ئومێد پێی نزیکترە لەوەی، ئەگەر چەمکەکان خۆیان گەندەڵ بوبن، چونکە تۆ ئەوکاتە پێویستت بە هەوڵی چەندجارە هەیە، هەوڵێك بۆ ڕاست کردنەوەی چەمکەکان کە ئەوەیان زەحمەتترە، هەروا هەوڵێك بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەفتارەکان.

لەڕاستیدا کاتێ بانگەوازەکە دەستی پێکرد هەموو چەمکەکان تێك چووبوون –وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد– هەتا چەمکی (لا اله الا الله)یش، بەڵکو لە چەمکی (لا الە الا الله)ەوە دەستی پێکرد، جگە لەوەی وشەیەك بوو بەزمان گۆدەکرا، هیچی نەمابووەوە لەگەڵ لایەنی چەند دروشمێکی خواپەرستی لای هەندێ کەس بە تەقلید بەجێیان دەهێنا، زیاتر لەوەی بە زیندوویی و تێگەیشتوویی بیکەن، بەشێوەیەك مرۆڤ بە بەرنامەی ژیانی تەواومەند پەیوەست بکات، کە هەموو ژیان بگرێتەوە لە پەرستنەکەی و کردەوەکەی، سیاسەتەکەی و ئابوریەکەی، پەیوەندیە کۆمەلایەتی و فیکریەکەی لەیەك کاتدا.

ئەو هۆکارانەی کاریان کردبوە سەر گەندەڵ کردنی چەمکە بنەڕەتیەکانی ئیسلام لە هەستی خەڵکدا زۆر بوون، ئەو هۆشیاری و تێگەیشتنە ڕاستەیان نەبوو، بەو شێوەیەی خوا ناردبویە خوارەوە، کە لەوەپێش ئەوەی یەکەم(ﷺ) تێیگەیشتبون و کاریان پێدەکرد، هەروەها چەند نەوەیەکی دوای خۆشیان.

بیرۆکەی (ئیرجائی) کردەوەی لەناوی ئیمان دەرهێنابوو! دەیوت بەڕاستی ئیمان دان پێدانان و بڕیارە و زیاتر نیە، هەرکەس وتی (لا الە الا الله) ئەوە بڕوادارە، ئەگەریش کردەوەیەك لە کردەوەکانی ئیسلام نەکات!

بیرۆکەی صۆفیی، ئیسلامی گۆڕی بۆ پاڕانەوەی ڕۆحانی و ویردەکان و یادەکان و شتی نەزانراوی ویژدانی، کە لە واقیعی زەویدا ناجولێ، نە فەرمان بە چاکە دەکات و نە قەدەغەی خراپە دەکات، نە هەڵدەسێت بە جیهادکردن، جگە لە تێکچوونی عەقیدەیی لە پەرستنی گۆڕەکان و ئەولیاکان و چوون بەرەو پیریان بە پەرستنێك کە بۆ غەیری خوا نابێت.

ستەمی سیاسی هەر لە سەردەمی ئەمەویەکان و پاشان عەباسییەکان و پاشان مەمالیکەکان و پاشان عوسمانیەکان خەڵکی دورخستبۆوە لەوەی بە کاروباری گشتیەوە خەریك بن، وای لێکردبوون ڕویکەنە گرنگیدان بەکاروباری تایبەتی خۆیان، چەمکی پەرستن(العبادة)یان لە دروشمە پەرستنەکانیان کورت هەڵێنابوو، هەروا لە کارە پەسندەکانی تاك، کە خۆ هەڵنەقورتێنێتە کاروباری گشتی.

پشت بەستن گۆڕا بۆ پشتکردنەوەیەکی سلبی بێ ئەوەی دەست بە هۆکانەوە بگیرێت، عەقیدەی قەزاوقەدەریش گۆڕا بۆ ملکەچی و دواکەوتویی، کە لەوەپێش عەقیدەی بەرەوپێش چوون و ئازایەتی بوو لەڕوبەڕو بوونەوەی دوژمن و ڕوداوەکان بوو:

﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ: بێژە: بێجگە لەوەی خودا بۆی نوسیبن توشمان نایە؛ هەر ئەو سەروەری ئێمەیە و گەرەکە خاوەن باوەڕان هەر خۆبەخودا بسپێرن.. بێژە: ئاخۆ چاوەنۆڕن جگە لە یەکێ لەو دوانەی کە هەردوکیان باشەکانن– شتێکی ترمان توش ببێ. ئەوا ئێمەش چاوەنۆڕین خودا هەر خۆی، یان بەهۆی ئێمە جەزرەبەو بۆ بنێرێ. دەسا ئێوە چاوەنۆڕبن، ئەوا ئێمەش چاوەنۆڕین.﴾التوبة:٥١-٥٢.

ڕێگای نێوان کارکردن بۆ دونیا و کارکردن بۆ ڕۆژی دوایی کرایەوە، کە لەوەپێش هەریەك ڕێگابوو، کە سەرەتاکەی لە دونیا و کۆتاییەکەی لە ڕۆژی دوایی بوو: ﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا: بەوەی خوا بەتۆی داوە، بەشوێن ماڵی سەلاوە بە! بەشی خۆشت لەم دونیایە لەبیر مەکە.﴾القصص:٧٧.

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ: ئەوە كە ئەم زەمینەی بۆ كەوی كردون؛ شانەوشـان تێیـدا بگەڕێن و لە بژێوەكەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك:١٥.

هـەموو ئوممـەت ڕێگـای دونیایـان پشـت گـوێ خسـت، كــە زانسـت و هــێز و دەسەڵاتی سەر زەوی و ئاوەدانكردنەوە و چاك كردنی باری ژیانە و، ڕویـان كـردە شتێك وایان زانی ئەو شـتانە لـەخوایان نزیـك دەكاتـەوە، ئـەوانیش كۆڕی زیكـر و سۆزی ویژدانن، لـەكاتێكدا كۆمـەڵێك لـە خراپـەكاران ڕویـان كـردە فریودەرەكـانی دونیا، لـە كۆكردنـەوەی سـامان و منداڵـی زۆر و ڕازاندنـەوەو ڕابـواردن و زاڵبـوون بەسەر خەڵكدا، مردن و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەو پاداشتیان لـە بیر چـوەوە، خراپەكاریان لەسەر زەویدا بڵاوكردەوە، ئوممەتیش دەستیان بە كڵاوی خۆیانــەوە گرتوە، تا با نەیبات و هیچ بەوانە ناڵێن. !

هـەموو ئـەم نەخۆشـیانە، كـە ئـایین لـەو شــتە زیندویانــەی تێیدایــە، بــەتاڵ كردۆتەوە، (لا اله الا الله)ی لە شەحنە كاریگـەرەكـەی بـەتاڵ كردۆتـەوە، كـە ئـەبو سـەرەتا بەراسـت كردنـەوەی چـەمكی (لا الـه الا الله) دەسـت پێبكرایـە، بـە پەروەردەیەكی پتـەوی بینـا چەسـپاو، پێـش ئـەوەی ڕوبكرایـە كۆكردنـەوەی جەماوەر. !

ئەگەر ئەو پاشماوە نەریتیانەی كە لە سەرەتای بانگـەوازیدا لـەناو كۆمەڵگـەدا مـابۆوە، بانگیـەرانی هەڵخەڵـەتاندبێ و سـەری لێشـێواندبن لـە حەقیقـەتی ئـەو نەخۆشـیانەی نـەبینی كـە توشـی بنـەمای عــەقیدەیی ئوممەتــەوە بــووە، ئــەوا حەماسەتی و بە پەرۆشی جەماوەر بۆ وەرگرتنی بانگەوازەكـە، لـە ڕاسـتیی واقیـع زیاتر هەڵی خەڵەتاندون.

جەماوەر بانگەوازەكەی بە حەماسەتێكی بەرچاو وەرگرت، ماوەی چەند ساڵێك بەدەوری پێشەوای شەهید كۆبونەوە، كە بەیەك ملیۆن مـرۆڤ دائـەنران، كـە لاوی زۆریشیان تێدابوو، ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی گـەلی میصـری ئەوكاتـە، بـە بیسـت ملیۆن دابنێیت، ئەو ڕێژەیە زۆر بەرزە، ئەگەر ژن و منداڵ و پیرمـان لێ دەركـردن، چونكە ئەوانە خۆیان سەرقاڵ ناكەن بە كـارە گشـتییەكانەوە، یان پێشـوازی لـە

هیچ شتێکی تازە ناکەن. !

بێگومان ئەو لایەنە ڕۆحی‌یە زۆرەی پێشەوای شەهید هەیبوو، ئەو توانا بێ‌ئەندازەی هەیبوو بۆ کارکردنە سەر هەستی خەڵك، کاریگەری خۆی هەبوو، بۆ ئەو حەماسەتە زۆرەی خەڵك پەیدایان کردبتوو بۆ وەرگرتنی بانگەوازەکە، بەشێوەیەك کەسێك ئەو بەهرەیەی نەبێت لەو ماوە کەمەدا ئەو خەڵکە زۆرەی بۆ کۆناکرێتەوە.

بەڵام با لەلایەکی ترەوە سەیری ئەو جەماوەرە بکەین، بۆ چ شتێك بەڕاستی کۆبوونەتەوە ؟

ئەو جەماوەرە ئەو کەسەیان دۆزیەوە کە لایەنی رۆحیان تێر بکات، بە ڕێگایەکی (ڕۆشنکەر) جیاواز لە کۆڕی یادەکان، کە بەشی زۆری خەڵك پەنایان بۆ دەبرد بۆ تێرکردنی لایەنی گیانی‌یان لای شێخەکانی تەریقەتی صۆفیگەریی، ئەو تەریقەتەی ڕۆشنبیرەکان لێیان دەسڵەمینەوە، بەڵام جێگرەوە(بدیل)ی ڕۆشنکەریان لێ ون ببوو، هەتا لە خودی پێشەوای شەهید و قسە کاریگەرەکانیدا دۆزیانەوە، کە گیانیانی تێر دەکرد هەر لەو کاتەشدا هۆشیاریی و بێداریی دەپاراستن، ئەو ڕێگایەی نوقمی ئەو سڕبوونە نەبوو، کە هەست و نەستی دەتاراند.. ئەو کەسەیان دۆزیەوە کە هیواکانیان بە گەڕانەوەی ئیسلام بۆ بژێنێتەوە، دوای ئەو تێکشکانە توندەی بە نەمانی خیلافەت توشی خەڵك بوو، هەروەها جەماوەر ئەوەی دۆزیەوە، کە پێویست بوو لە جۆرەها پیسی دەریان بهێنێ، کە کۆمەڵگەی پیس دەکرد، بۆ ئەوەی بیانگێڕێتەوە بۆ ئەو نمونە بەرزەی جاران و ڕەوشت باشیە.. هەموو ئەمانە بەبێ ئەوەی توشی هیچ مەترسیەك ببن، ئەو هەوڵ و کۆششەی کە دەیاندا، تەنها بریتی بوو لە ئامادەبوون و گوێگرتن!

بەڵام ئەو جەماوەرەی بەو ئاسانیە هات، هەر بەو ئاسانیە خۆی ڕۆیشت، کاتێ لەئاسۆدا سەرەتای مەترسیەکان دەرکەوت! ئەم جەماوەرە ڕۆیشت و نەگەڕاوە! چونکە بەبیریا نەدەهات ئامادەبوون و گوێگرتن تووشی هیچ مەترسیەکی بکات، بەهیچ جۆرێك ئامادە نەبوو خۆی بخاتە مەترسیەوە، ئەگەر ئەوەی بزانیایە یا پێشبینی بکردایە، هەر لەسەرەتاوە نەدەهات و بیری لە هاتن نەدەکردەوە!

پاش ئەوە ئەوانە بەدەوری پێشەوای شەهید مانەوە، کە خۆی پەروەردەی کردبوون و لەبەرچاوی خۆی بوون و هێز و توانای ڕاستی پێبەخشیبوون..

ئایا هاتنی ئەو جەماوەرە زۆرە و هەڵاتنی هەر لە یەکەم سەرەتای دەرکەوتنی مەترسیەکان، لە دەستکەوتەکانی بانگەوازەکە بوو، یان یەکێك بوو لە هۆیەکانی کۆسپ و ڕێگرتن؟

کاتێ کاردانەوەی دوژمن دەخەینە ڕوو، چاوێکیش بەم کارە دەخشێنین.. بەڵام لێرەدا هەڵوێستەیەکمان هەیە؛ لەم کاتە زووەدا چی وای لە بانگەوازەکە کرد ڕووبکاتە جەماوەر؟! ئەوەش خەیاڵێکە لە نیازپاکی بوو، کە گومانی چاك برا بە ئەحواڵی خەڵك، بڕوا وابوو کە خاڵی تێکچونەکەیان تێکچونی ڕەفتار بوو، ئەگەر بەقسەی کاریگەر ئامۆژگاری بکرێت کێشەکە چارەسەر دەبێت، ئەو جەماوەرە لەسەر ڕێی ئیسلام بەردەوام دەبێت، دەبێتە سەربازی دڵسۆزی بانگەوازەکە، یا بەلایەنی کەمەوە کەرەسەی خاون و چاکن بۆ بەسەربازبون، بانگەوازەکەش بەرەو ئامانجە داواکراوەکە دەیانجوڵێنێ!

لەسەرەتای کارەکەوە بۆ خاوەنی بانگەوازەکە ئاشکرانەبوو –وەك لە دواییدا بۆیان ئاشکرا بوو– کە خەوش(خلل)ەکە تەنها لە گەندەڵی ڕەفتاردا نیە، بەڵکو گەیشتبوە چەمکەکانیش، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە حوکم کردنی شەریعەتی خوا. بەڕاستی کارەکە پێویستی بە هەوڵ هەبوو بۆ گەیاندنی ڕاستی بە جەماوەر.. ئەوەش لەدواییدا دەرکەوت.[1]

بەڵام دوای ئەوی بانگەوازەکە چەند هەنگاوی نا، بۆ چون بەرەو (جەماوەر)، لەسەر ئەو ئەساسەی کە چاکە –بەئامۆژگاریکەر و شەحنی سۆزدارییی– ببن بە سەربازی دڵسۆز بۆ بانگەوازەکە، یا بەلایەنی کەمەوە کەرەسەی خاوی چاك بن بۆ بەسەرباز بوون... دوای ئەوەی ڕووی کردە جەماوەر و بەو شێوەیە کۆی کردەوە

---

١ پێشەوای شەهید لە ساڵی ١٩٤٨ زنجیرەیەك وتاری نوسی لەژێر ناونیشانی (معركة المصحف)، ئەوەی تێدا ڕون کردەوە کە ڕەوشی ئومەت ئیسلامی نیە، ئیسلامیش نابێ، تا تەنها یاساکەی حوکم دەکا و کاری پێ دەکرێ. ئەم واتایە بەم سنوردارکردنە، لە هێڵی ڕۆیشتنی بانگەوازیی یەکەم ڕوون نەبوو، سەرەتای قۆناخێکی نوێی ئاڕاستەکردن بوو. بەڵام ئەم زنجیرە وتارە بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی فەلەستین وەستا. پاشان لە فبرایەری ساڵی ١٩٤٩ پێشەوای شەهید تیرۆر کرا، بەر لەوەی پەیڕەوانی ئاڕاستەی نوێ وەربگرن.

و بەرەو گۆڕەپانی سیاسەت بزوێنرا، کە کاردانەوەی چاوەڕوانکراو و چاوەڕوان نەکراوی دوژمنی وروژاند.

جا کاتێ جەماوەر دەجولێ، دەسەلاتدارانی ناوخۆ پێی هەراسان دەبن، کاتێ بزوتنەوەی ئیسلامی لەیەك کاتدا دەسەلاتدارانی ناوخۆ و دەسەلاتدارانی جیهانی هەراسان دەکەن، دەسەلاتدارانی جیهانی زۆرتر پێی هەراسان دەبن. ! جابۆ ئەوەی لەسەر شێوە ڕاستەکەی هەست بەم کارە بکەین، پێویستە چەندەها لاپەڕە لەمێژوو بخوێنینەوە.

لەم دوو سەدەیەی دواییدا بەڕونی دەرکەوت، کە بارەکان(أحوال)ی جیهانی ئیسلام لە هەموو بوارەکاندا لە تێکچونی بەردەوام دان.. ئەو دەولەتە عوسمانی‌یەی، کە هەموو ئەورووپای لێ دەترسا و تۆقیبوو، دەسەلاتەکەی وردەوردە نەما و کەم دەبوەوە، هەتا وای لێهاتبوو روسیای قەیسەری پەلاماری زەوییەکەی دەدا، بۆئەوەی بتوانێ زەوییەکە بگەڕێنێتەوە، یا ئەو ویلایەتانە بگێڕێتەوە ژێر دەستی، کە لەدەستی دابوو، ولاتی بەلقانیش بە هاندانی ولاتە ئەورووپیەکان لێی هەلگەڕاوە، لەناو جیهانی ئیسلامیشدا لە کەمینە نەتەوەییەکان لێی هەلگەڕانەوە، دەولەت لەژێر پێی ڕوداوەکاندا بەم لاو ئەولادا دەکەوت.

بەلام ئوممەتی ئیسلامی حالی لەوە کەمتر خراپ نەبوو، دواکەوتوویی لە هەموو لایەکەوە دەوری دابوو، نەزانی، هەژاری، داخراوی لە ناوخۆ، لەسەر ڕوداوەکان کەنەفت و بێتوانا بوو.. لەو کاتەدا ئەورووپا بینی وا کاتی ئەوە هاتووە بەسەر دوژمنە دێرینەکەیدا زال بێت و لەناوی بەرێت، جا کۆبوەوەو کەوتە پیلان گێڕان، نەخشەی کێشا بۆ دەستگرتن بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامیدا، ملکەچ کردنی بۆ ولاتە ئەورووپیەکان کە پێیان دەوتن (ئیستعمار) لەگەل ئەورووپای خاچ پەرستیدا پاشان توخمێکی نوێی تر هاتە ناوەوە، ئەویش جولەکەی جیهانیی بوو، کە پلانی بۆ حسابی تایبەتی خۆی دادەنا، بەلام لەگەل یارمەتیدانی تەواوی خاچ پەرستەکاندا بوو، لەپێناوی دروستکردنی نیشتمانێکی جولەکە لە فەلەستین.

دوای ئەوەی سولتان عبدالحمید داوای جولەکەی ڕەدکردەوە، کە نیشتمانێکیان لە فەلەستین بۆ دابمەزرێنێت، بە تەواوەتی بەرژەوەندی جولەکەی

جیهانیی و صەلیبی جیهانیی یەکیگرت و پلانەکەیان بوو بەیەك پلان، هەرچەندە هەر پێزێکیان هەوڵی جێبەجێکردنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەدا.. پلانەکە لە هەموو ڕویەکەوە پتەو بوو، جێبەجێکردنیشی سەبارەت بە صەلیبی صەهیۆنی ئاسان بوو، بەهۆی ئەوەی نەتەوەی ئیسلامیی هۆشی خۆی لەدەست دابوو، ئەو عەزیمەتەی لەدەست دابوو کە خوا پێی ڕاسپاردبوو بە فەرموودەی: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ: با سستی ڕوتان تێنەکا و خەمیش مەخۆن، هەر ئێوەن کە سەر دەکەون، ئەگەر بڕواو بەخوا هەیە.﴾آل عمران:١٣٩.

ترسناکترین چەك کە دوژمن بەکاری هێنا بۆ دژایەتی ئیسلام -دوای ئەوەی ڕێی سەربازی و رامیاریان بۆ تەخت بوو- داگیرکردنی فیکریی بوو، کە ئامانجی لەناوبردنی بەرەنگاریکردنی داگیرکردنەکەی خاچپەرستی و زایۆنی بوو، بە لەناوبردنی عەقیدە لەناو دڵەکاندا و دەرچواندنی چەندەها نەوە، کە بەندایەتی بۆ ڕۆژئاوا قبوڵ بکات و پێی ڕازی بێت، ئەگەریش بە پەرۆش نەبێت بۆی و حەزی پێبکات، بە گومانی ئەوەی -هەوڵ دەدات بەسمەکانی بیکوژێت- بەرەو ڕێی ڕزگاربوون دەچێت!

لە خاچپەرستی زایۆنی شاراوە نەبوو، کە گەلانی ئوممەتی ئیسلام ڕۆژێك دێت وەئاگا بێتەوەو پاشکۆیی و سەرشۆڕی و زەبونی غەرب قبوڵ نەکەن، هەوڵیش دەدەن بۆ ڕزگاربوون، هەروەها خۆیشی بۆ ئەم کارە ئامادە کردووە، بە چاندنی تۆوی نیشتمان پەروەردەیی و نەتەوەیی و دروست کردنی چەند سەرکردایەتیەك، کە جەماوەر بە دەوریا بن و خۆیانی پێوە هەڵواسن، کە بە چاودێری ئیستعمار دروست بوون. ئەو بە ئاشکرا و نهێنی ئاراستەی دەکردن؛ هەتا بۆ ئەوەی ئەگەر شۆڕشێك دژی ئیستعمار ڕوویدا ئەو شۆڕشە داواکەی و ئامانجەکەی سنوردار بێت، ئەویش داواکردنی سەربەخۆیی سەربازی بێت یا سەربازی و سیاسی بەلایەنی کەمەوە لەڕواڵەتدا- بێئەوەی بیر لە سەربەخۆکردنی بیر و ڕۆشنبیریی و گیانی بکاتەوە، بەو شێوەیە شوێنکەوتنی ڕۆژئاوای هەر دەمێنێ، ئەویش لەڕێی ڕێکخراوی نیشتمانیی و قەومیی و (شۆڕشە ڕزگاریخوازەکان)دا، پاشان جەماوەر

له بێئاگایی خۆیدا چەپڵـە لێدەدات و هەڵدەپەڕێت بۆ ئـەو شـانۆیانەی کـە بـۆی نمایش دەکرێن.

بە کورتی ئەوەی کە خاچپەرسـتی و زایۆنـیزم(صهیونیـة) لێـی دەترسـێ و بـە هەموو هۆیەك هەوڵی ڕێگرتنی دەدات، پەیدابوونی ڕابونێکی ئیسلامیە، چونکە هەر ئەوەیە کە لەگەڵیا ڕێك ناکەوێت و لە نیوەی ڕێگاشدا ناگـەن بەیـەك، هـەر ئـەوەیـە دوژمن چاك دەزانێ چـەندە مەترسـی هەیـە بـۆ سـەر بەرژەوەندیـەکانی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ: ئەوانـەی کتێبمـان بـۆ ناردون لـە گـاور و جولەکـە ئـەو پێغەمبـەرە ﷺ دەناسـن وەك چـۆن منداڵـەکانیان دەناسن.﴾البقرة:١٤٦.

کاتێ بزوتنەوەی ئیسلامی لەسەر دەسـتی پێشـەوای شـەهید دەسـتی پێکـرد، جیهانی صەلیبی و صەهیۆنی بە ترسێکی دیـارەوە چاودێریـان دەکـرد و هـەوڵیان دەدا بزانن ترسناکیەکەی چەندە.

ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی، کە ناوی (جب) بوو –ڕۆژهەڵاتناسان دەزگای زانیـاری ڕۆشـنبیری صـەلیبی و صـەهیۆنی بـوون– کتێبێکـی نوسـیوە بـە ناونیشـانی (الإتجاهات الحديثة في الإسلام Modern Trends in Islam)–چاپی یەکەمی لـە ساڵی ١٩٣٦ز. دەرکەوت، لەو کتێبەدا باسی بزوتنەوەکەی (جمال الدینی ئەفغانی) و (محمد عبده)ی کردووە، کە بە حەماسەتێکی ڕواڵەتیەوە مەدحی دەکات، بـەڵام لـە یـەکێ لـە پـەراوێزەکاندا نوسـیویەتی: ((دوای ئـەمـە کۆمـەڵێکی تـازە سـەریان هەڵداوە بەناوی (إخـوان المسـلمین)ەوە، بـە سـەرۆکایەتی کابرایـەك نـاوی (حسـن البنا)یە، حوکم دان بەسـەر ئـەم کۆمەڵـەدا هێشـتا زووە، هەرچـەندە لـە ڕواڵـەتدا مەترسیەکی تایبەتی هەیە)).

لەم لێدوانەدا دەردەکەوێت، کە چەندە ترساون و ئـارەزوی زانینـی حەقیقـەتی ئەم کۆمەڵە پڕ مەترسەیە تایبەتیەیان هەبوە.))

کـاتێك خاچپەرسـتیی زایۆنـیزمیی دەیـانبینی ژمـارەی جـەماوەری دەوری بانگەوازەکە زیاد دەکات، خەڵك بەناوی ئیسلامەوە بە دەوریا کۆدەبنەوە، بە پێی سروشتی بارەکـە مەترسـیان زیـادی دەکـرد.. بـەڵام نـەیاندەزانی چـی لـە نـاخی

کۆمەڵەکەدایە، لە ئامادەکردنی ئەوپەڕی مەترسیی، ئامادەکردنی سەربازان بۆ بانگەوازیی، کە ئامادەبن لە پێناوی ئیسلام بمرن.!

بەڵام قونبلەکە لە ساڵی ١٩٤٨ تەقیەوە، لە شوێنێکدا تەقیەوە کە ترسناکترین شوێن بوو، هەروەها لە مەترسیدارترین کات بوو تێیدا بتەقێتەوە، ئەویش فەڵەستین بوو، لەکاتی ئامادەکردن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی جولەکەدا.

دەنگی تەقینەوەکە زۆر گەورەتر بوو، زۆر ترسناك تر بوو لەوەی خاوەن بانگەوازەکە لەو کاتە دایان نابوو.

بەڵام خاوەن بانگەوازەکە دوژمنایەتیی صەلیبی و صەهیۆنی بۆ ئیسلام دەزانن، دەزانن ترسیان لێی هەیە، دەزانن ئارەزووی لەناوبردنیان هەیە، دەزانن لایان ناخۆشە خەڵك بگەڕێنەوە ناوی، ئا ئەمە کارێکە لەوە روونترە کە باس بکرێت، چونکە لە بەڵگەنەویستەکانی هەستی موسڵمانە، بۆ هەر موسڵمانێك بەسە ئەم ئایەتانە لە قورئاندا بخوێنێ: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ: بەهیچ شێوەیەك گاور و جولەکە لێت رازی نابن، هەتا شوێن ئایینەکەیان نەکەویت.﴾البقرة:١٢٠.

﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا: ئەگەر چاکەیەکتان توش بێت لایان ناخۆشە، ئەگەر تووشی خراپەیەك هاتن پێی دڵشاد دەبن.﴾آل عمران:١٢٠.

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ: زۆر لە خاوەنی کیتاب حەزدەکەن، دوای بڕواهێنانتان بتانگێڕنەوە سەر بێبڕوایی، لەبەر حەسودیان پاش ئەوەی ڕاستیان بۆ دەرکەوت..﴾البقرة:١٠٩.

موسڵمان ئەوەی بەسە، کە ئەوانە لە کتێبەکەی خوادا بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو دژایەتیە بەردەوام هەیە و لاناچێت..

بەڵام هەستکردن بە چەندێتی ئەو دوژمنایەتیە و چەندێتی فێڵ و تەڵەکەی و درێژەی ئەو تەڵەکەیە و شوێنەکەی لەو کاتەی ئێستادا، کارێکی تری جیاوازە..

بەڵام ئـەوەی لـە ڕیـڕەوی ڕووداوەکـاندا دەردەکـەوێ ئەوەیـە، کـە مـەزەندەکردنی هەموو ئەمە، وەکو پێویست وردەکار نەبوە..

پلانەکەی جولەکـە -کـە صەلیبیـەت بـە هـەموو توانستیەوە هاوکاری کـرد- هـەموو شتێکی ئامـادەکرد، ئـەوەی کـە بـە خـەیاڵ دادەهـات، وەك بەراییـەك بـۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە.

کاتێ سوڵتان عبدالحمید ئەو ماڵە زۆرەی ڕەت کردەوە کە خستیانە بـەردەمی بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی جولەکە لە فەلەستین، کـە بریتـی بـوو لـە پێنـج ملیـۆن لیرەی زێڕی ئیسترلینی (ئەوکاتە سامانێکی زۆر و گـەورە بـوو) وەك بـەرتیلێك بـۆ گیرفانی خۆی، پاشـان بـەڵێنیان پێدا ڕوسـیا و بـەریتانیا و فەڕەنسا ڕازی بکـەن چیتر هەرێمەکانی سەر بـە دەوڵەتەکـەی نـەوروژێنن لێـی (ئەمـە گرفتـی ڕامیاری دەوڵەتەکەی بوو)، هەروا بەڵێنیان پێیدا، کە قەرزێکی زۆری درێژخایەنی بدەنـێ، بۆ بوژاندنەوەی باری ئابوری دەوڵەتی عوسمانی، کە لەژێر قەرزی زۆردا دەیناڵاند، (ئەویش گرفتی باری ئابوری دەوڵەتەکەی بـوو).. جـا هـەر لـەو کاتـەوە، جولەکـە نەخشـەی پلانێکـی ڕامیـاری درێژخایـەنیان دانـا، هـەروەك هرتـزل لــە کۆنگـرەی زایۆنی، کە لە شاری (بال) لە سویسرا ساڵی ١٨٩٧ز. بڕیاری لەسەردا، کـە پـەنجا ساڵ بوو.

عبدالحمیدیـان لابرد، جـەنگی جیهـانی یەکـەمیان پێکهێنا، بـۆ کۆکردنــەوەی ئەوروپای خاچپەرسـت بـۆ جـەنگی دەوڵـەتی عوسمـانی و لـەناوبردنی، ئـەو کاتـە پێیـان دەوت (پیـاوە نەخۆشـەکە)، پاشـان دوای لـەناوبردنی، مـیراتی پیـاوە نەخۆشـەکەیان بـەش کـرد، لـەنێوان هـەردوو دۆسـتەکەی جولەکـەی ئەوکاتـەدا فەڕەنسا و بەریتانیا (هەتا ئێستاش لەگەڵ گۆڕانی بنکەی قورسایی لە بـەریتانیا سەرۆکی (جیهانی ئازاد!)) بۆ ئەمریکا سەرۆکی ئێستا)، جا فەلەستینیان وا لێکرد -ببێتە شوێنی ململانێی داهاتوو- بکەوێتە ژێر ئینتدابـی بـەریتانیاوە، بـۆ بـەرایی دامەزراندنی دەوڵەتێك لەژێر سـایەی پەیمانەکـەی بلفـۆڕدا، کـە وتبـوی: بەڕاسـتی حکومەتی پاشـای خـاوەن شـکۆ بـەچاوی بەزەییەوە(!) دەڕوانێتـە دامـەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی جولەکە لە فەلەستیندا..

پلانە فێڵاویەکە بەوەوە نەوەستا، بەڵکو وڵاتەکانی چواردەوری فەلەستینی کردە چەند دەوڵەتۆکەیەکی دژ بەیەك و لەیەك دوری فرێدراو، بێکێش لە جیهانی جەنگ، نە لە جیهانی رامیاری و نە لە جیهانی ئابوریدا، جگە لە دروست کردنی ئەو کێشانەی نێوانیان لەسەر سنورەکانیان، جگە لە دروست کردنی کێشەی نیشتمانی و نەتەوایەتی، کە یەك لە یەکتری جیابکاتەوە.

فێڵ و تەڵەکەیان بەوەوە نەوەستا، هاتن بۆ دورخستنەوەی لاوەکانی وڵات لە کاری جدیەت، هەموو وەسیلەیەکیان بەکارهێنا، بە تایبەتی بۆ ئەوەی لەو کارانەیان دور بخەنەوە، کە ترسی ئەوە هەبێت کار بکاتە سەر پلانەکانیان. جا لەبەر ئەوەی لاوەکانی هەموو نەتەوەیەك وزەیەکی ترسناکن، گەر بەڕاستی و بەجدی ڕویکەنە کارێکی گەورە، لەبەر ئەوە هەموو هۆیەکانی گەمژەیی و ژنانەییان بەسەر لاوەکاندا زاڵ کرد، کە بە هۆیانەوە لاوەکان گوێ نەدەن بە کارەگرنگەکان و کارە نزمەکانیان لا گرنگ بێت. پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((إن الله يحب معالي الأمور ويكره سفاسفها: خوای گەورە کاری بەرزی لا خۆشەویستە و رقی لە کارە نزمەکانە)).[1] هات سینەما و شانۆ و رادیۆی بەسەریاندا زاڵ کرد – ئەو کاتە تەلەفزیۆن نەبوو، دوایی پەیدابو، جولەکە ئەوکاتە هێشتا ((شێتی تۆپی پێ))ی بڵاو نەکردبۆوە لەسەر ئاستی هەموو جیهان–. دووبارە کێشەی ((رزگارکردنی ئافرەتی)) بەسەردا زاڵ کردن بۆ ئەوەی کچان و کوڕان بە یەکەوە سەرقاڵ بکات، یەکەم جار پەیوەندی ((پاك!)) ببەستن و پاشان پەیوەندی تاوان، دەمارگیری رامیاری حیزبایەتی بەسەردا زاڵ کردن بۆ ئەوەی هەموو کات و کۆششێکیان لەناو بەرێت و بە گیرفانی بەتاڵەوە بۆی دەربچن، پاشان دەمارگیری ((رۆشنبیریی)) لەنێوان قوتابخانە جیاوازەکانی ڕۆژئاوای بۆ هێنانە کایەوە بۆ ئەوەی رۆشنبیری خۆیەتی بەدەست نەهێنن، هەروەها دەمارگیری ((هونەر)) لە نێوان ئەم گۆرانیبێژ و ئەو گۆرانیبێژی کوڕ و کچ، هەموو ئەمانەش کاری بێمانا و بێسودن!

پاشان لە کاتی دیاریکراودا، دوای پەنجا ساڵ بە تەواوی لەدوای کۆنگرەی

---

١ رواه الطبراني في معجم الكبير.

(هرتزل)ەوە، کە تێیدا ئاشکرای کرد، پێویستە دەوڵەتێك بۆ جولەکە دابمەزرێت دوای پەنجا ساڵ، دەوڵەتەکە راگەیاندرا، جەنگە شانۆییەکەی کە سوپا عەرەبیەکان پێی هەڵسان، بەرێگایەك هەڵگیرسا زۆر لە گاڵتەوە نزیك تر بوو نەك لە راستی، هەروا خیانەتکاریی و بازرگانی چەکی گەندەڵ(فاسد) دەستپێکرا، سوپاکە بەلای راست و چەپدا بزوا بۆ ئەوەی لەدواییدا لەسەر هێڵی دابەشکراو کە هەموویانی لەوەپێش لەسەر کۆبوون وەستان. !

ئا لێرەدا، لە نالەبارترین کاتی پلانەکانی دوژمن، قونبلەکە تەقیەوە، دەنگە ترسناکەکەی دونیای لەرزاند. پێشمەرگە موسڵمانەکان چونە گۆرەپانی جەنگەوە، جولەکە و صەلیبی جیهانی راستیەکەیانی بۆ دەرکەوت.. کە ئەو قونبلەیە چەندە ترسناکە، دەنگ دانەوەکەش لەسەر ئاستی هەموو جیهان چەندە ترسناکە، زۆر لەوە ترسناك تربوو، کە خاوەنەکانیان مەزەندەیان کردبوو..

کاتێ جولەکە لەگەڵ پێشمەرگە موسڵمانەکان بەریەك کەوتن، خێرا بۆیان دەرکەوت و زانیان ئەوانە جۆرێکی جیاوازن، جیاوازن لەو سوپایانەی هاتوون دەوری خۆیان ببینن لە جەنگە شانۆییەکەدا.. زانییان ئەوانە خاوەنی عەقیدەن، هاتون عەقیدەکەیان پاڵی پێوەناون، هاتون لەپێناوی عەقیدەکەیان بجەنگن و لە پێناویدا بمرن، سەخین گیانیان لەرێگای خودا ببەخشن.. ئەمانە ئەوانە بوون کە لەوەپێش لەمێژوودا ناسیبونیان.

ئەو کارە هەراسانی کردن و سەری سوڕماندن، چونکە بڕوایان نەدەکرد هەرگیز ئەو کۆمەڵە خەڵکە بگەرێتەوە.. بەتایبەتی لە میصردا، کە داگیرکاری فیکری کاری خۆی کردبوو لەسەردەمی هێرشەکەی فەرەنساوە، بۆ ئەوەی لە ئایینەکەیان دەریان بکات، بەڵکو هەتا لە عەرەبیەتیەکەشیان دەریان بکات لەژێر دروشمی (میصر بۆ میصریەکانە)، کە واتای ئەوە دەگەیەنێ بۆ عەرەبایەتی و ئیسلام بواری تێدا نیە.. هەراسان بونەکەیان زۆر بوو، بەبیردا نەدەهات، هەتا گەیاندبونیە ئەوەی دەنگی (الله اکبر ولله الحمد) زیرەی پیکردبوون، خێرا سەنگەرەکانیان چۆڵ دەکرد و چەك و تفاقەکانیان بەجێ دەهێشت، هەڵدەهاتن بۆ ئەوەی رزگاریان بێت..

ئەو کاتەی لە هەستیاندا بە تەواوەتی ڕون بووەوە، کە دەوڵەتی ئیسرائیل دانامەزرێ –بێجگە لە فراوان بونە دیاریکراوەکەی پاشەڕۆژی– هەتا بزوتنەوەی ئیسلامی زیندووبێت.. دەبێ بزوتنەوەی ئیسلامیی لەناو ببرێ، بۆ ئەوەی ئیسرائیل بژی، هێمن و ئاسایش بێت و جێگیر بێت، بەئارەزوی خۆی فراوان بێت، فەرمان لە صەلیبی صەهیۆنیەوە دەرچوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی (الاخوان المسلمین)، پاشان سەرۆکەکەیان کوژرا، پاشان ڕوداوەکان یەك بەدوای یەکدا ڕویاندا.

بەشێوەیەکی دڕندانە چارەی بزوتنەوەکە کرا، زۆر دڕندانەتر لەوەی پێشبین دەکرا.

هیچ کەسێك لەوانەی هەڵسابوون بە بانگەوازەکە، بە تەمای ئەوە نەبوو لە ئازاردان سەلامەت بێ، ئەوەش بەپێی ڕێوشوێنێ، کە هەیە لە حوکمی مەحاڵدا.. کەس بەتەمای ئەوە نەبوو ئازاردان بگاتە ئەو ڕادە دڕندانەیە کەوتەوە.. بەوەی بەڕۆژی ڕوناك لەسەر شەقام، گوللە بنرێت بە سەرکردەی کۆمەڵەکەوە، پاشان خەستەخانەکانیش نەیانویست فریای خوێن بەربونەکەی بکەون، بۆ ئەوەی بمرێ، ئەوەش بە فەرمانی دەوڵەت و پلانەکەی بوو.. هەتا هەزارەها گەنج و لاو بگیرێن و لە بەندیخانەکاندا ئەوپەڕی سزای توندوتیژ بدرێن بەشێوەیەك ئەوەندە دڕندانە سزا دەدران، کە دڕندەش بەزەیی پیانا دەهاتەوە.. ئەمانە هەمووی بەبیری کەسدا نەهاتبوو و کەس بیری لەوە نەدەکردەوە ڕوویدات.

بە سروشتی بارەکە شتێك ناتوانێ پاساو بۆ ئەو مرۆڤە دڕندانە و کارە دڕندانەیان بێنێتەوە، هەرچەندە هەوڵی شاردنەوەی تاوانەکانی بدات بەوەی گوایە، پارێزگاری ئاسایش دەکات، ئاشوب لەناو دەبات، یان هاوشێوەی ئەو بانگەوازانە، کە هیچ لە دونیادا دایناپۆشێ، لە ڕۆژی قیامەتیش ﴿يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ: خـــوا پاداشـــتی چاکەکانیان دەداتەوە و دەزانن بەڕاستی خوا هەقی ئاشکرایە.﴾النور:٢٥.

بەلام لەلایەکی ترەوە دەپرسین ئایا بزوتنەوەکە لەسەر بەرنامەیەکی ڕاست دەڕۆیشت، یان لە بزوتنەوەکەیدا پەلەی کرد، بەر لە کاتی خۆی دەستی پێکرد؟

کەس وا نەزانێت بزوتنەوەکە هودنـەی لەگەڵدا دەکرا، ئەگـەر ڕێگایـەکی تـری بگرتایە.. ئێمـە دەبینـین چۆن پیـاوە گـەورەکان، وەڵامـی شـوعەیبیان داوە ﷺ کاتێ پێی وتن ئارام بگرن، هەتا خوا حوکمی خـۆی دەکـات: ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾ ۞ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ: ئەگـەر کۆمـەڵێك لـەئێوە بـڕوای هێنـاوە بـەو شتانەی، کە منی پێ ڕاسپێراوە و هێندێکیشتان بڕوایان پێ نـەهێناوە، خۆڕابگرن هـەتا خـودا بۆ خـۆی لـە بـەینی ئێمــەدا داوەری دەکـا خـۆی چـاترین داوەرە. گرەگرەکانی هۆزی –کە لەخۆیان بایی بوبون– گوتیان: شوعەیب! ئێمـە تـۆش و ئەو کەسانەش وەك تۆ باوەڕیان هێناوە، لە شاری خۆمان دەردەکەین؛ یـان دێنـە سەر دینی مە. گوتی: ئەگەر حەزیش نەکەین؟﴾الأعراف:٨٧-٨٨.

نا! نەفامیی(جاهلیة) لە بەرامبەر بانگەوازی (لا اله الا الله) ناتوانـێ هـەڵکا، یا جەنگ بوەستێنێ، یا ئارامی لەسەر بگرێت.

ئێمە ناڵێین: ئەگەر بزوتنەوەکە لەسەر بەرنامەیەکی ڕاست بـەردەوام بایـە لـەو ئازارە ڕزگاری دەبوو، کـە دەکرێ بگاتــە ڕادەی تــەعزیب و کوشــتن، چونکـە کۆمەڵەی یەکەم، کە پێغەمبەرﷺ بەچاودێری خـۆی پـەروەردەی کردبـوو، لەسـەر گەورەترین بەرنامە بوو، کە بزوتنەوەکە دەیتوانی لەسەری بڕوات، چونکـە وەحـی پەروەردگار هەنگاو بـە هـەنگاو ئاڕاسـتەی دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ئـازاردان سەلامەت نەبوون، کە گەیشـتە ڕادەی تـەعزیب و دەربـەدەرکردن و برسـیکردن و کوشتن.. ڕۆیشتن لەسەر بەرنامەیەکی ڕاست بۆ ئـەوە نیـە ئەوانـە بپارێزێت، کـە هەڵدەستن بە بانگەوازەکە! بەڵکو ئەوەی داواکراوە ئەوەیە، کە لـەپێناوی خـودی بانگەوازەکەدا بێت، بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی بەتەواوی بـدات، پەیامەکـەش لەسـەر شێوەیەکی تەواو بگەیەنێت.

بزوتنەوەکـە بـە چـارەکردنێکی توندوتیـژ چـارەکرا، کـاتێك بنکـە پتەوەکـەی

لەسەر بناغەیەکی زۆر توند و پتەو دروست کرا، کۆمەڵێك پێشمەرگەی دڵسۆزی ئامادەی مردن لەڕێگای خوادا دەرچواند، کە لەپێناوی بانگەوازیی بۆ خوا ئازایانە خۆگر بن لەژێر سزا و ئازاردا.

قەومێك دەرچوو برایەتی بە یەکیەوە بەستبون لەبەر خوا، کە هاوتای زۆرتر بوو لایان لە پەیوەندی خوێن.. قەومێکی دەرچواند، کە مامەڵەیان پاك بوو، چونکە لەخوا دەترسان و کۆمەڵێکی ئیجابی لەناویاندا دەرچواند، ئامادەبوون کۆشش بکەن.. ئەوانە هەموو کۆمەڵێك سیفەتن پێویستن بۆ بنکەکە، بەڵام هەموو شتێکیش نیە، ئەوە بەتەنها بەس نیە بۆ پێکهێنانی بنکە خواستراوەکە.. ئەوانە تەنها چەند کەسێك نین خۆیان بۆ خوا خاوێن کردبێتەوە، خۆیان بۆ خوا نەزر بکەن.

ئەوانە بانگەوازن.. دەیەوێت ئوممەت بە تەواوەتی رزگار بکات لەوسوکی و داڕمان و داتەپیویەی تێی کەوتوە، بەهۆی دوریان لە ڕێگای خوا، ئەمەش کارێکە زۆر زۆری گەرەکە. لە بەشێکی داهاتودا باس لە پەروەردەی پێویست دەکەین، ئەوەی لە بانگەوازەکە پێویستە بۆ بنکەکە، یان بۆ ئەو جەماوەرەی بانگەوازەکەی پێ دەبزوێت.. بەڵام ئێمە لێرەدا توێژینەوەی هۆکانی پەلەکردن دەکەین، هەروا ئەو نیشانە و شوێنەوارانەش کە لەسەری پێك دێت.

بزوتنەوەکە بەردەوام بوو لەسەر ئاڕاستە کردنی جەماوەر، پێش ئەوەی بینای بنکەکە تەواو ببێت، هەروا بزواندنی جەماوەر پێش تەواوبوونی هۆشیاریی ئیسلامیی، لە جەنگێکی نا بەرامبەردا لەگەڵ دەسەڵاتداران بەریەك کەوتن.. جا لەسەر ئەمە چەند دەرەنجامێکی لێکەوتەوە، کە لە زۆر لایەنەوە خزمەتی بانگەوازەکە ناکات.. تەمی دەوری کێشەی (لا الـه الا الله) بەردەوام بوو، ئەگەر نەڵێین زیادی کردبوو بەهۆی تێکەڵ بوونی کێشە رامیاری و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان، پێش ئەوەی لە دڵی خەڵکدا ریشەکێش بکرێت -بەلایەنی کەمەوە بانگخوازەکان- لەسەر ئەوەی کە ئەوە بەندایەتی پاکە بۆ خوا، بە چاوپۆشین لەوەی لە ژیانی دونیا لێی دەکەوێتەوە لە دەرئەنجامی رامیاری، یان ئابوری، یان کۆمەڵایەتی.. پاشان ئەم کێشانە هەموو کاتێ، کە دەوریان دێ لە (لا

اله الا الله)وه هەڵدەقوڵێن، پەیوەستیشن پێوەی و لێی جیانابنـەوە و تـەریب نـین پێی و پێشی نەکەوتون.

لێرەدا لەبیرمان نەچێت پەلـەکردن لـە بزواندنـی جـەماوەر، پێش کـامڵ بونـی هۆشـیاریی ئیسـلامیی، ئەگـەر نـەڵێین پێـش ئـەوەی هۆشـیاریی ئیسـلامی لای جەماوەر دروست بێت، بە تەواوەتی پارت و کیانە عیلمانیەکانی هەراسان کردبوو، لەسـەر ئـەوەی جـەماوەر لەبـەر دەستیان نـەدەمان و پـەیوەندیان دەکـرد بـە بزوتنـەوە ئیسلامیەکە، لەبـەر ئـەوە هەستان بزوتنـەوە ئیسـلامیەکەیان لـەڕێگا ڕەسەنەکەی خۆیەوە گرت، بەوێنەیەك کە خۆیان دایان نابوو بۆ بەرەنگاربونەوەی دەیانوت: کوا ئەو بەرنامەیەتان بانگـەوازی بـۆ دەکـەن بـۆ ئـەوەی شـەرعیەت لـە دەسـت ئێمـە دەربێنـن، شـەرعیەتەکە بـە خۆتـان دەدەن؟ لـەپاش ئـەوە هـانی بزوتنەوە ئیسلامیەکە درا، کە بگەڕێت بـەدوای ئـەو بەرنامـەی وەلامـی تەحەداکـە بداتەوە، بۆ ئەوەی لە یەکلاکردنەوەی کێشە سەرەکیەکەی دوری بخاتەوە ئەویش کێشەی (لا اله الا الله) بوو.

بەڕاستی کێشەی (لا الـه الا الله) – بـە تایبـەتی لـە قۆنـاغی دروسـتبوندا– لـە هەستی خاوەنەکـەیدا ئەوانـەی، کـە لەسـەر بەرنامـەی ڕاسـت پـەروەردە دەکرێـن بەهیچ شـێوەیەك پـەیوەندی نیە بـەو ئەنجامانـەی، کـە لـە ژیـانی دونیـادا لێـی دەکەوێتەوە، نە دەسەڵات نە جێگیربوونی ڕامیاری، نە باش بوونی بـاری ئـابوری، نە خۆشگوزەرانی باری کۆمەلایەتی.. بەڕاستی هیچ لەوانەی لـە ژیـانی دونیـا لێـی ناکەوێتـەوە، بـەڵکو ئـەنجامی خاوەنـەکانی وەك سـەرئەنجانی سـیحربازەکانی فیرعەونی لێدێت، کاتێ ئیمانیات هێنا، کە بەشیان کوشتن و لەداردان بوو، یا وەك سەرەنجامی (اصحاب الاخدود)ی لێ دێت، ئەوانەی کاتێ بڕوایان هێنا سـەرجەمیان بـە زیندوویـی بـەئاگر سـوتێنران، بـوون بـە نمونـە بـۆ ئەوانـەی دوای خۆیـان، بەشەکەیان کە خۆیان پێـی ڕازیبـون ڕەزامـەندی خـوا و بەهەشـتی عەدەنـە، کـە جۆبار بەژێریا دەڕوات.

بەلام کۆکردنەوەی جەماوەر و پەلەکردن لە بزواندنی پێش پێگەیشتنی، بەڵکو پێش پێگەیشتنی بنکەکە خۆی بە تەواوی، بووە هۆی ئەو تارماییە زۆرەی دەوری

کێشە بنەڕەتیەکە، ببووە کۆڵەکەی بانگەواز بۆ ئیسلام کەوا جێبەجێکردنیی هەموو گرفتە رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان چارەسەر دەکات، ئەو کێشانەی کە خەڵك ئەمڕۆ بەدەستیەوە دەناڵێنن، پاشان گەڕان بە شوێن ئەو (بەرنامە کردەییە)ی، کە ڕوبەڕوی تەحەدا عەلمانیەکان دەبێتەوە.!

ئیسلام کە خۆی چارەسەرە، حەقیقەتێکی خواییە خوای پاك و بەرز خۆی دەستەبەریتی، خۆیشی بەڵێنی پێداوە و بەڵێنەکەشی ڕاستە: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ نیشتەجێی ئەو بازێڕانە ئەگەر خوایان بناسیبا و خۆپارێز بان، دەروازەی بەرەکەتانمان لە ئاسمان و زەمینەوە بەڕویاندا دەکردەوە.﴾الأعراف:٩٦.. ئەگەر بڵێین ئەو چارەسەرە تەنها گەیشتنی موسڵمانان بە حوکم دێتەدی، کارێکە بەڵگەی قورئان و سوننەتی لەسەر نیە، بەڵگەی ڕوداوەکانی مێژوی لەسەر نیە، چونکە موسڵمانان چەندەها ساڵ بەژیانی ناخۆشی و بێدەرامەتی ژیاون، دوای ئەوەی دەسەڵاتیشیان گرتۆتە دەست و ئەو دەوڵەتە ئیسلامیەشیان دامەزراندوە، کە بەیاسای خوا کاریان کردووە، بەردەوامیش بوو هەتا سەردەمی عومەرﷺ، خەڵکەکەش ئارامگر بوون لەژێر باری هەژاری و هەموو ناخۆشیەکاندا، لە بەر ئەوەی بڕوادار بوون، لەبەر ئەوەی خۆیان بۆ بانگەوازەکە نەزر کردبوو، لەبەر ئەوەی بە ئومێدی ڕۆژی دوایی بوون، سەیری هیچ خۆشیەکی ژیانی دونیایان نەدەکرد. ئا ئەوە ئەوەی بۆ ئەو بانگەوازە هێنایە دی، کە لە زەویدا ڕەگ دابکوتێ و بە دەسەڵات بێت و لە ئاسۆدا بڵاو ببێتەوە.

ئەگەر پێغەمبەرﷺ جەماوەری فریو دابایە بەوەی، ئەگەر ئیسلام دەسەڵات بگرێتە دەست هەموو گیروگرفتەکانی سەرزەوی چارەسەر دەکەن و بەخۆشی دەژین لەناو نیعمەتە خۆشەکاندا، بەوشێوەیە ئارامیان نەدەگرت لەسەر ئەو هەژاریەی توشیان بوو لەسەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامیدا، دوای ئەوەش چەندەها ساڵ ئەو ناخۆشیە هەر بەردەوام بوو، ئەوا ئەو بزوتنەوە ڕۆشندەرە دروست نەدەبوو، کە ڕوی زەوی وەرچەرخاند. کاتێ وا لە خەڵك دەگەیەنن-ئەوانەی دڵیان بۆ (لا اله الا الله) پاك و یەکلانەبۆتەوە- بەوەی ئەگەر

دەسەڵات کەوتە دەستی موسڵمانان، هەموو گیروگرفتەکانیان لە چاوتروکـاندنێکدا چارەسەر دەکەن، پاشان موسڵمانان چەند ساڵ حوکمیـان بەدەستەوە دەبێت، بەڵام گیروگرفتەکان چارەسەر ناکرێت، بەڵکو زۆر زیاتر دەبێت، ئەوەش لە ئەنجامی توندوتیژی صەلیبیەت و زایۆنیە لە جەنگا، ئایا خەڵك ئارام دەگرن، ئەوانەی لە دەرگای بەندایەتی پاکەوە بۆ خوا نەچوبنە ناو ئاینەکەوە، بەڵکو لە دەرگای بەرژەوەندی دونیاییەوە چوبنە ناوی؟ ئایا ئارام دەگرن لەسەر هەژاری و بێبەش بوون و جیهادی تاڵ، هەتا ئەو کاتەی بەڵێنی خوا بەجێدێ لەو کاتە دیاریکراوەی لای خوا دانراوە، یان هەڵدەگەڕێنەوە بەسەر ئەو حوکمەدا، کە ئەوەی بۆ جێبەجێنەکردن، کە لەپێناویدا هاتوون، لە پێناویدا لە سندوقەکانی هەڵبژاردندا دەنگیان پێداوە؟!

ئەم بانگەوازە یەکەمجار و پێش هەموو شتێك دەبێ بۆ ڕونکردنەوەی ئەرکی بەندەکان بێت بەرامبەر وەدیهێنەریان، ئەرکی بەندایەتی پوخت و تەنها بۆ خوا بێت، پابەندبون بەو یاسایانەی لای خواوە هاتون، بە چاوپۆشین لەو شتانەی کە لە ئەنجامی پەرستنی پوخت و تەنها بۆ خوا لەژیانی دونیای لێدەکەوێتەوە، لە دەستکەوت و زیان لێکەوتن.بەپێی حیسابی زەوی. لە ڕاستیدا پاداشت لە ڕۆژی دواییە، لەگەڵ ڕونکردنەوەی ئەوەی، کە خوا بەتایبەتی بەڵێنی داوە بەم ئوممەتە، کە جێنشینی و دەسەلات و ئاسایشیان لەژیانی دونیادا بۆ دێنێتە دی، بەڵام بە مەرجی ڕوون: کە خوا بە تاکیی بپەرستن بێ هاوبەش و پەرستنەکانیان تەنها بۆ ئەو بێت، نەك تەنها بەوەی بڕۆن بۆ سندوقەکانی هەڵبژاردن و زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بێنن، پاشان سوڵتە بگرنە دەست: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا: خـــوا بەوانەی لەئێوە بڕوایان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین؛ هەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین. دینەکەشیان –کە

خۆی پەسندی کردوە– هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە ئاسودەیی و ئارامی {تا} تەنیا من بپەرستن، هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور:٥٥.

بێگومان ئەگەر بانگەوازەکە لەسەر ئەو بنەمایە بێت، زۆر بەهێواشی دەڕوات، جەماوەریش لە ماوەیەکی کورتدا زۆر کۆنابێتەوە، بەڵام ئەوکاتەی بەدەسەڵات بوونی ڕاست بەپێی پەیڕەوی خوایی، بەپێی دەستوری خوایی دەست پێدەکات، قەدەری خوا جێبەجێ دەبێت: ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ: خوا زاڵە بەسەر کارەکانیدا، بەڵام بەشی زۆری خەڵك نازانن.﴾یوسف:٢١.

* * *

پاشان تەم و مژەکە جارێکی تر لە دوو لاوە زیادی کردووە: کاتێ هەندێ گروپی بزوتنەوەکە کەوتنە جەنگی خوێناویەوە لەگەڵ دەسەڵاتداراندا، کاتێکیش گروپەکانی تر چونە کۆڕەکانی پەرلەمانەوە! هەراسان بوونی صەلیبیەت و زایۆنی لە بزوتنەوەی ئیسلامی، بێجگە لە هۆکارەکانی تر؛ بووە هۆی گۆڕانی توندوتیژ لە سیاسەتی جیهانیدا، کە لێرەدا بواری درێژەپێدانی نیە، بەڵام دەبێ لێرەدا ئاماژەیەکی خێرا بکرێت بۆ ئەو شتەی کە تایبەتە بە جیهانی ئیسلامیەوە.

بەڕاستی بەریتانیا و فەرەنسا لە جەنگە گەورەکەی جیهانی دووەمدا(١٩٣٩–١٩٤٥) بە شەکەتی و ماندویی دەرچون، بەڵام ئەمریکا بە سەلامەتی تەواو دەرچوو، بێئەوەی کاولکاری جەنگ توشی ببێت کە شایەنی باس کردن بێت، ئەمە ئەمریکای فریو دا بۆ ئەوەی ببێتە سەرکردەی ناوزەد کراو بە ((جیهانی ئازاد))، جا دەسەڵاتی بەریتانیا و فەرەنسای لەو شوێنانە دەرکرد، کە خۆی دەسەڵاتی بەسەردا گرتبوون و خۆی جێی گرتنەوە، لەسەر دەستی چەند سەرۆکێکی کرێگرتەی ئەمریکا، کە پاڵەوانێتی درۆینەی دەخستە پاڵیان، لەبەرچاوی خەڵك وای دەردەخست ئەوانە تێکشکێنەری ئیستعمارن و ڕزگارکەری گەلانن لە شەڕەکاندا.. بەڵام ئەو گەمەیە کە لەوانەیە ژیربێژی(منطقي) بێت لەگەڵ ئەنجامەکانی شەڕەکەدا، کە ئامانجێکی تری شاراوەی هەبوو، کە صەهیۆنی و صەلیبی هەنگاویان بۆ ناوەو لەگەڵ یەك ڕێکیان خستوە، ئەویش لێدانی بزوتنەوە

ئیسلامیەکانە لە ناوچە عەرەبیەکاندا بە تایبەتی بۆ دابین کردنی ئاسایشی ئیسرائیل بۆ ئەوەی بواری هەبێت جێگیر و بەتوانا بێت وەك خۆی دەیەوێت لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا فراوان بێت، دوای ئەوەی لێدانی یەکەمی ڕون بووەوە، کە پێشەوای شەهیدی تێدا کوژرا و چەندەها لاوی تێدا سزادرا، لێدانی لەناوبەر نەبوو، بەڵکو وەك ئەوە وابوو توێشویەك بێت بۆ بزوتنەوەکە، کە لە هەرچوار لاوە کڵپەی بزوتنەوەکە و فراوانی زیاتر کرد.

لەپێناوی ئەو ئامانجەدا بە بایەخەوە سەرۆکی پێویست هەڵبژێردران، هەمویان لە عەسکەریی هەڵبژارد، هەموو عەسکەریەکیش چاك نیە بۆ ئەو کارە مەترسیدارە، دەبێ هەر ئەم سێ مەرجە سەرەکیەیان تێدابێت: شێت بوون بە دەسەڵات، دڵڕەقی، ڕق بوون لە ئیسلام، وەك چاوکردن لە نمونەی یەکەم، کە کەمال ئەتاتورك بوو –جێی بڕوای خۆیان بوو–!

کاتێ ئەو سیفەتانە لە کەسێکی دیاریکراودا دێتە بوون، ڕاستەوخۆ زۆر بە توندیی ڕوودەکاتە لێدانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان! لەگەڵ ئەوەشدا کاروبارەکان بۆ ڕێکەوت واز لێنەدەهێنرا، بەڵکو دیراسەی دەکرا و دادەنرا بۆ خستنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان[1] و کوشتنی سەرۆك و پێشەواکانی، هەروا گرتنی هەزارەها لەلاوەکانی و سزادانیان بەشێوەیەکی وا دڕندە، کە باس کردنی موچڕك بە لەشی مرۆڤدا دێنێت..

لێرەدا ((حیکمەتەکە!)) لەوەدا دەردەکەوێت، کە عەسکەریەکان هەڵدەبژێرن، نەك مەدەنیەکان، چونکە لەگەڵ عەسکەرتاریدا هەموو شت، یاسا، سەربازیەکان، دادگای عەسکەری، توندوتیژی، ئیجرائاتی جەرگبڕ، بە ڕێکوپێکی بۆیان بەڕێوە دەچێت.. بەڵام ئەگەر مەدەنی بونایە بۆ ئەنجامدانی تاوان ئەو جورئەتەیانە نەدەبوو، نە ئەو هێزەیان دەبوو بۆ تۆڵەسەندنەوە و نە ئەو دڕندایەتیەیان دەبوو، نە ئەو تۆقاندنەیان دەبوو.

بەو شێوەیە کوشتاری موسڵمانان لە هەموو ئەو وڵاتانەدا بەردەوام بوو، کە

---

١ وەك ڕێکخستنی ڕوداوی (المنشیه) بۆ عبدالناصر لەپێناوی کوشتارەکەی ١٩٥٤-١٩٥٥ گەلێ ڕوداوی تر.

عەسکەرتاریی دەسەڵاتی بەدەست بوو، نابێت ئەوانە هەمووی بەرێکەوت بن، بەڵکو بە مەبەست و پلان و نەخشەوە بووە. جا ناوچەکە توشی سزایەك بوو سزایەکی درندانە، کە لە مێژوودا وێنەی نەبوە، مەگەر لە دادگا تەفتیشیەکانی ئەندەلوسدا هەبوبن، کە بە تەواوەتی ئامانجی لەناوبردنی ئیسلام بووە، لێدانەکان بەدوای یەکدا بەردەوام بوون.. چەند ساڵێك تێنەدەپەڕی -جاری وا دەبوو چەند مانگێك- سەیرت دەکرد کوشتارێکی تر لێرەو لەوێ دەستی پێدەکرا، دەنگی بەناو جیهاندا بڵاو دەبووەوە، لەخۆشیا صەهیۆنی و صەلیبی دەکەوتنە سەماکردن، لەخۆشی سەرکەوتنی (کوڕەکانیان) لە جێبەجێکردنی ئەو کارەی، کە (دایکی) خۆشەویستیان دابوی بەسەر شانیاندا دەستیان دەهێنا بەدەستیانا !

لە ئەنجامی ئەو ڕەوشە پڕ ئازارەدا دوو باڵی جیاواز لە ڕوانگەدا لەناو ریزی بزوتنەوەکەدا-بەڵکو دژ بە یەك- دروست بوو، یەکەمیان باڵی لاوان، کە ئەوەی سەربازەکان پێی هەڵسابوون ڕقی هەڵساندبوون، بڕیاریاندابوو کە دەبێ ڕەدی ئەو توندوتیژیە بە توندوتیژی بدرێتەوە، بە گومانی ئەوەی لە کۆتاییدا بەرگریی چەکداریی کۆتایی بە توندوتیژی سەربازی دەهێنێت، ناچاریان دەکات -یا گەورەکانیان ناچار دەکات- بۆ گۆڕینی شێوازەکانیان.. ئەوەی تریان باڵی پیرەکان بوو، کە لێدانە دوابەدوای یەکەکە شەکەتی کردبون؛ ڕێگای سەلامەتی‌یان هەڵبژارد بەوپەڕی تواناوە بڕیاریان دا بچنە ناو گەمەی ((دیموکراتیەکەوە)) بۆ ئەوەی پێیان نەڵێن ئەوانە لایەنگری توندوتیژین.. جا هەردوو باڵەکە بونە هۆی زیادکردنی تەم و مژ لە دەوری کێشەی (لا اله الا الله)دا.

بەچاوپۆشین لە هەموو ئەو پاساوانەی هەردوو کۆمەڵەکە دەیانهێناوە بۆ بێتاوانکردنی ڕێگاکەیان، ئێمە لێرەدا باسی ئەو ئاسەوارانە دەکەین، کە هەر لە سەرەتاوە لە ئەنجامی پەلەی بزوتنەوەکە بەدیهات، کە کۆمەڵێ ڕێگری تازەی خستە سەر لیستی ڕێگرەکانی تر، زۆرتر لەوەی یارمەتی‌دەر بێت بۆ بزوتنەوەکە، بۆ ئەوەی بەرەوپێشەوە بڕوات. هەرچەندە لەبەرچاوی خاوەنەکانیدا وادەرکەوت، هەنگاوی ئیجابی و بەکەڵك بوون بۆ بزوتنەوەکە و نزیك خەرەوە بوون بۆ ئامانجە داواکراوەکە.

ئەگەر وامان دانا ڕەوشی بانگەوازەکە ئێستا نزیکترین شتە لە ڕەوشی کۆمەڵـە موسڵمانەکەی مەککە لەگـەڵ هـەندێ جیـاوازیدا، ئـەوا پـەنا بـردن بـۆ توندوتیـژی خزمەتی بزوتنەوەکە ناکات، تەمومژ بە دەوریا زۆرتر دەوروژێنێ لـەوەی کێشـەکە ڕۆشـن بکاتـەوە و بـۆ خـەڵکی ڕون بکاتـەوە. لـەبیرمان نـەچێ ڕوون کردنـەوەی حەقیقەتی مەسەلەی (لا اله الا الله) ڕەگەزی بنەڕەتی هەموو بزوتنەوەکەیە، جا چ سەبارەت بە جەماوەر بێت یا بنکەکە وەك یەکە. بەڕاسـتی نـاکرێ پێشـکەوتنێکی ڕاست بەدەست بێت لەسەر ڕێڕەوی بانگەوازەکە، هەتا ئەو کێشەیە بە تـێڕوانین و ڕەفتار لە هەستی خەڵکدا جێی خۆی نەکاتەوە.

کاتێ دەچینە ناو جەنگێکی نابەرابەر دژی دەسەلاتدار و پێش ئەوەی کێشـەی ((شـەرعیەت)) لای خـەڵك دیـاری بکرێـت، دوو شـت بـە یەکـەوە ڕوودەدەن، کـە هەردوکیان بەیەکەوە زیانبەخشن بە بزوتنەوەکە:

یەکـەمیان: کێشـەکە دەگۆڕێـت –دوای ماوەیـەك ئەگـەر ململانێیەکـە کـەم بخایەنێت یا زۆر– بۆ کێشەی لێدەر و لێدراو، سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو، پاش ئـەو هەموو ململانێیەی لەسەری دەکرێت کێشە بنەڕەتیەکە هـەر لـەبیر دەچێتـەوە یـا دەخرێتە پـەراوێزەوە.

ئێمە لێرەدا دوو کێشەمان هەیە: یەکـەمیان کـێ بەڕاسـتی شـایانی پەرستنە؟ خوای تاك و تەنها یان چەند خوایەکی ساختە؟ ئەمەش کێشەیەکە لـە نـاوەڕۆکیدا کۆمەڵێ کێشە هەڵقولاوە.. دوەمیان کێشەی کێ یاسادانەر(المشـرع)ـە: ئایا خـوا دانەری یاسایە، یـان مـرۆڤ؟ کـێ بڕیـاردەری بـەهاکان(قیم)ە؟ کێیـە بڕیـاردەری پێوانەکانە؟ کێ دانەری بەرنامەیە بۆ خەڵك؟ ئەوانە کۆمەڵێك کێشەن –لەو کاتەوە مرۆڤ پێی ناوەتە سەر ئەم زەویە و بەردەوام دەبێت هەتا قیامـەت هەڵدەسێت– شوێن ململانێی نێوان نەفامیی و ئیسلامە، لە نێوان ئـەهلی حـەق و ئـەهلی باتڵـە، هـەر ئـەو کێشـەیەش بـووە، کـە لـەپێناویدا پێغەمبـەرەکان نێرراون و سروشـیان لەپێناودا هاتۆتە خوارەوەو بەهەشت و دۆزەخ دانراوە.!

دووەمیان: ئێمە هەلێکی گەورە دەڕەخسێنین بـۆ ڕژێمـە دژ بـە ئیسـلامیەکان، هەرچەندە ئەوان بە خەڵك دەڵێن دژی ئیسلام ناوەستین و شەڕی لەگەڵدا ناکـەین،

بەڵکو شەڕ دژی ئەو ئیرهابە دەکەین، کە ئیسلام بڕیاری لەسەر نادات، جەماوەریش بڕوای پێدەکات دوای ماوەیەك کورت خایەن بێت، یا درێژخایەن!
لەوەدا زیانێکی تەواو لە بانگەوازەکە دەکەوێت، چونکە هەڵوێستی ڕاستی ئەو ڕژێمانە دادەپۆشێت و لە هەستی خەڵکدا کێشە شەرعیەکە مەیینی دوادەکەوێت، چونکە ئەمە لە کێشە سەرەکیەکانە، کە لە کۆتاییدا چارەنوسی جەنگەکەی لەسەر دەوەستێ لەنێوان نەفامیی و ئیسلامدا.

هەروەها کاتێ دەچینە ناو گەمەی ((دیموکراتیی))، لە کێشەی (لا الە الا اللە) زۆر شتمان لەدەست دەچێت.

یەکەم شت کە لەدەستمان دەچێت؛ گۆڕینی کێشەی سەپاندن(الـزام)ە بۆ کێشەی هەڵبژاردن، کە جەماوەر ئەوە هەڵدەبژێرێت، خوای پاك و بەرز دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ بۆ هیچ بڕواداریکی ژن و پیاو نیە کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی حوکمێکیان دا، ئەوان بە ئارەزووی خۆیان فەرمانێکی تر هەڵبژێرن.﴾الأحزاب:٣٦.

بەڕاستی مەسەلەی پەرستنی خوای تاك و بێهاوبەش، بریتییە لە کێشەی (لا الە الا اللە)، واتا لە بیروباوەڕدا خوا بە پەرستراو دابنرێت، هەر ئەو پەرستراوە لە دروشمەکانی پەرستندا، هەر ئەویشە یاسادانەر، هەر ئەو بڕیاردەری بەهاکان و پێوانەکانە، هەر ئەو دانەری بەرنامەی ژیانی خەڵکە.. ئەوە کێشەی سەپاندنە نەك موسڵمان هەڵبژاردنی خۆی تێدابێ، چونکە دانی بە ئیسلام داناوە، بەڵکو ئەوە کێشەی سەپاندنە بۆ هەموو ئەوانەی بە زمان وتویانە (لا الە الا اللە). هەرچەندە ئەو کەسە لە دڵدا دووڕوو بێت و ڕقی لە ئیسلام بێت، جا ئەگەر ئەو کەسە پشتی کردە شەریعەتەکەی خوا، ئەو کەسە بە داننانە زمانیەکەی دەگیرێت، پاشان بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دادەنرێت:

﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ

لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ: دەڵێن بڕوامان بەخوا و بەپێغەمبەر هێنا و ملکەچی فەرمانەکانیانین، پاش ئەوە کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن، ئەوانە هەر بڕوادار نین، ئەگەر بانگ بکرێت بۆ ئەوەی خوا و پێغەمبەر حاکم بێت لەنێوانیاندا، کەچی کۆمەڵێك لەوان پشت هەڵدەکەن.﴾النور:٤٧-٤٨.

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: نا سوێند بەخوا بڕوادار نابن، هەتا تۆ نەکەنە داوەر لە کێشەکانیان، پاشان هەرچی حوکمێکت دا ئەوان هەست بەگرێ نەکەن لە دەرونیاندا و خۆیان تەسلیم دەکەن بە تەواوەتی.﴾النساء:٦٥.

کاتێ دەچینە ناو گەمەی دیموکراتیەوە، یەکەم شتێك کە دەیکەین، گۆڕینی ئەم سەپاندنە خواییە بۆ کێشەیەك، کە ڕای خەڵکی تێدا وەردەگیرێ، رای لەسەر وەردەگیرێت بۆ پەسندکردنی یا پەسند نەکردنی، لەگەڵ هەل دان بەو کەسانەی دەڵێن: ئێوە کەمینەن، کەمینەش بۆی دروست نیە ڕای خۆی بسەپێنێ بەسەر زۆرینەدا، کەواتە ئەوە مەسەلەی ڕایە نەك مەسەلەی سەپاندن، مەسەلەیەکە چاوەڕوان دەکرێ ئەو دەنگانەی لە سەری ڕێکن، بگاتە بڕێکی دیاریکراو هەتا بڕیار بدات.

بەچاوپۆشین لەوەی نەفامەکانیان کردیان لە جەزائیر، کاتێ دەنگەکان گەیشتنە ڕادەی پێویست -ئەوە وانەیەکە پێویستە هیچ کەسێك لەوانەی جارێ پەیڕەویی ئەم ڕێگایە دەدات، لە دەلالەتەکەی بێئاگا نەبێت،- پێویستە کێشەکە سنوری بۆ دابنرێت لەسەر بنەڕەتێکی جیاواز.. بەڕاستی شەریعەتی خوا کردنە حاکم سەپاندنێکی خواییە، پەیوەندی بە ژمارەی دەنگەکانەوە نیە، هەڵبژاردنی خەڵکی تێدا نیە، کە ئایا وەری دەگرن یا وەری ناگرن، چونکە ئەوان خاوەنی ئەوە نین وەری نەگرن و پاشان بە موسڵمانی بمێننەوە!

جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی ئیسلام لە زەویدا دامەزرێت و -دوای ویستی خوای بەرز- لەسەر بوونی بنکەیەکی بڕواداری قەبارە دیاریکراو، کە دەتوانێ ئەو

سەپاندنە خواییە لە واقیعدا بێنێتە جێبەجێکردن و لەنێوان ئەوەی خودی سەپاندنەکە جێی سەرنج بێ! جێی ڕاوەرگرتن بێ! جا چ بتوانین لە واقیعدا بەجێی بگەیەنین، یا نەتوانین لەبەر لاوازیمان و بێهێزی و بێدەسەلاتیمان بەسەر خەڵکدا، هەروەك باری موسڵمانان لە مەککەدا.. پێویستە بانگەوازەکە بخرێتە پێش چاوی خەڵك لەسەر ئەو بنەڕەتە: کە ئەوە سەپاندنێکی خواییە، ئەو کەسەی نەریّ بکات و بەلاوەی بنێ؛ لە حوکمی خوادا هەڵگەڕاوەیە، خەڵك هەموو داوایان لێکراوە بەجێی بگەیەنن، بە فەرمانڕەوا و فەرمان بەسەرداداروەوە، جا دەستەیەك یان کۆمەڵێك هەبێت، یان نەبێت داوای لێکراوە؛ چونکە لە سەر داوای کەس لە ئادەمیزاد نەوەستاوە، دوای ئەوەی پەروەردگاری جیهانیان داوای کردوە لە بەندەکانی بەشێوەی فەرمانی سەپێندراو.

ئەو واتایە بە تەواوەتی لە هەستی خەڵکدا دەشارێتەوە -یا لە کەمێکدا شەحنە کاریگەریەکەی ون دەکات- کاتێ دەچینە ناو گەمە دیموکراتیەکەوە، کە بڕیار دەدات هیچ شتێ ناسەپێندرێ، مەگەر زۆرینەی دەنگەکان بڕیاری لەسەر بدەن.

دووەم زیان کە توشمان دەبێت کاتێ دەچینە ناو گەمەی دیموکراتیەوە، خاوکردنەوە و تواندنەوەی شەرعیەتە، شەرعیەت لە دیموکراتیدا بۆ ئەو کەسانەیە، کە زۆرینەی دەنگەکان بەدەست دەهێنن، ئەوە پێوانەی خوایی نیە؛ بەڵکو پێوانی خوایی -وەك لەبەشی پێشوو باسمان کرد- شەریعەتی خوا حاکم بێت، هەر کەس ڕوو وەردەگێڕێ لەوەی، کە شەریعەتی خوا حاکم بێت، لە ئایینی خوادا شەرعیەتی بۆ نیە. ئەگەریش هەموو دەنگەکانی بەدەست هێنابێ نەك زۆرینەی دەنگەکان، لێرەدا دوریانی توند هەیە لەنێوان ئیسلام و دیموکراتیدا.

کاتێ دەچینە ناو گەمەی دیموکراتیەوە، دەبێ دان بنێین بە شەرعیەتی ئەو کەسەی زۆرینەی دەنگەکان بەدەست دێنێ، ئەگەریش کار بە شەریعەتی خوا نەکات، چونکە ئەوە یاسای ئەو گەمەیەیە، کە ناتوانین پێچەوانەی بکەین، ئەو کاتەش دەکەوینە ناو قەدەغەی عەقیدەیی، ئەویش شەرعیەتە بە کارێك، کە خوا دەربارەی فەرمویەتی کوفرە، ئەویش دانانی یاسای دەستکردی مرۆڤە.

هەرچیمان وتبێت بەنهێنی و ئاشکرا: ئێمە رازی نین جگە لە یاسای خوا، ناچار دەبین ملکەچی یاسای دیموکراتیەت بین، لەبەر ئەوەی بە گەمەکە رازی بووین، بەڵکو زۆرکات داوامان لێدەکات کە رێمان پێبدرێت یاری تێدا بکەین، ناڕەزایی دەردەبڕین کاتێ لەو هەقە بێبەش دەبین.

دوژمنەکانمان کەوتنە ناو گێژاوی دیموکراتیمانیان لەدەست نەچووە تا بەکاری بێنن بۆ ئەوەی ناچارمان کەن و بمانخەنە تەنگژەوە و زیاتریشی بکەن و پێمان بڵێن: هەڵوێستمان چیە ئەگەر بەشداری هەڵبژاردنتان کرد و دەرنەچوون، جگە لەئێوە دەرچوون ئەوانەی بە شەریعەت حوکم ناکەن؟ ئێمەش وتمان -چەند جێی سەرسوڕمانە- رێزی ڕای ئوممەت دەگرین!! ئەگەر دووبارە لێیان پرسین: ئەگەر حوکم بەدەست ئێوە بوو خەڵك حەزی بەئێوە نەکرد، دەنگی بە جگە لەئێوە دا، ئێمەش وتمان -چەندە جێی سەرسوڕمانە-: ملکەچی بڕیاری ئوممەت دەبین. ئەدی ئەگەر بڕیاری ئوممەت پێچەوانەی ئەوەبوو، کە خوا بڕیاری داوە؟!

چ تواندنەوەیەکە بۆ کێشەی (لا اله الا الله) و کێشەی شەرعیەت لەوە توندترە؟

لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی چوینە ناو گەمەکەوە دەرچونمان نیە لەوەی یاساکەی قبوڵ نەکەین، چونکە ئەوە خواستی مەنتیقە، ئێمە کاتێ بۆمان هەیە یاساکە رەفز بکەین، کە لە بنەڕەتدا هاوبەشی گەمەکە نەکەین. ئێمە لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ خەڵکیدا ڕاستبێژین، کاتێ پێیان دەڵێین: ئێمە هاوبەشی گەمەکە ناکەین، چونکە یاساکەی پێچەوانەی ئەوەیە خوا دایناوەو بەندەکانی پێوە پابەند کردوە.

ئێمە کاتێ ئەوە دەڵێین، دوژمنەکانمان دەربارەمان دەڵێن: ئێوە دیموکراسی نین، ئێوە دوژمنی دیموکراسین، ئێمەش پێیان دەڵێین: بەئارەزووی خۆتان چی دەڵێن بیڵێن، ئەو رژێمەمان قبوڵ نیە، کە لەسەرەتاوە مافی یاسادانان دەداتە دەستی مرۆڤ، کە پێچەوانەی یاسای خوایە، چونکە ئێمە ئەگەر ئەوەمان قبوڵ کرد موسڵمان نین! ئەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەرمان ئیسلامە، نەك دیموکراسیی، ئەوەی خوا سەپاندویەتی بەسەرماندا ئیسلامە نەك دیموکراسیی. ئەوەی خوا لە ڕۆژی دوایی لەسەری لێمان دەپرسێتەوە ئیسلامە نەك دیموکراسیی

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ: له لای خوا دین ئیسلامه.﴾آل عمران:١٩.

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ: هەر کەس جگە لە ئیسلام بکاتە ئایینی خۆی، لێی وەرناگیرێت و لە ڕۆژی دواییدا لە زیانبارانە.﴾آل عمران:٨٥.

لە ئیسلامدا ڕاوێژ(شوری) هەیە، بەڵام ڕاوێژ دیموکراسیی نیە، جا ڕاوێژ لەڕێگا ڕاستەکەیدا بۆ پیادەکردنی دەقە، هەروا ئەوی موسڵمانان ئیجتهادی تێدا دەکەن ئەو مەسەلەیە کە دەقی لەسەر نیە،[1] بەڵام دیموکراسی هەز لەسەرتاوە حوکم کردن دەخاتە دەستی مرۆڤ، ڕازی نابێ لەسەر ئەوەی حوکم شایستەی خوای تاك و تەنها و بێهاوبەشە!

ئای! دیموکراسیەتی ئەوان و ڕاوێژی ئیسلام چەند لەیەکەوە دورن: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئایا حوکمی نەفامیان دەوێت، کێ حوکمەکەی چاکترە لە حوکمی خوا بۆ قەومێك بڕوا بهێنن.﴾المائدة:٥٠.

ئەگەر لە چونمان بۆ ناو گەمەی دیموکراسی زیانمان لێ نەکەوت، جگە لە خاوکردنەوە و تواندنەوەی کێشەی (لا اله الا الله) و کێشەی شەرعیەت، هەر ئەوەمان بەس بوو بۆ خۆ نەخستنمانە ناو گەمەکەوە، ئەو سودە کەمە چیە کە دەکرێ بەدەستی بهێنین لە چونمان بۆ ناو پەرلەمان، کە کاتێکیش نامێڵرێ بچینە ناویەوە دەیدۆڕێنین.

خوای گەورە ئارەق و قوماری حەرام کردووە لەگەڵ ئەوەی –بەدەقی قورئان– سودیان بۆ خەڵك تێدا هەیە، کەچی حەرامیشی کردووە، وەك ئایەتەکە بەڕوونی دەری خستووە، چونکە خراپیەکەیان لە سودەکەیان زۆرترە:

---

١ سنوری ئیجتهاد لە فیقهی ئیسلامیدا ناسراوە ئەویش ئەوەیە، کە حەڵاڵ حەرام نەکات و حەرام حەڵاڵ نەکات، لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەت وەبەریەك ڕانەچێ، بوارەکەشی زۆر فراوانە هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە، کە لەژیانی ئومەتدا دەبن، بەڵام ڕێکخراوە بە ڕێکخەرەکانی یاسای خودا.

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا: دەربارەی ئـارەق و قومـار پرسـيارت لێدەكەن، پێيان بڵێ ئەو دوانە خراپيەكی زۆريان تێدايە و سود و كەڵكيشـيان تێدايە، بـەلام خراپەكەيان گەورەترە لە كەڵك و سودەكەيان.﴾البقرة:٢١٩.

ئەوە ڕێسا(قاعدة)يەكی فيقهی‌يە، كە بەهۆيەوە لەو شتانەدا ڕێنمايی دەكرێين، كە دەقێكيان لەسەر نەبێت. كێشەی پەرلەمان و چونـە نـاوی دەقـی لەسـەر نيـە، بەلام باش وردبوونەوە لەكێشەكە دەمانگەيەنێتە ئەوەی كە تواندنـەوەی كێشـەی (لا الـه الا الله) و پێويسـتيەكانی و تواندنــەوەی كێشــەی شــەرعيەت، كاريگــەری پێچەوانەی دەبێ بۆ سەر بانگەوازەكە؛ چونكە هۆشياريی جەماوەر لەم دوو كێشە سەرەكيەی بانگەواز پەرش و بڵاو دەكات، كە ئەوانيش بريتين لە: حوكم كردن بـە شەريعەتی خوا سەپاندنێكی خواييە و ڕای خەڵكی تێدا وەرناگيرێت، سـەرچاوەی سەپاندنەكە تێيدا ئەوە نيـە، كـە زۆرينـەی خـەڵك پێـی ڕازی بن، يـان ڕازی نـەبن، بەڵكو سەرچاوەی سەپاندنەكە تێيدا ئەوەيە، كە ئێمە موسڵمانين، يا تەنها گوتمان ئێمە موسڵمانين.. بەڕاستی شەرعيەت لە ئايينی خوادا پەيوەندی نيە بـە ژمـارەی ئـەو دەنگانـەوە فـلان و فـلان بەدەسـتی دەهێنـن، بـەڵكو ژمـارەی دەنگـەكان بەستراون بە كەسـێتی ئـەو حاكمـەی، كـە ئوممـەت هـەڵی دەبژێرێ بـۆ جێبـەجێ كردنی شەريعەتی خوا، نەك بەجۆری ئەو حوكمەی حاكمەكە دەيكات، كە كـەس مافی هەڵبژاردنی نيە، جا حـاكم بـن يا ژێردەستەكان بـن، دوای فـەرمانی خـوای سەپێنەر بە جێبەجێ‌كردنی شەريعەت، حوكمی خواش ئاشكرايە بۆ ئەو كەسـەی، كە پشــت دەكاتــە شــەريعەتی خــوا، كــە بێبڕواييــە: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ: نـا سـوێند بـەخوا بـڕوادار نـاين، هــەتا تـۆ نەكەنــە داوەری خۆيان.﴾النساء:٦٥. ﴿وَمَآ أُوْلَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ: ئەوانەش بڕوادار نين.﴾النور:٤٧.

*　*　*

ئەمانە كێشەی سەرەكين لە كێشـەكانی بانگـەواز، ئەگـەر جـەماوەر بـاش لـەم كێشـانە تـێ نـەگات و بـڕوای پێيـان نـەبێت بـە بڕوايـەكی چەسـپاو، ئـەوا بنكـە

جەماوەریـە ڕاستـەکە نایەتـە دی، ئـەو بنکەیـەی کـە حوکمـی ئیسـلامی لەسـەر دادەمـەزرێ، کـە نـەفامی جیـهانیی هـەموو لـە بۆسـەدان بـۆ پێشـگریکردن لـە بەدیهاتنی ئەو حوکمە لە زەویدا.

دەبێ بڕوایەکی هۆشیار و ڕۆچوو هەبێت، بەرگەی ئەو هەموو فشـارە جیهانیـە بگرێت و بەرامبەری بوەستێت. هەرچی تارماییەك بە دەوری ئەو کێشانەدا دروست بکەین لەڕاستیدا دەبێتە بەربەست لەبەردەم بانگەوازەکەدا، با وایش بزانـین ئـەوە ڕێگاکە نزیك دەکاتەوە.

*　*　*

ئەوانـە کورتەیـەکی خێرابوو دەربـارەی ئـەو هۆیانـەی بونـە هـۆی پەلـەکردنی بزوتنـەوە هاوچەرخەکە لـە بزوتنەوەکـەیدا، هـەروا ئـەو ئەنجامانـەی، کـە لـەو پەلەکردنـە هاتۆتـە کایـەوە، کـە دەبـێ ببێتـە هـۆی چاوخشـاندنەوەمان بـە کارەکانماندا و هەوڵی ڕاستکردنەوەیان بدەین.

*　*　*

لە بەشـەکانی داهـاتوودا باسـی پـەروەردەی پێویست دەکـەین، جا بۆ بنکـە پتەوەکـە بێـت، کـە هـەڵگری کێشـەکانی بانگەوازەکەیـە، یـا بـۆ ئـەو بنکـەی جەماوەریەی، کە دەبێ پێك بێـت بۆ ئـەوەی بزوتنەوەکـە لـە ڕوداوی سـەرزەویدا ببێتـە ئـەنجامدان، هـەروا بەیارمـەتی خـوا بگاتـە ئامانجـەکانی. لـە باسـەکەماندا هـەنگاوەکانی بەرنامـەی پێغەمبـەر لەبانگەوازدا دەکەینـە ڕێنمـایی خۆمـان، ئـەو بەرنامەیەی، کە خاڵی سەرەتا تێیدا، دامـەزراندنی بنەکەیـەکی پتـەوە کـە بیناکـە هەڵدەگرێ.

# بنكەپتەوەكە

پێویست بە ڕونكردنەوە ناكات، كە هەموو پێغەمبەرێك ئەوە ناونیشانی پەیامەكەیەتی، ئەو نمونەشە كە پێویستە لەسەر شوێنكەوتوانی شوێنی بكەون، بەپێی توانایان، قسەو كردەوەكانی لەخۆیان بێننە دی، هەروا جێبەجێكردنی ئەو فەرمانانەی پێیان دەدا، هەروا ئەوانەش كە قەدەغەی كردوون: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ: هەركەسێكمان بە پێغەمبەری ناردووە، بۆ ئەوە بوە كە بە خەڵك ڕابگەیێنێ، بەئیزنی خوا دەبێ فەرمانی قبوڵ كەن.﴾النساء:٦٤.

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ: پێغەمبەر هەرچی بۆ هێناون وەری بگرن و هەرچی لێ قەدەغەكردون وازی لێبهێنن.﴾الحشر:٧.

﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا: بێسۆ پێغەمبەری خودا سەرمەشقی چاكە بۆ ئێوە و بۆ هەركەسێ، كە بەخودا و ڕۆژی سەڵا هیوادارە و هەر لە خەریكی یادی خوایە.﴾الأحزاب:٢١.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((..فإذا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيء فاجْتَنِبُوهُ، وَإذا أَمَرْتُكُم بأمرٍ فأْتوا مِنْهُ ما اسْتَطَعْتُمْ: ئەگەر شتێكم لێ قەدەغەكردن لێی دووربكەونەوە، ئەگەر فەرمانم پێدان بە فەرمانێك چەند لە تواناتانا بوو بیكەن.))[1]

دوبارە پێویست بەڕونكردنەوە ناكات، كە پەیامە كۆتاییەكەی خوا، پەیامێكی تاك بوو لەنێوان هەموو پەیامەكاندا؛ چونكە ئەو پەیامە ئایینی پێ تەواو بوو،

---

١ رواه البخاري.

بەرەو ڕوی هەموو مرۆڤایەتی کـراوە، نـەك تەنـها بۆ نەتەوەیـەکی دیاریکراو وەك پەیامەکانی پێشو، هەروا لەبەر ئەوەی نێرراوەتە خوارەوە، کە حوکمی پـێبکرێت و هـەموو ژیانی خـەڵکی بگرێتـەوە لـە هـەموو لایەنێکـەوە و بەرنامـەی تـەواوی مرۆڤایەتی نەخشە بکێشێت لەکاتی هاتنی پێغەمبەرەوەﷺ هەتا ئەو کاتـەی زەوی بەمیراتی بۆ خوا دەمێنێتەوە؛

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا: وا لـەمڕۆوە دینەکـەتانم تـەواوکرد و بـەبێ کورتـی و کەمایەسـی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد؛ ئیسلامیشم بۆ دینی ئێوە هەڵبژارد.﴾المائدة:٣. ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا: بلێ ئەی خەڵکینە من نـێرراوی خوام بۆ هەموتان.﴾الأعـراف:١٥٨. ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ: ئەم قورئانـەمان بـە خـەڵات بـۆ تـۆ ناردۆتـە خـوارەوە، کـە هـەرچی تێیدایـە ڕاستە؛ بە کتێبە بەرینەکان بڕوای هەیە و چاودێریانە. ئیتر تۆ بـەپێ ئـەوەی خـوا هەناردویەتە خوارەوە، بەکاروباریان ڕابگە.﴾المائدة:٤٨.

ئەمانە هەمووی لە تەقدیری خوادابـوون و گونجاوبوون بـۆ کۆتـایی هێنـان بـە پـەیام و نـاردنی دوا پێغەمبـەرﷺ؛ ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ: محمد بـابی هیـچ پیـاوێك لـە پیـاوانی ئێـوە نیە، بەڵام ڕاسپاردەی خوایە و ئاخری پێغەمبەرانە.﴾الأحزاب:٤٠.

پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ((لا نَـبِيَّ بَعْـدي: دوای مـن پێغەمبـەری تـر نیـە و نایەت.))[1]

لەگـەڵ کۆتـایی هێنـان بـە پـەیام ناردن، شـتێکی گونجـاو بـوو کـە پەیامـە کۆتاییەکە هەموو ئەوانە بگرێتەوە، کە خەڵك پێویستیان پێـی هـەبوو لـەو کاتـەی

١ أخرجه الشيخان.

تێیدا هاتەخوارەوە، لە پاش ئەو کاتــە و هــەتا ڕۆژی دوایی بەشێوەیەك کە هیچ نەوەیەکیان گومڕا نابن ئەگەر دەستی پێوە بگرن، بۆ جێبەجێکردنی کاروباریـان، پێویستیان بە شتی تر نابێت.[1]

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((تَرَكْتُ فِيكُمْ ما إن تَمَسَّكْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا أَبَداً؛ كِتابَ اللهِ وسُــنَّتِي: شـتێکم بـۆ بەجێهێشـتوون، ئەگـەر دەسـتی پێوەبگـرن گومڕانـابن، کتێبەکەی خوا و سوننەتەکەی من.))[2]

سروشتی بوو –پەیامە کۆتاییەکە لەسەر ئەو شێوەیە بێت– کە پێغەمبـەری کۆتاییﷺ گەورەترین نێرراو بێت لەناو نێرراوەکاندا، گـەورەترین پیـاوە کـە زەوی هەڵیگرتبێت.. لە راستی دوورناکەوینەوە، ئەگەر وتمـان: بەڕاستی ئـەو پیاوانـەی پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردن؛ گەورەترین پیاوانی مێژوو بوون –دوای پێغەمبەرە بەڕێزەکان، صلوات الله عليهم–.

بەشێوەیەکی گشـتی دەتوانـین بڵێـین: ئـەو بـەها و ڕێبیرانـەی، کـە بەرنامـەی پەروەردە لەخۆی دەگرێ و بەکار دەهێنرێ، کاریگەریەکی گـەورەی هەیـە لەسـەر ئەوانەی لەسەری پەروەردە دەبن، جا بەپێی گەورەیی ئەو بەها و ڕێبیرانە، دەبـێ ئاسـتی پـەروەردەبوەکان لـە سیفەتە پەسـند و ئاکـارە بـەرزەکان بێـت.. هـەروا لەڕوویەکی ترەوە دەڵێین: پەروەردیار(مربي) کاریگەرییەکی گەورەی هەیە بەسەر ئەوانــەی پــەروەردەی لێ وەردەگــرن، هـــەروا بـــەپێی گـــەورەیی پـــەروەردیار پەروەردەوەرگران ئاستیان بەرزتر دەبێ.

لــە ڕوی ســێیەمەوە دەڵێــین: بەڕاســتی ئــەو ئامادەییــە سروشــتیەی لـــە پەروەردەکەرەوە دەردەچێت، کاریگەریەگی گەورەی هەیە بۆ بەرزکردنەی ئاستی ئەوانــەی ئـــەوەیان بەردەکـــەوێت، بـــەپێی ســـەلامەتی و دوری فیـــترەت لـــە نەخۆشیەکان.. ئەگەر ئەم سێ ڕەگـەزەمان وەرگـرت، دەتوانـین بیرۆکەیـەك پێـك

---

١ لەژیانی خەڵکدا بەردەوام کاروباری تازە بەدی دێت، ئەوانەش لـە عیلمـی خـوادا نادیـار نـەبوون، ئەوکاتەی پەیامەکەی دەنارد، بەڵام هەموو ئەوانەی خستۆتە ناو شەریعەتەکەیەوە کـە تـازە دادێـن و، شەرعناسان و زانا (اصول)ناسەکان ئەو کارانەیان جیاکردۆتەوە بە تەواوی و ڕونیان کردۆتــەوە، هەرکەس دەیەوێت با سەیری کتێبەکانیان بکات.

٢ أخرجه الشيخان.

بهێنین، کە ئەو بنەڕەتانەی بنکە پتەوەکەی لەسەر دامەزراوە، ئەو بنکە پتەوەی کە پێغەمبەرﷺ دروستی کردبوو، هەروا دەربارەی جۆری ئەو بنکەیەی، کە ڕوی مێژووی وەرچەرخاند.

ڕێبیرەکان ئەوەیان بەسە، کە شوێنی دەرچونیان و بناغەی یەکەمیان یەکخواپەرستی بێت، ئەویش (لا اله الا الله)یە، یەکخواپەرستیش ئەم نەتەوەیەی دروست کرد، چاکترین نەتەوە کە بۆ خەڵك هاتبێت؛ خستیە سەر زەوی:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا؛ فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن. باوەڕیشتان بەخوا هەیە﴾آل عمران:١١٠

بەڵام ئەو چاکێتی‌یەی کە لە یەکخواپەرستیی دروست دەبێت، نە لە کەسێك نە لە شتێك خۆدەنوێنێ، هەر وەك لەو بنکەیەدا خۆی نواند، کە پێغەمبەرﷺ بەچاودێری خۆی پەروەردی کردبون لە قۆناغی پەروەردەی مەککەدا، پاشان لە مەدینەدا.

یەکخواپەرستی –بەشێوە ڕاستەکەی کە لای خواوە هاتۆتە خوارەوەو دڵی پێغەمبەرﷺ وەریگرتووە و هاوەڵەکانی لەسەر پەروەردە کردووە– گەورەترین ڕاستیە لەم بونەوەرەدا، گەورەترین شتە لە حەقیقەتی ئەو بونەدا لە کارکردنە سەر پێکهێنانی بونەوەر و بنیاتنانی دەرونەکان: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ: غەیرەز خوا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ؛ هەر زیندوە و بەسەر هەمو شت ڕادەگا.﴾آل عمران:٢.

بونەوەر بە سروشت خواپەرستە، مرۆڤیش بە سروشت خواپەرستە، بەڵام ئاسمانەکان و زەوی بەخۆشیەوە هاتون خۆیان تەسلیمی خوا کردووە، ماوەتەوە مرۆڤ هەندێکیان ملکەچ دەبن و هەندێکیان خۆی بەزل دەزانێ و خۆی دوور دەخاتەوە:

﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا

طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ: پاشان ڕوی نا لە بەرزایی، کە ئەوسا هەر تاریکان بو. بەوان و بە زەمینی گوت: خۆشی یا ناخۆشی، دەبێ بێنە بەر فەرمانم. گوتیان: وا بە خۆشی هاتین.﴾فصلت:١١.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ: تۆ نابینی ئەو کەسانەی وا لەناو ئاسمانەکان و ئەوانەی لە زەمیندان و خۆر و مەیف و ئەستێرەکان و کۆسار و درەختان و جانەوەر و زۆر لە مەردم سوژدە هەر بۆ خوا دەبەن؟ زۆرێکیش ئازاریان بۆ بڕیار دراوە..﴾الحج:١٨.

بنەڕەت لە سروشتی خەلکدا یەکخواپەرستی‌یە؛ ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ: تۆ هەر ڕو لەم دینە بکە و هەر بەرەو هەق هەنگاو بنێ؛ دینێکی بنەڕەتی‌یە و لە سروشتا خوا ئەو خەلکەی هەر بۆ خواپەرستیی وەدی‌هێناوە. کاری خوداش گۆڕانی بەسەردا نایە. دینی پتەو و پایەدار هەر ئەمەیە، بەلام زۆربەی ئاپۆرەی مەردم نەزانن.﴾الروم:٣٠.

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ: ئەوساش کە پەروەردگاری تۆ لە پشتی نەوەی ئادەم بنەچەکی بەرهەم هێنا، لەسەر خۆیان شایەتی هەر بەخۆیان دا. گوتی: من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: بەلێ، ئێمە لەوە ئاگادارین.﴾الأعراف:١٧٢.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ على الفِطرَة: هەرچی مندالێك لەدایك دەبێت لەسەر سروشتی خواناسی‌یە.))[1]

---

[1] أخرجه البخاري.

هەروەها فەرمویەتی: خوای گەورە فەرمویەتی: ((إنّي خَلَقتُ عِبـادي حُنفـاء كُلُّهُمْ: من هەموو بەندەکانم بە یەکخواپەرستی وەدیهێناوە.))(1)

بەلام خوا بە فەزڵ و کەرەمی خۆی نەیویستوە لەسەر یەکخواپەرستیی زۆر لە مرۆڤ بکات، وەك چۆن بونەوەرەکانی تری بەزۆر ملکەچ کردووە، بەلکو ریزی مرۆڤی گرتوەو فەزڵی داوەتێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا: ئێمە رێزمان لە تۆرەمەی ئادەم گرت و لە وشکانی و لە زەریادا هەڵمان گرتن؛ رۆزی پاکژمان پێداون؛ لەچاو زۆر لە کردەی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتون.﴾الإسراء:٧٠.

لە نیشانەکانی ئەو رێزگرتنە ئازادی هەڵبژاردنە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا: بەگیانی مرۆ سوێندە بەوەش کە رێکی خستوە، ئەوسا هەموو تاوانباری و پارێزکاری دەویژدانی گەیاندوە. دیارە هەرکێ گیانی خاوێن راگرتوە، رزگار بوە. هەرکەسێکیش دەگوناهیەوە پێچاوە، دۆڕاندویە.﴾الشمس:٧-١٠.

لەگەڵ ئەوەی ئەو ئازادیە رێزێکی خواییە، خوا داوێتی بە مرۆڤ، بەراستی هەندێ کەس بە ئاوەژوو ئازادیەکەی لەسەرپێچیکردنی خوادا بەکاردەهێنێ و لوت بەرز دەکاتەوەو پشت دەکاتە پەرستنی، لەجیاتی ئەوەی رێی راست هەڵبژێرێت و راست و رێك بێت. بەو شێوەیە لەناو خەڵکدا بڕوادار و بێبڕوا دەبێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ: خوا دروستی کردون، جا بێبڕوایشتان تێدایە و بڕواداریش.﴾التغابن:٢.

بەلام ئەوانەی بڕوایان هێناوە ئەوانەن، کە لەسەر سروشتی ساغ بەردەوام رۆیشتون بەپێی راستی بڕوایان و چەقیوی و هێزی بڕوایان، پلەیان بەرز دەبێت لە

---

١ أخرجه مسلم.

پەیڕەی خواناساندا بۆ بەجێگەیاندنی مەبەستێکی گەورە، کە خوا لەپێناویدا دروستی کردون: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ: من هەر بۆ ئـەوە جندۆکە و مرۆم دروستکرد، تا بمپەرستن.﴾الذاریات:٥٦.

## تەوحید چی لە دەرون دەکات؟

ئایا پارچە ئاسنێکت نەبینیوە کاتێ تەزویەکی کارەبایی پێدا تێپەڕ دەکرێت یا موگناتیسێکی بەسەردا دەبرێت.. چی لەناویا ڕوودەدات؟ وەك زانستی فیزیا دەڵێت: گەردیلەکانی لەسەر ڕیزێکی دیاریکراو ریز دەبنەوە، هێزێکی موگناتیسی تێدا دروست دەبێت، کە لەوەپێش تێیدا نەبووە و دەبێ بە وزەیەکی بزوێنەر کە لەوەپێش بێجوڵە بوەو نەدەبزوا و هیچی نەدەبزواند..

ئەو وزەیە لە کیانی خۆیدا لەکوێ بووە؟ لەوەپێش پەرش و بڵاو بوو، دەرنەدەکەوت و کاری نەدەکرد، بونێکی واقیعی بینراوی نەبوو.. ئێستا لەسەر شێوازێکی دیاریکراو کۆبونەوە، جا وزەکە دەرکەوت و کاری کرد، لەجیهانی واقیعیشدا شوێنەوارێکی بینراوی بۆ بوو..

ئەوەی لەوە دەچێت ئەوەیە، کە لە دەرونی مرۆڤدا ڕودەدات، کاتێ خۆشی ئیسلام تێکەڵی دەبێت، کاتێ یەکخواپەرستی فێر دەبێت، کاتێ بڕوا بە (لا الە الا الله) دێنێ.. دەرون لە پەرش و بڵاویەکەی کۆدەبێت و یەك ئاراستە دەبێت.

بەڵام، با نەختێ بوەستین بپرسین: پرش و بڵاوی لە دەرونەکاندا چ دروست دەکات؟ یان دەرون بە سروشتی خۆی وایە؟ یان کاتێ بێ چاودێری و بایەخ پێدان و بێ ئاڕاستەکردن؛ بەو شێوەی لێدێت؟ کاتێ مرۆڤ هەڵنەسێت بە ((تەزکیە))ی پێویست بەرامبەر نەفسی خۆی:﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ الشمس:٩-١٠.

پەرش و بڵاوی دەرون بە شوێنکەوتنی چەند خوایەك ڕوودەدات، هەروەها بە فشاری ئارەزووەکان.. هەروا بە دیاری نەکردنی ئامانجێکی دیاریکراو لە ژیاندا ڕودەدات.. ئەوە -بەلایەنی کەمەوە- سێ هۆی سەرەکین پەرش و بڵاوی لە

دەروندا دروست دەکـەن، جا بـڕوا دێـت لای دەبات، جا دەرون کۆدەبێتـەوە لـە پـەرش و بـڵاوی و لـەناوچونی، بـەوەش دەبێتــە وزەیـەکی زۆر و دەبزوێــت و دەبزوێنێ..

بەڵام مرۆڤی نەفامی عەرەبی، چەندەها خوای دەپەرست، کە هـەندێکیان دیار و ئاشـکرابوون وەك بتــەکان، هەندێکیشــیان شـاراوەبوون وەك هـۆز و عورفــی باوباپیران..

بـەڵام بتـەکان، دوان لەسـەریان بەلێشاوە، هـەتا یەکـەم جـار لــە سـەردەمی نەفامێتی عەرەبیدا مرۆڤ وایدەزانی ئەو بتانە تەنها خوان دەبێ بپەرسترێن، بەڵام ئـەوەی دیقــەتی لێ دەدرێ دەردەکـەوێت، کـە ئەوانــە بەتەنــها لـەجیاتی خــوا نەدەپەرستران، بڕوانە هۆنەر (درید بن الصمه)، کە دەڵێ:

وهل أنا إلا من غزية إنْ غَوَتْ غَوَيُ وإن تَرشْ غزية أرشَد

ئـەدی پەرسـتنی شـوێنکەوتن چیـیە، ئەگـەر ئـەوە نـەبێ؟ عـەرەبی نـەفامی دەیزانـی هۆزەکـەی گومـڕان ئنجا هـەر شـوێنی دەکـەوت، چونکـە لـە هەسـتیا پەروەردگاری پەرستراو هەیە، کە دروست نیە بەپێچەوانەی بجولێتـەوە نـە لـەڕێی ڕاست نە لە گومڕاییدا. !

هـەروەها داب ونـەریتی باوباپـیران پــەروەردگارێکی تــر بــوو لــەجیاتی خــوا دەپەرســــترا: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ: ئەگەر بەوانە دەبێژن: هــەر بەشـوێن ئـەوەدا بـڕۆن کـە لـەخواوە ناردراوە، ئێـژن: نەخێر، ئێمە ئەو کـارە دەکـەین کـە بـاب و باپیرەکانمـان ڕەچاویـان کـرد. جا بـا بابوباپیریشیان هیچیان لەهیچ نەزانیبێ و ڕاستەڕێشیان هەر نەدیبێ!﴾البقرة:١٧٠.

داب ونەریتی باووباپیرەکان بوو، کە ئەبوتالیبی والیکرد نەچێتە ناو ئیسلامەوە —لەسەر ئەو هەموو خۆشەویستیەی هـەیبوو بۆ برازاکەیﷺ، لەسـەر ئـەو هـەموو هۆگری و چاودێریکردنەی و پاراستنی لە بێبڕواکانی قورەیش— بۆ ئـەوەی پێـی نـەوترێت ئـەبوتالیب پێچەوانـەی داب ونـەریتی باووباپـیرانی جوڵاوەتـەوە! جـا چ بەندایەتی‌یەك لەو بەندایەتیە زیاتر هەیە؟

بەڵام مرۆڤی نەفامی سەردەمی ئێستا چەندەها خوا دەپەرستێت، کە بە ژمارە زۆرترن و شاراوەترن لە خواکانی سەردەمی نەفامی عەرەب: (بەرژەوەندی نەتەوایەتی) لەجێگەی هۆزایەتی عەرەبی کۆنە، کە گەورەتر و مەترسیدارتر و زیاتر دەستی بەسەر دەرونی شوێنکەوتوەکانیدا گرتووە.. (رای گشتی جیهانی) لەجێگەی داب ونەریتی باووباپیرانە، کە گەورەتر و مەترسیدارترە و زۆرتر کاریگەرترە بۆ سەر (بێدەسەڵاتان) بەتایبەتی لە هەموو زەویدا، لەگەڵ ئەوەی ئەوە دروستکراوێکی سەر دەستی ئەو شەیتانانەیە، کە حوکمی زەوی دەکەن، جا لەپشت پەردەوە بێت یان بێپەردە.. (پێشکەوتن) خوایەکە.. (زانست) خوایەکە.. (عیلمانیەت) خوایەکە.. (بەرهەمهێنان) خوایەکە.. (ئازادی کەسایەتی) خوایەکە.

بێجگە لە ئارەزووەکان!

کە لە کۆن و نوێدا خوای پەرستراون لەجیاتی خوا.. ئەوانە خوایەکن بەندەکانیان لەناو دەبەن و بەرەو لەناوچوونیان دەبەن.

ئەو ئارەزوانە لە باری سروشتی خۆیدا لە قوڵایی فیترەتەوە، خۆراکێکی پێویستە بۆ دەرونی مرۆڤایەتی، بۆ ئەوەی هەڵسێت بە کاروباری سروشتی خۆی لە ئاوەدان کردنەوی زەویدا، کە بەشێکە لە ئەرکی جێنشینی، کە خوا مرۆڤی بۆ دروست کردوە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً: ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند، من دەمەوێ بریکارێك لەسەر زەمین دیاری بکەم.﴾البقرة:٣٠.

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاکەی وەدیهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود:٦١.

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَـٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ: ئارەزوی ژنان و

کوڕی زۆر پــەیداکردن و دەسـکەوتنی کۆمـای زل زیـو و زێـڕان و ڕەوەئەسپی بـە دروشم[1] و ولّسات و زەوی کێلانیّ، بۆ مەردم رازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین، بەلام وەختیّ دێنــەوە بەردەسـتی خـودا، پێدەزانـن کـە زۆر لـەوە باشـتر هەیە..﴾آل عمران:١٤.

ئەو ئارەزواتە وەك چۆن خۆراکێکی بەسودە، بــەلام کاتــیّ سـنور تێدەپــەڕێنیّ دەبێتە زەهرێکی کوشندە، ئەوەش هــەروەك خواردەمــەنی جەسـتەیی وایــە.. جـا لاشــە –بۆ ئــەوەی بــەکاری سروشـتی خـۆی هەلّسـێت– پێویستی بـە بڕێــك لــە پرۆتینـات و نیشاستە و خـویّ و ڤیتامیناتــە، بــەلام ئەگــەر لــە بــڕی گونجــاوی هەرکامیان لە سنورت تێپەڕاند، خەوش لـە کارەکـانی لاشـە ڕوودەدات، ئیـتر ئـەو کاتە نابێتە خۆراکێکی راست و دروسـت، وای لێدێـت توانـای کـارکردنی سروشـتی خـۆی نـەبێت، کـە پێویسـتە لەسـەری بیکـات، جـا نەخۆشـی دەسـت پێدەکـات.. دەرونیش هەر بەو شێوەیە، پێویستی بەو ئارەزوانە، یا ئەو (پالّنەرانە) هەیـە، بۆ ئەوەی بە بزوانی سروشتی خـۆی ببزوێت، کـە پێویسـتە لەسـەری لـەژیانی دونیـا پیّی هەلّسیّ، بەلام ئەگەر شوێن فریودەرەکانی ئەو ئارەزوانــە بکـەوێت –چونکـە ئەو ئارەزوانە لەخۆیاندا خۆش و رازاوەن مرۆڤ بە زۆریی فریودەدەن– بەڕاسـتی سیستەمەکەی تێك دەچێت و خـراپ دەبێـت، توانـای هەلّسـان بـەکاری سروشـتی خۆی نامێنیّ، هەرچەندە هەلّسێت بە چەند چالاکیەکی لاڕیّ، وەك چۆن خانەیەکی ساغ تێك دەچێت کاتــیّ توشــی شـێرپەنجە دەبێــت.. چـالاك دەبێـت، بــەلام چالاکیەکەی دەبێتە هۆی لەناوچون.

خـالّی (تاقیکردنـەوە) لێرەدایـە، کـە مـرۆڤ لـە ژیـانیدا توشــی دەبێـت، کـە ئامانجێکە لە ئامانجەکانی وەدیهێنانی خەلّك:

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا: ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکێکی ئاوێتــە وەدیهێنـا تـا تاقیکەینــەوە؛ گـویّ و سۆمای دیتنیشمان پێدا.﴾الإنسان:٢.

---

[1] دروشم: نیشانەی تایبەتی.

﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا: هەرچی لەم سەر زەمینەیە ئێمە کردن بە زەنبەری تا بیان ئەزموین کامەیان کارچاکتر دەبن.﴾الكهف:٧.

بابەتی تاقیکردنەوە ئەو ڕێگایەیە، کە مرۆڤ خۆشیەکانی زەوی لێیەوە بەدەست دێنێ.. ئایا ئەم مرۆڤە لە سنوری بێوەییدا ڕادەوەستێ، کە خوا بۆی داناوە –ئەو خوایەی خۆی لەتیف و خەبیرە، کە دەزانێ کێی دروست کردوە و دەزانێ چی چاکی دەکات و چی بۆ چاکە– یان زیادەڕەوی دەکات و سنورەکەی تێپەڕ دەکات، جا ئەو خۆشییانەی سەرزەوی دەکاتە زەهرێکی کوشندە، کە زیانبەخش دەبێ زۆرتر لەوەی سودبەخش بێت، یا زیانی دەبێت و سود نابەخشێت؟

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ: ئاخۆ کەسێ وەدیهێنابێ، چۆن نازانێ؟ وردیلەبین و ئاگادار، هەر خۆیەتی.﴾الملك.

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا: ئەمانەن سنوری خودا، لەسنوری خوا دەرمەچن.﴾البقرة:٢٢٩.

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا: ئەمانە سنوری خودان نەچن تخونیان بکەون.﴾البقرة:١٨٧.

مرۆڤی نەفامی عەرەب، نوقمی ئارەزوەکان بووبوو، ئەوەندەی لێ بەکاردەهێنا، کە باری کۆمەڵایەتی و باری ئابوری ڕێی پێدەدا، خراپەی لەو کارەیدا بەدی نەدەکرد، بەڵکو بە شانازی و ڕێزی دەزانی! بەئارەزوی تێکچووی دەیڕازاندەوە.

(طرفة بن العبد) دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ولولا ثلاث هن من عيشة الفتـــى | وجدّك لم أحفل متى قام عودّي |
| فمنهن سبقي العاذلات بشربـــة | كُمَيْت متى ما تُعْلَ بالماء تزبد |
| وكرّي إذا نادى المضاف محنّبـــاً | كسيد الغضا–نبهتّه– المتورد |
| وتقصير يوم الدجن، والدجن معجب | ببهكنة تحت الطرف المعـــد |

باسی مەی و ئافرەت و جەنگ دەکات، دوای ئەوەی ئەم دێڕەی خوارەوەی

پێش ئەو گوتوە:

ألا أيهذا اللائمي أخضر الوغى          وأن أشهد اللذات هل أنت مخلدى؟

لەبەر ئەوەی مانەوەی هەمیشەیی مەحاڵە لەواقیعی ژیانی دونیادا- (مەنتیق) لە جاهیلیەتدا، دەبێ مرۆڤ چەند دەتوانێ ئارەزوی تێر بکات، چونکە تاکە هەلە، ئەگەر لەدەست چوو ناگەڕێتەوە، بەڵام مرۆڤی نەفامی سەردەم، ئارەزووەکان لە ژیانیدا ئەو بنەڕەتەیە، کە مرۆڤ لە پێناویدا دەژی، ئەگەریش کاربکات و بەرهەم بهێنێ لە پێناوی بەدەستهێنانی هۆیەك، کە بواری زۆری بۆ پەیدا بکات لەو ئارەزوانەی دەستی بکەوێت! جا لەوەدا یەکسانن کەسانێك ئارەزوەکەیان دەسەڵات بێت و هەوڵی بەدەستهێنانی بدەن، یان ئەو کەسەی ئارەزوەکەی لە ماڵ و موڵك بێت و کاربکات بۆ پەیداکردنی، یان کەسانێك ئارەزویان جنس و وەرگرتنی خۆشی بێت، ئەو ئارەزوەی نەفامی سەردەم کردویەتی بە شتێکی بەنرخ بۆ گەورەو بچووك و ژیر و شێت و ژن و پیاو وەك یەك!

بەڵام لە نەفامیدا ئامانج نیە دورتربێت لەژیانی دونیا و لەوانەی تێیدایە لە خۆشی و ئارەزوەکان: ﴿وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ: دەیانوت: لەژیانی دونیا بەولاوە نیە، دەمرین و دەژین تەواوبوونی ڕۆژگار نەبێت هیچ ئێمە ناکوژێت.﴾الجاثية:٢٤.

﴿إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ: لەژیانی دونیا بەولاوە هیچی تر نیە دەمرین دەژین و زیندوو نابینەوە.﴾المؤمنون:٣٧.

﴿فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ۝٢٩ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ: تۆ لەو مرۆیە وازبێنە کە لە یادی ئێمە خۆ دەبوێرێ و بە دەر لە ژینی دنیایە، هیچی تری نەویستوە. هەر ئەوەندەی لێ دەزانن.﴾النجم:٢٩-٣٠.

﴿يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ:

لەرواڵەتی ژینی دنیا ئاگادارن وهیچ ئاگاشیان لە پاشەڕۆژەکە نیە.﴾الروم:٧.
کاتێ ئامانجە نزیکەکانی مرۆڤ کورت هەڵدێ لە ژیانی دونیـادا -هەرچـەندە وا دەربکەوێت دوربێت- زۆر لـەو کیانـەی ون دەکات، کە خـوا لـەپێناویدا دروستـی کردووە، کاتێ لە مسـتێ قـوڕی زەوی و فویـەك لـە گیـانی خـۆی دروسـتی کـرد.. بەهابەرزەکان ون دەکات کە ڕاگری ڕاستین بۆ مرۆڤ:
﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ: کاتـێ پـەروەردگارت بـە فریشتەکانی ڕاگەیاند: وا خەریکم مرۆیەك لـە قـوڕ دروسـت دەکـەم، کاتـێ لەشیم تەواوکرد و لە گیانی خۆم فوم پێداکرد، هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص:٧١-٧٢.
بەڵام مرۆڤی نەفامی عەرەب خەمی هەرەگەورەی بریتی بوو لە هۆزەکەی و ئەو ڕوداوانەی بەدەوریان ڕویان دەدا، لەبـەر ئـەوە پاراسـتنی ڕەچەڵـەك و شـانازی و شەڕەقسە و هەواڵی جەنگ و هێرش کردن و هەڵاتن، ئەو جیهانەی بوو، کـە تێیـدا دەژیـا و لـەپێناویدا دەژیـا، شـاعیرەکانیان هۆنراوەیـان پێـدا هـەڵدەدا، دەبـو بـە شـەوچەرەیان و جێگـای پێشـبڕکێی نێوانیـان بـوو لەگـەڵ لایـەنی ئـەو کارانـەی دەیانکرد، بۆ زۆر کردنی سـامان و مـاڵ و منـداڵ، هـەروەها ئـەو ئارەزووبازیانـەی دەیانکرد.
بەڵام مرۆڤی نەفامی سەردەم، زۆرتر گومڕاو قەتیس ماوە لەژیانی دونیادا و لە جیهانی هەستدا، زۆر دورکەوتوتر بووە لە بەها بەرزەکان و ئەرکەکانی لەبەر چنگ گرتنی بە خۆشیەکانی هەستیەوە، لەبـەر ئـەوەی دروستکەرانی ئـەم نەفامیـە بـە پەرۆشی دورخستنەوەیانن بە تـەواوەتی، لە هەموو بەهاکانی مرۆڤایەتی، کە مرۆڤ لـە چوارچێـوەی ئـاژەڵ دەردەکـەن، لەبـەر ئـەوە هونـەری زۆریـان نوانـدوە بـۆ ڕازاندنەوەی زەوی و ڕازاندنەوەی خۆشی وەرگرتن لە خراپـەکاری بـە هـەرچی هـۆ هەیە، کە بە بیردا بێت -یا بـە بـیردا نەیـەت-. لـە هـەموو نەفامیەکاندا -کۆن و تـازەیدا- کاتـێ مـرۆڤ قـەتیس بمێنـێ لـەژیانی دونیـادا و بـڕوا نـەهێنن بـە زیندووبوونـەوەو گەڕانـەوە و لێپرسـینەوە و پاداشـت، ژیـان لەبـەرچاویان وا دەردەکەوێت بێهودە و بێمانایە. بەهاکان تێیدا نرخی نیـە ئـەوەندە نـەبێت، کە

مرۆڤ خزمەتی ئارەزوە بەرژەوەندیەکانی پێبکات لە ژیانە سنوردارەکەیدا، مرۆڤ لەو ژیانەدا سەرگەردانە وەك شاعیری نەفامی هاوچەرخ (إیلیا أبو ماضي) لەم چەند دێرە دەری بڕیوە:

جئت لا أعلم من أين ولكني أتيت!
ولقد أبصرت قدامي طريقاً فمشيت!
وسأبقى ماشياً إن شئت هذا أو أبيت
كيف جئت؟ كيف أبصرت طريقي؟ لست أدري!

لەبەر ئەوە عارەق هەمیشە بەشێك بووە لە نەفامیی، چونکە هۆیەك بووە بۆ هەڵاتن لە هەست کردن بەبێ هودەیی ژیان، کە ئەویش هەستێکی قورسە لەسەر دەرون، وەك چۆن خەڵك خۆیان نوقم دەکەن لە گەمە وگاڵتە(لهو)، بۆ کوشتنی ئەو کاتەی پوچەڵ و قورسە، کاتێ مرۆڤ لە ململانێیە نزمەکانیان و بەرژەوەندیە نزیکەکانیان دەبنەوە، دەگەڕێن بەدوای ئامانجێکدا، کە ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕبکاتەوە، بەڵام نایدۆزنەوە.

لە نەفامیی عەرەبیدا عارەق و کۆڕی خواردنەوەو یاری قومار؛ هۆ و وەسیلەی گەورەیان بوو بۆ هەڵاتن.. لەنەفامی سەردەمدا مادەسڕکەرەکانیش چونە پاڵ عارەق و سەماگە و خانەی ڕابواردن و نادیەکانی قومار.. لەلایەکی ترەوە دڵەڕاوکێ و نەخۆشیە دەرونیەکان و خۆکوشتن و شێتی دێتە ئەنجام، کاتێ هۆکانیتر سەرکەوتو نابن بۆ لابردنی هەست کردن بە بێهودەیی ژیان لەسەر هەست و هۆش.

*     *     *

ئەوانە هەموویان هۆن لەدوای ئەو پەرش و بڵاویەی، کە دەرونی مرۆڤایەتی لە نەفامیێتیدا توشی بووە، هەر ئیمانیشە دەرونەکان لە پەرتەوازەیی کۆدەکاتەوە.

ئیمان واتاکەی لەسەرەتاوە: بریتیە لە بیروباوەڕ بون بەوەی خوا، خوایەکی تاك و تەنهایە و خوایەکی تر نیە جگە لەو.. بەراستی هەموو خواکانی تر و هەموو پەرستراوەکان لەجیاتی خوا، خەیاڵن هیچ ڕاستیان نیە، تەنها لە گومانی خاوەنەکانیاندا بونیان هەیە، ئەوانە گومانێکن هیچ بە هەق و ڕاستی نابەخشن..

واتاکەی ئەوەیە جگە لە (الله) کەس شایستەی پەرستن نیە، چونکە لە راستیدا خوایەکی تر نیە جگە لەو شایانی پەرستن بێت، جا هەرچی تر بپەرسترێت لە بنەڕەتەوە پوچەڵە، چونکە ئەو پەرستنە بۆ ئەوانە کراوە، کە نابێ بپەرسترێن.. هەروەها واتاکەی دەستگرتنە بەوانەوە کە لەلایەن خواوە نێرراون، چونکە لەناو هەست و هۆشدا ناگونجێت خوا خۆی شایستەی پەرستن بێت و بە تەنها پەرستراوی حەقیقی بێت، کەچی ملکەچی جگە لەو بکرێت لە سەرپێچیکردنیدا! لە کۆتایی کارەکەدا مانای ئەوەیە، کە خوا دانەری یاسایە، هەر ئەو حەڵاڵ و حەرام دیاری دەکات، هەروەها چاك و خراپ و ڕەواو ناڕەوا، هەر ئەو سنوری ئەوانە دادەنێت، کە خۆشی ژیانی دونیایان تێدایە و خەڵك کاری تێدا دەکەن، هەر ئەوە بەرنامەی ژیان بۆ خەڵك دادەنێت و ئەو ئامانجانەیان بۆ دیاری دەکات کە بۆی دەژین.

کاریگەری ئەو ئیمانە ئەوەیە، کە هۆیەك لە هۆکانی پەرش و بڵاوی نامێڵێ، ئەو هۆیانەی ڕێگە خۆش دەکەن بۆ ئەوەی پەرش و بڵاوی بچێتە ناو دەرون.

کاتێ خوای پەرستراو لە هەستدا دەبێ بە یەك خوا، بە تەواوەتی هەموو خوا دروستکراوەکان کۆتاییان دێت، ئەوانەی دەرون لەدواکەوتنیاندا پەرش و بڵاو دەکەن و هەرپارچەی داوایەکی خۆی دەبێت، هەریەکەیان خواست و شەتەحاتی خۆی دەبێت، کە لەیەك ئاراستەدا یەك ناگرنەوە، جا دەرون لە ناویاندا دابەش دەبێت، هەرخوایەی کاری خوایەتیەکەی ناکات لەسەر حیسابی خوایەکی تر نەبێت:

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ: خوا دو مرۆ بەنمونە دێنێتەوە: یەك خولامی چەند کەسی دژ بە یەکترە، ئەویتریان خولامی تاقە کەسێکە؛ ئاخۆ ئەم دوانە وەك یەکن؟ سوپاس بۆ خوا، بەڵام زۆربەیان نەزانن.﴾الزمر: ٢٩.

کاتێ خوای شایستەی پەرستن دەبێتە یەك خوا، لە دەروندا ئارەزوەکان ڕێك و پێك دەبن لەو سنورانەی، کە خوا بۆی سنوردار کردون، ئەو ئارەزوانە دەبنە

خۆراکێکی چاکی دەروون، نابن بە ژەهری کوشندە، نابن بە غەمی هەمیشەیی، کە نە تێر بخوات و نە تێر بێت، هەل بۆ دەروون ناهێڵێتەوە، کە تێیدا ئارام بگرێت..

کاتێ خوای پەرستراو بە یەك دادەنرێ لە دەروندا ئەو ئامانجەش دیاردەکرێت، کە هەموو ئامانجەکان لە ناویدا ڕێك دەبن، ئەو بەهایانەش دیاری دەکرێن، کە ئامانجەکان دێنێتە کایەوە. ئەو بێهودەییەی لە ژیاندا هەیە دەڕوات، کاتێ مرۆڤ بڕوا بهێنێ بە زیندوبوونەوەو گەڕانەوەو لێپرسینەوە و پاداشت.

* * *

ئەگەر ئەوە ڕۆڵی ڕێبیرەکان بێت لە پێگەیاندنی بنکەی پتەودا، با وتەیەکی بە پەلەش بڵێین لەسەر ڕۆڵی پەروەردیارﷺ، کە گەورەترین پەروەردیار بوو لەمێژوودا، ئێمە ناتوانین هەقی خۆی بدەینە ئەو پەروەردیارە، نە لەم وتەیەدا، نە لە چەندەها وتە.. ئەوەی بەسە، کە پەروەردگاری نیعمەت بەخشە بەخشەرەکەی شایەتی بۆ داوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ: ئاکارت فرە بەرزە.﴾القلم: ٤.

بەڵام ناتوانین ئەو بنکەیە بناسین، هەتا ئەگەر بەپەلەش بووە باسی ئەو کاریگەریە گەورەیە نەکەین، کە کەسایەتی گەورەی پێغەمبەر، خۆی لەناویاندا دروستی کردووە.

شوێنکەوتوان هەمیشە شتێك لە سیفەتەکانی سەرکردەکەیان وەردەگرن لە میانەی خۆشەویستیانەوە بۆی و هاوەڵیکردنی، ڕەنگە ئەو وەرگرتنە بێ تێگەیشتنی تەواویان بێت، چونکە موعجەب بون بە کەسایەتی سەرکردە پاڵ بە شوێنکەوتوانیەوە دەنێت لەخۆیانەوە هەوڵی لەوچون بدەن لە هەندێ کردەوەکانیاندا، هەروەها لە هەندێ لە قسەکانی و هەندێ لە هەڵوێستەکانی و هەندێ هەڵسوکەوتی، ئەوەش بەکردەوە ڕویداوە لە صەحابەوە﷽ بەرامبەر پێغەمبەرەکەیان، کە زۆریان خۆش دەویست بەجۆرێك سەروی هەموو خۆشەویستیەك دەکەوت، ئەوەندە ڕێزیان لێدەگرت، کە لەسەروی هەموو ئەو ڕێزانەوە بوو، کە شوێنکەوتوان لە هەموو مێژوودا بەرامبەر سەرکردەکەیان هەیانبووبێت.

هیرەقل لە ئەبوسوفیانی پرسی، کە هێشتا موسڵمان نەبوبو، حاڵی بڕواداران بەرامبەر پێغەمبەرەکەیان چۆنە؟ وتی: کەسم نەبینیوە ئەوەندە کەسێکی خۆش بوێ وەك هاوەڵەکانی محمد، محمدیانﷺ خۆش بوێ.

بەڵام کارەکە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ تەنها ئەو ئیعجابە نەبوە، کە بەبێ تێگەیشتنی تەواویان کاری کردبێتە سەریان، بەڵکو کاریگەریەکی تێگەیشتن و هۆشیارانە بووە بە فەرمانی خوا، ئەو خوایەی بڕوایان پێهێنابوو، خۆیان تەسلیمی کردبوو و بەفەرمانی خودی پێغەمبەرﷺ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا: بۆسۆ پێغەمبەری خودا سەرمەشقی چاکە بۆ ئێوە و بۆ هەرکەسێ، کە بەخودا و رۆژی سەڵا هیوادارە و هەر خەریکی یادی خوایە.﴾الأحزاب:٢١.

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ: هەرچی پێغەمبەر دەوداتێ لێی وەرگرن؛ لە هەرچیشتان بێبەش کا، دەستی بۆ مەبەن. دەبێ لەخوا بترسن؛ کە تۆڵەی خوا زۆر دژوارە.﴾الحشر:٧.

﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ: مەدینەیی و ئەو عارەبە دەشتەکیانەی لە دەوریانن، نەدەبوایە پێغەمبەری خودایان وەلا بنایە و خۆیان لەو هەلاواردایە.﴾التوبة:١٢٠.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، هەرکاتێ خودا و پێغەمبەر لێو داوا دەکەن کارێ بکەن ئێوەی پێ بژوێنەوە، گورجی بیکەن؛ ئێوەی پێ دەبوژێنەوە.﴾الأنفال:٢٤.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((لا يُؤمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أكونُ أَحَبُّ إِلَيهِ مِنْ نَفسِهِ

وَمالِهِ وَوَلَدِهِ: کەس لەئێوە بڕوای تەواو نابێت هەتا منی لا خۆشەویست تر نەبێت لە خۆی و ماڵ و منداڵی.))[1]

هەروەها فەرمویەتی: ((صَلّوا كَما رَأيتُمُونِي أُصَلِّي: چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم ئێوەش بەو شێوەیە نوێژ بکەن.))[2]

فەرموویەتی: ((خُذُوا عَنِّي مَناسِكَكُمْ: ڕێوشوێنی خواپەرستیی لەمنەوە وەربگرن.))[3]

ئەوەش لەبەر ئەوە بووە، کە تەنها سەرکردەیەك نەبوە، کە سەرۆکایەتی کۆمەڵێك لە خەڵك بکات، بەڵکو پێغەمبەر بووە لە خواوە ڕادەگەیەنێ، ئەوە بۆ خەڵك ڕون دەکاتەوە، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە، گوێڕایەڵیکردنیشی فەرمانە، گوێڕایەڵیکردنی خواپەرستیە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بن. هەرکاتێکیش لەسەر شتێ لەنێو خۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بەخودا و بەڕۆژی قیامەت هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خودا بکەن. ئەم کارە بۆتان باشترە و ئاکامی چاکتری هەیە.﴾النساء:٥٩.

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ: هەرکەسێك بەرفەرمانی پێغەمبەرە، دیارە بەرفەرمانی خوایە﴾النساء/٨٠.

لەبەر ئەوە بۆ پێغەمبەرﷺ ئەو خۆشەویستیە زۆرەی پەیڕەوانی کۆبۆوە، کە هیچ خۆشەویستیەك نەیدەگەیشتێ، هەروا گوێڕایەڵیکردنیشی کە ئەویش خواپەرستیە، ئەوەندەی کاریگەری بۆ کۆبووبووە لە دەرونی هاوەڵەکانیدا ﷺ وێنەی نەبووە لە مێژوودا.. کاریگەری کەسایەتیە بێوێنەکەی، کاریگەری ڕێبەرە

---

١ أخرجه الشيخان.

٢ أخرجه البخاري.

٣ أخرجه مسلم.

بۆرێنەکانی ئەو دوانە لەیەك کاتدا بوون..

لە پێشەوە بەدرێژی لە رێبیرەکان دواین، دوایی دەگەڕێینەوە سەری بە درێژی باسی دەکەین.

بەڵام کەسایەتیەکەی پێغەمبەرﷺ رێمان پێدەدات لەم شوێنەدا بڵێین: بەڕاستی کەسایەتیەکی کۆگر(جامع) بووە هەموو ئەوانەی تێدا کۆبوەتەوە، کە بڵاوبووبونەوە لەناو کەسایەتی پێغەمبەرەکانی تردا، سەلامی خوایان لێبێ، لەوانە: ڕۆحانیەتی عیسا، ئارامگرتنی نوح، بەتوانایی موسا، دڵنەرمی ئیبراهیم، سەلامی خوایان لێبێ.. بۆ چەند سیفاتێك، کە خۆی تاك بووە تێیدا، کە بۆ پێغەمبەری تری پێش خۆی نەبووە، کەسایەتی سەرکردەیەکی سیاسی تێیدا کۆببۆوە، ئەو سەرکردەی، کە نەتەوەکەی لە پەرتەوازەیی کۆبکاتەوە، لەنێو نەتەوەکاندا شوێنێکی بەرزیان بۆ دیاری بکات.. هەروا کەسایەتی سەرکردەیەکی سەربازی، کە سوپایەکی تاك لە ئازایەتی و بەهێزی پەروەردە بکات، کە پیرۆزترین جەنگیان پێبکات.. کەسایەتی پەروەردیارێك، کە کەمتەرخەمی نەبێت لە کۆشش کردن لە پەروەردەکردنی شوێنکەوتووەکانی لەوپەڕی ڕەوشت و ئاکاری چاکدا.. کەسایەتی خواپەرستێکی دابڕاو بۆ خوا، کە لە پەرستن غافڵ نەبێت، بەیانیان و ئێواران و شەوان.. کەسایەتی خەباتکەرێك کە ماندو نەبێت لە جیهادکردن.. کەسایەتی مێردێکی نمونەیی و باوکێکی میهرەبانی دڵسۆز.. ئەوانە هەموو لە کەسایەتیەکەیدا هاوسەنگ بوو، لایەکی بەسەر لایەکیدا زاڵ نەدەبوو، لایەنێکی گورج و گۆڵ نەدەبوو لە سەر حیسابی لایەنەکەی تری، بێگومان کاریگەریەکەی لەسەر پەیڕەوانی، گەورەترین کاریگەری بوو، کە پێغەمبەرێك لەناو نەتەوەکەیدا بەدی هێنابێت، گەورەترین کاریگەری لە مێژوودا، کە مرۆڤ بەدی هێنابێت.

* * *

وەك بە کورتی باسی ئەو رێبیرانەمان کرد، کە بنکەکەی دروست کرد، ئەو بنکەیەی پێغەمبەرﷺ دایمەزراند، هەروەها دەربارەی کەسایەتی پەروەردیاری گەورە، ئەو کەسایەتیەی بنکەکەی پەروەردە کرد، هەروەها وتەیەکی کورت

دەربارەی جۆری ئەو پیاوانە دەڵێین، کە بنکەکە لەسەر شانیان دامەزرا:

﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ: خوا خۆی باشتر دەزانێ چکەسێ بۆ پێغەمبەریی هەڵدەبژێرێ.﴾ الأنعام:١٢٤.

هەڵبژاردنی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەڵبژاردنی ئەو زەویەی پەیامەکەی لێوە دەردەچێ، هەڵبژاردنی ئەو نەتەوەیەی یەکەم جار پەیامەکە وەردەگرن، بێگومان ئەو هەڵبژاردنە حیکمەتێکی زۆری لەدواوەیە، بەڕاستی خوا بۆ پەیامە کۆتاییەکەی، گەورەترین پێغەمبەری هەڵبژارد، زەویەکی هەڵبژاردووە، کە خوا خۆی دەزانێ گونجاوترین زەویە، کە ئەو پەیامە کۆتاییەی لێوە دەرچێت.. زەویەك ئەو کاتە هیچ دەوڵەتێك لەو دەوڵەتە گەورانە حوکمی زەویان دەکرد ئەو کاتە هیچ تەماعیان پێی نەبوو، چونکە بیابانێکی ڕوتی بێباران بوو، کە کۆمەڵە بڕوادارەکە دروست بوو و بەدەسەلات بوو، بەبێ دەست تێخستنی دەسەلاتێکی دەرەکی بۆ زەبون کردنی و لاوازکردنی، یا بەری لێبگرێت نەیەڵێت ئەرکەکەی بەجێ بهێنێت. هەتا ئەگەر دەوڵەتە (گەورەکان) بە مەترسیەکەیان زانی، ویستیان بەرپەرچی دەنەوە، ئەو دەوڵەتەکەی دامەزراندووە، هێزە لێدەرەکەی پێکهێناوە، ئەو هێزەی دوژمنی پێ دەترسێنێ.

بەلام مرۆڤەکانی ئەم زەویە، خوا دەیزانی شیاوترین مرۆڤن بۆ هەلگرتنی ئەو پەیامە و گەیاندنی بە هەموو لایەکدا، هەرچەندە بتپەرست بوون، بەڵێ، هاویەش دانەر بوون، بەڵێ. دوژمنێکی سەرسەخت بوون.. بەڵێ. دەمەقاڵێی زۆریان دەکرد.. بەڵێ، بەلام لەدوای هەموو ئەوانەوە، فیترەتیان پاکتر بوو لە هەموو گەلانی تری سەرزەوی، کە شارستانیەتی نەفامی گەندەڵی کردبوو بەڕابواردن و نەرمێتی بە ئومێدی مانەوەی هەمیشەیی لە زەویدا، هەروا بە بلاوەبوونەوەی شوێنی ئارەزوو خاڵیکردنەوەی تێیدا، وەك چۆن دوو ئیمپراتۆرە (گەورەکەش!) لای راست و چەپی دورگە(جزیرە)یان گرتبوو، کە فارس و ڕۆم بوون، جگە لەوەش گەلەکانیان خرابونە ژێر زەبر و زەنگی حاکمی موقەدەس، کە گەردنەکانی بۆ ئەوی بوون، کە مامەڵەی گەورەو کۆیلەی لەگەڵ گەلەکەی دەکرد، گەورەکان ستەمیان دەکرد و بەندەکان ملکەچی.

بێگومـان نـەفامی عـەرەبیی، دەرونـی عەرەبـە هاوبـەش دانـەرەکانی خـراپ کردبوو.. بەڵام -وەك لە واقیعدا چەسپا- خراپکردنی توێکڵەکەی بـوو نـەچووبووە ناوەڕۆکی فیترەتەکەوە، ئـەوەندەی پێنـەچوو ئـەو عـەقیدە تازەیـە ئـەو توێکڵـە خراپ بووەی لابرد، هەتا یەکسەر گەیشتە ئەو رەگەزە چاکانـەی کە لـە فیـترەتدا هەڵگیرابوون، بەشێوەیەك شتی سەیری بەدی هێنا.

بێجگە لەو بێبڕوایانەی بەردەوام بوون لەسەر بێبڕواییەکەیان، دژی ئەو ئایینە بە توندوتیژی جەنگان هەتا کـوژران، بەڕاستـی ئـەو دەرونانـەی هـاتن بـە دەنگـی پەیامەکەوە، بەشێوەیەکی جوان هاتن بەشێوەیەك، کە پێشتر وێنەی نەبوو لـەناو شوێنکەوتوانی پێغەمبەراندا، ئـەوەش لەبـەر فیـترەت پاکیـان، کـە لـەژێر توێکڵـی ساختەدا شارابۆوە، هەروا لەبەر دڵسۆزی قوڵیان بۆ ئەو ئایینە، لەبەر ئازایەتی‌یان و ئامادەبونیان بۆ بەخشین و گیان بەخت کردن.

شتێکی تـر هەیـە دەبـێ ئامـاژەی بـۆ بکرێت، ئـەویش ئامادەییـــان بـــوو بـــۆ گواستنەوەی خـێرا بـۆ ئـەو شـوێنە تازانـەی نیشـتەجێ دەبوون تێیـدا و دەبـووە نیشتمانیان.. ئەو پەیوەندیە توندەی جوتیار دەبەستێ بە زەویەکەیـەوە ئـەوانی نەدەبەسـت بـە زەویەکەیانـەوە تـا کاتـێ چـەند هـەنگاوێك لێـی دوور دەکەونـــەوە؛ هەست بـە غـەریبی بکـەن. ئـا بـەو شـێوەیە بـە زەویـدا بڵاوبوونـەوە وەك ئـەوەی لەوەوپێش هیـچ گـەلێکی تێدا بڵاونەبوبێتـەوە، رێنمـایی و ڕۆشـناییان بـۆ هـەموو مرۆڤایەتی هەڵگرتبێ.

هەتا ئێستا بەکورتی لەو سێ هۆکارانە دواین، کـە بەشـداری کـردووە لـە پتـەو کردنی ئەو بنکەیەی پێغەمبەرﷺ دروستی کردبوو: گەورەیی ئەو رێبیرانەی بنکەکە لەسەری دامەزرابوو، هـەروەها گـەورەیی پـەروەردیار، کـە پێغەمبـەر بـوو، هـەروا فیـترەت پـاکی ئەوانـەی ئـەو رێبـیرە گەورانـەیان وەرگـرت و بـە گـەورەیی پەروەردیارەکەیان کاریگەر بوون. جـا هێشـتا باسـی دەوری ئـەو پەروەردەیـەمان نەکردووە، کە پێغەمبەرﷺ پێی هەڵساوە بەرامبەر پەیڕەوانی.

*           *           *

رێبیرەکـان بەڕاسـتی هـەن -ئـەمڕۆش هـەن هـەروەك ئـەو ڕۆژەی لای خـواوە

هاتۆته خوارەوە- بەلام لەخۆیەوە کارناکات، ئەگەر پەروەردیارێك لەناو دەرونی پەیڕەوانیدا نەیچێنێ و سەوزی بکات و سەرپەرشتی بکات و چاودێری بکات و ئاراستەی بکات، پەروەردیاریش ڕەنگە هەبێ، بەلام کاریگەرە تەواوەکەی نادات هەتا هەوڵی پێویست دەدات بۆ پرۆسەی پەروەردەکردن، کاریگەربونی لەخۆوە(تلقائی) بەتەنها بەس نیە بۆ پەروەردەکردنی دەرون، ئەگەر پەروەردیار هەوڵێکی ئیجابی نەدات، بۆ قوڵکردنەوەی بەهای پێویست و چەسپاندنی لە دەرونەکاندا.

لەکتێبێکی تردا باسی بەرنامەی پەروەردەی ئیسلامیم کردووە،[1] بەلام لێرەدا دەمانەوێت ڕۆڵی پەروەردە دیاری بکەین لە دروستکردنی بنکەدا، چونکە ئەمە ئەو بابەتەیە، کە ئەمڕۆ بەرەوڕومان دەبێتەوە لە بزوتنەوەکەی سەردەمماندا و لە زۆر بابەتەکاندا ئەوەمان هەر نیە.

لەپێشەوە باسمان کرد کە بڕوا بە (لا اله الا الله) کاریگەریەکی قوڵی هەیە لە دەرونی مرۆڤدا، چونکە گەردیلەکانی ناو دەرون دوبارە ڕێك دەخاتەوە، وەك چۆن تەوژمی کارەبا کار دەکاتە سەر پارچەیەك ئاسن و گەردیلەکانی یەك دەخاتەوە..

بەڵێ، بەلام دەرونی زیندوو -بەئارەزوەکانی و ویستەکانی و هەڵچونەکانی و ڕاکێشانەکانی- لە پارچە ئاسنێکی نەجوڵاو ناچێت، کە دەکرێ لەسەر شێوەکەی خۆی پارێزگاری بکرێت لەو ماوە درێژەی کە لەسەری بووە.. بەڵکو پارچە ئاسنەکە خۆی -هەڵناچێ و ناجوڵێ لەناو هەستەکاندا- بۆ هەمیشە پارێزگاری بارەکەی خۆی ناکات، کە تەوژمی کارەبا دروستی دەکات، ئەگەر پارێزەری بۆ دانەنرێت بیپارێزێت لەوەی گەردیلەکانی جارێکی تر بلاوببنەوە، وەك لەوەپێش بلاوبوونەوە.

دەرونی مرۆڤ -بە هەڵچونەکانی و ئارەزووەکانی و ڕاکێشەرەکانی- لەپێشترە، کە جارێکی تر پەرش و بلاوبێتەوە، ئەگەر بەچواردەوریا پارێزەر نەبێت بیپارێزێ لە بلاوبوونەوە، کە کاردەکاتە سەر ڕێك و پێك کردنی گەردیلەکانی، هەر کاتێ ویستی یاساکەی خۆی سەرلەنوێ تێك بداتەوە.. وەك

---

١ کتاب (منهج التربیة الإسلامیة)

چۆن پارچە ئاسن هەموو موگناتیسیەکەی ون ناکات، ئەگەر ماوەیەك بێپارێزگاری وازی لێهێنرا، بەڵام موگناتیسەکەی وردەوردە ون دەکات؛ ئەو دەرونەش، کە بڕوای هێناوە هەر بەو شێوەیە، هەموو ئیمانەکەی ون ناکات کاتێ بێپارێزگاری ماوەیەکی دوورودرێژ وازی لێبهێنرێت، بەڵام وردەوردە ئیمانەکەی لاواز دەبێت، هەتا وای لێدێت ئیمانێکی کارا نابێت، توانای یەکگرتنی نابێت، هەتا وەکو ئەوە وایە هەر لە جیهانی واقیعدا نەبووبێت.. لێرەدا دەردەکەوێت، کە پەروەردە چەندە پێویستە بەردەوام بێت لەسەر ئیمان، نەك هەر ئیمانی ڕووت.

دەرونی مرۆڤ لەژیانی دونیادا توشی جوڵەیەکی هەڵوەرینی نەریتی دەبێت لەناو قەوارەی خۆیدا، ئەنجامی کاریگەری ئەو ئارەزوانەی کە خوا لە قورئاندا باسی کردوون:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ: ئارەزوی ژنان و کوڕی زۆر پەیداکردن و دەسکەوتنی کۆمای زۆ زیو و زێڕان و ڕەوەئەسپی بە دڕۆشم و وڵسات و زەوی کێڵانێ، بۆ مەردم ڕازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین، بەڵام وەختێ دێنەوە بەردەستی خودا، پێدەزانن کە زۆر لەوە باشتر هەیە..﴾آل عمران:١٤.

بەڕاستی لەپێشەوە باسمان کرد ئەم جوڵە هەڵوەرێنە نەریتیەی دەرون –کە لە سروشتیدا پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ کردەوەی دیاریکراو و ڕەفتاری دیاریکراو– خالی تاقیکردنەوەیە، ئەو تاقیکردنەوانەی، کە مرۆڤ لەژیانی دونیادا توشی دەبێت، کە لە دەرونێکەوە بۆ دەرونێك جیاوازە، هەروەها ڕەفتارێك لە ڕەفتارێکەوە: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا: ئێمە ئەوەی لەسەر زەویدایە بۆ ڕازاندنەوەی دروستمان کردووە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان تاقیبکەینەوە کە کامیان چاکترین کردەوە دەکەن.﴾الکهف:٧.

ئایەتە پیرۆزەکە بەکورتی باسی ئەو ئارەزوانە دەکات، کە لەناو دەروندا

دەبزوێن و دەیجوڵێنن بەرەو کردەوە و ڕەفتاری دیاریکراودا، چونکە بوارەکە بواری درێژەپێدان نیە.[1] بەڵام هەڵچونەکانی مرۆڤ و خۆشیەکانی و هاوارەکانی و ڕاکێشانەکانی لەژمارە نایەن، کۆتایی نایەت و پێداگیری دەکات، هەروەك شاعیر گوتویەتی: ((وحاجة من عاش لا تنقضي)).

لەبەر ئەوە تاقیکردنەوە هەموو چرکەیەك بەردەوامە، پەروەردەش هەموو چرکەیەك پێویستە، هەتا دەرون لەسەر باری پێویست ڕاست بێتەوە، لە بەندایەتی ئارەزووەکانیش ڕزگار دەبێت، لەسەر ڕاستاڵی(استقامة) ڕادێت، هەتا لای دەبێتە بنەڕەت(أصل)، فەرمودەی خوای بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾:

ئەوانەش کە گوتویانە: پەروەردگارمان خودایە و لە گفتیان لایان نەداوە؛ فریشتە دێنە لایان و پێیان ئێژن: نە بترسن، نە خەم بخۆن؛ مژدەتان بێ گەیشتونە ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدراوە.﴾فصلت: ٣٠.. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بێتاوان نیە و هیچ کەس لە هاوارەکانی دەرون پارێزراو نیە، کە دەیخاتە ناو گوناهەوە، هەرچەند دەرگای تۆبە لەبەردەم مرۆڤدا هەمیشە کراوەتەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاء، وَخَيرَ الخَطَّائِينَ التَّوَّابون: هەرچی ئادەمیزاد هەیە گوناهی زۆر دەکات، باشترین گوناهکاران ئەوانەن، کە تۆبە لە گوناهەکانیان دەکەن.))[2].. لێرەدا ڕۆڵی پەروەردە و پێویستی مرۆڤایەتی بە پەروەردە دەردەکەوێت، پێویستیشە ئەوپەڕی گرنگ و بایەخی پێ بدرێت.

پەروەردە تەنها بۆ ڕێك و پێك کردنی دەرون و شپرزەیی و هەڵچونەکانی پێویست نیە، هەرچەندە ئەوانە بنەڕەتێکن ناتوانرێت وازیان لێ بهێنرێت، بەو نەبێت ژیان ڕاست نابێتەوە، بەڵام پێویستە بۆ ئاستەکانی تری ڕەفتار و بەها

---

١ لەچەند ئایەتی تردا بەدرێژی باسکراوە و هەروەها لە زۆر فەرمودەکانی پێغەمبەرداﷺ.
٢ رواه أحمد وابن ماجه.

پێویستەکانی ژیان.

خوای گەورە جۆرەها تاقیکردنەوەی لەژیانی دونیا بۆ مرۆڤ دانـاوە، هەندێکیان لەناخی خۆیەوە فشار دەکەوێتە سەری، ئەویش پاڵنەرەکان و خواست و ئارەزوەکانێتی، هەندێکی تریشیان فشار لە دەرەوەی دەرونی خۆی دەکەوێتە سەری، هەرچەندە کار دەکاتە سەر ناخی خۆیەوە، جا فشاری سیاسی بێت، یان ئابوری، یان کۆمەڵایەتی، داب و نەریتی خەڵکیش دەچێتە ناو فشارەکەی دواییەوە، هەموویان خواستی ملکەچ کردنی خەڵکیان هەیە بەپێی پێویستیەکانیان، ئەگەریش زۆریان لە نەفامیدا بەتایبەتی هەواو ئارەزو بوو بن زیاتر لەوەی پێویستیە حەقیقەتەکان بن، ئەو هەواو ئارەزوەن، کە لوت بەرزەکان دەیانسەپاند بەسەر بێدەسەلاتەکاندا: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ: ئەگەر راستی شوێن ئارەزوی وان کەوتبا، بێگومان ئاسمانەکان و زەمین و هەرچی دەناو ئەواندایە، خـرا دەبون.﴾المؤمنون:٧١.

بۆ ئەوەی ژیان رێك و پێك بێت لەسەر ئاستی شیاو بە مرۆڤەوە، ئەو مرۆڤەی خوا رێزی لێگرتووەو فەزڵی داوە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا، پێویستە مرۆڤ بەرهەڵستی ئەو فشارانە بکات، ئەگەریش بەهۆی ئەو بەرهەڵستیەوە توشی جۆرەها بێبەش بوون بێت..

ئەگەر واز لە دەرون بهێنرێت بێچاودێری و پاراستن، ئەو دەرونە نەرم دەبێت و لاواز دەبێت، هێزی بەرهەڵستیکردنی فشاری نامێنێ و بەئاسانی لاردەکرێتەوەو لول دەکرێت، جا لوت بەرزەکان هەوڵی بەکارهێنانی فشاری زیاتر دەدەن، بۆ بەدەستهێنانی ملکەچ بوونی زۆری خەڵك، ئەوکاتەش فەساد لە زەویدا سەرهەڵدەدا، واتە بەدەسەلات دەبێ و گەورە دەبێ: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ: فەساد لە وشکانی و دەریادا سەریهەڵداوە بەو کارە خراپانەی، کە مرۆڤ دەیکەن.﴾الروم:٤١.. لەو (کارەدا) ستەمی ستەمکاران و خۆ بەدەستەوەدەران یەکسانن، جا ئەوانە هەموو خراپەن

ژیان دور دەخەنەوە لە وێنە ڕاستەکەی، کە پێویستە لەسەری بێت.. لێرەدا ڕۆڵی پەروەردە جارێکی تر بەدیار دەکەوێ بۆ ئەوەی دەرونی پتەوی پێویست بەدەست بهێنێ، بۆ بەرەوڕوو بوونەوەی فشارەکان. بەها و ڕێبیرەکان بەردی ڕەقن، کە بنیاتی دەرون لەڕوخان دەپارێزن لەکاتی یەکەم لێدانەدا، یا چەمینەوە لەژێر فشاردا، بەپێی دەستگرتنی ڕاستی بەو بەها و ڕێبیرانەوە پتەوی ڕاستەقینە بۆ دەرون دروست دەبێت، ئەو دەست گرتنەش بە هەوڵی بەردەوامی پەروەردەی ڕاست دروستی دەکات، بەڵام لە دەروندا ئەوە دروست نابێت، هەتا لەسەر ڕێك کردنی ئارەزووەکانی و هەواو هەوەسەکانی ڕانەیەت، چونکە بێئەوە توانای لەسەر پتەویی نابێت و بەرگەی ئەرکەکانی ناگرێت: ﴿فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ: لەسەر ئەوەی بەتۆ ڕاگەیەندراوە پێدابگرە؛ کە تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاستی.﴾الزخرف:٤٣.

﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ: ئەو کەسانەی کە بەرانبەر بە کتێب ڕەفتار دەکەن و نوێژیش دەکەن، ئێمە پاداشی ئەوانەی ئاکارچاکن گوم ناکەین.﴾الأعراف:١٧٠.

پێویست بوون بە پەروەردە، نە لەو سنورە کۆتایی دێت، نە لە ئاستی ئەو کارانەدا کۆتایی دێت، بەتایبەتی سەبارەت بە بڕوادارەکان، بەڕاستی ویستی خوا وابوە، کە هەموو خەڵك یەك نەتەوە نەبن:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ: پەروەردگارت ئەگەر حەزی بکردایە، خەڵکی دنیای گشتی دەکردە یەك ئاین؛ بەڵام بەناتەبایی هەر دەمێننەوە؛ {تا} مەگین پەروەردگاری تۆ بەزەیی پێیاندا بێتەوە؛ کە هەر بۆیەی دروست کردون.﴾هود:١١٨-١١٩.

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ: هەر ئەویشە کە ئێوەی وەدی هێناوە، سا هێندێکتان باوەڕو پێنەهێناوە و هێندێکیشتان

بەبڕوایە.﴾التغابن:٣.

پاشان لە دەستوری خوای پاك و بەرزدا وایە، كە لەسەر زەویدا پاڵنان هەبێت لەنێوان بڕوادارەكان و بێبڕواكاندا، لەنێوان ئەهلی هەق و ئەهلی باتڵدا ، بۆ ئەوەی زەوی خراپ نەبێت بەباڵادەستی ئەهلی باتڵ، بێ ئەوەی شتێك هەبێت پشتگیریان بكـات: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ: ئەگەر خودا هێندێكانی لەو ئاپۆرە بەهێندێكان تەرت و تونا نەكردایە، ئەم زەمینە خراببو؛ بەڵام خودا چاكەی لەسەر هەمو خەڵكی دنیا هەیە.﴾البقرة:٢٥١.. خوا دەتوانێ ئەهلی باتڵ لەناوبەرێ و ستەمەكانیان پوچەڵ بكاتەوە، چونكە هەر ئەوە كە بە هەرچی بڵێ ببە دەبێ: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ: هەرچیەك بمانەوێ پەیدا ببێ، هەر هێندەیە كە پێی بێژن: ببە، دەبێ.﴾النحل:٤٠.. بەڵام دەستوری خوا وایە، كە لەناوبردنیان بەدەستی ئەهلی هەق بێت، بەیارمەتی و پشتیوانی خوا، ئەوەش لەلای ئەهلی هەق بەشێكە لە تاقیكردنەوە، كە لە دەستوری خوا بۆیان دانراوە، بۆ گەورەكردن و بەرزكردنەوەیان لەو كاتەدا: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ: ئەگەر خودا بیویستبا، بۆ خۆی تۆڵەی لێ دەستاندن، بەڵام ویستی بە یەكتریتان بئەزموێ.﴾محمد:٤. ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ: ئەوان ئێوە نەتان كوشتن؛ خوا كوشتنی. كە هاویشتت، هاوێژەرەكە تۆ نەبوی؛ خوا هاویشتی. ئەو دەیویست باوەڕداران بەباشی تاقی كاتەوە، خودا بیسەر و زانایە.﴾الأنفال:١٧.

ئەم كارە بریتی‌یە لە كۆشش و پاڵنانی ناهەق لەپێناوی چاكسازیی زەوی و پاراستنی لەخراپە، ئەوە ئەو لوتكەیە، كە مرۆڤ لە ژیانی دونیادا پێی دەگات،

هەر لە هەمان کاتدا لوتکەی ئیسلامە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ألا أخبرُكَ برأس الأمر، وَعَمُودهُ، وَذَروةَ سِــــنامِهِ؟: ئایا پێت رانەگەیەنم کە سەری ئەم کارە و کۆڵەکەکەی و لوتکەکەی چیە؟))، –مەعازی کوڕی جەبەلﷺ دەڵێ– وتم: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: ((راسُ الأمرِ الإسلام، وَعَمودُهُ الصلاة، وَذَروة سِنامِهِ الجهاد: سەری کارەکە ئیسلامە، کۆڵەکەکەی نوێژە، لوتکەکەی جیهادە.))[1]

جیهادیش کارێکە پێویستی بە پەروەردەیەکی درێژ و ئامادەکردن هەیــە، ئامادەکردنی دەرونی و گیانی پێش ئامادەکردنی لاشەیی و مادیی، ئەوە ئاستێکە لە ئاستەکانی پەروەردە تەواو نابێت، هەتا مرۆڤ بەو دوو ئاستەی پێشوودا تێنەپەڕێت، هەروەها پێویستی بە دەرون پتەوی هەیە کە لەسەر ڕێککردنی ئارەزوەکان چڕ دەبێتەوە، بەو پێیە پەروەردە پلەپلە دەچێتە ناو ئەو سێ ئاستە بەراهێنان لەسەر ڕێك کردنی ئارەزوەکان و ڕاهێنانی دەرون لەسەر ڕێککردن بە تێپەڕبوون بە بەدەستهێنانی پتەویی بە چەسپاندنی بەها بەرزەکان لە بنیاتنانی دەروندا، بە گەیشتن بۆ ئامادەبوون بۆ جیهاد و ئارامگرتن لەسەر ئەرکەکانی لە دەرون و ماڵدا..

پاشان ئاستێکی تر هەیە هەر دەبێ ئاماژەی بۆ بکەین، کاتێ باسی باشترین سەدە دەکەین، بەتایبەتی ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، ئەویش ئاستی خۆبەخشینی جوامێرانەیە، کە لە واجبەکان و فەرزەکانیش تێپەڕ دەکات، کە بەرز دەبێتەوە بۆ مەندوبەکان و موستەحەبەکان، وایان لێدەکات وەك واجبەکان و فەرزەکانیان لێبێت، بێئەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی بیسەپێنن، بەڵام هەر لەبەر خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی و پەرستنێکی دڵسۆزانە بۆ خوا بەئومێدی ڕازیبونی، ئەو ئەوە تاکەی پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوو، لەو ئاستەدا گەیشتبوە لوتکە، هەرچەندە نەوەیەك لە نەوەکانی ئوممەتی ئیسلام خاڵی نەبوە لەو کەسانەی بەرزبوونەوە بۆ ئەو ئاستە بەرز و باڵایە.

* * *

کاتێ ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە، ئەوا نزیك بوینەوە لە بەرچاوگرتنی ئەو

---

١ أخرجه الترمذي

هەوڵەی پەروەردیاری گەورە ﷺ داویّتی بۆ بەرزکردنەوەی ئەو دەرونانە بۆ ئەو ئاستە بەرزەی گەیشتبونێ لەجیهانی واقیعدا، ئەویش ئاستێکە، کە لە مێژووی مرۆڤدا نەبووە..

کاتێ ئەو ئامرازە گەورانەمان زانی، کە پێغەمبەرﷺ بەکاری هێناوە لە پەروەردەکردنی هاوەڵەکانیدا، یارمەتیمان دەدات بۆ لەبەرچاوگرتنی ئەو هەوڵە. ئەو هەوڵەش ئامرازێکی پێویستە بۆ هەموو پەروەردەکردنێك لەسەر بەرنامەی ئیسلام؛ جا لە هەر نەوەیەك بێت لە نەوەکانی ئیسلام، هەروا قوڵکردنەوەی بڕوایە بەخوا و ڕۆژی دوایی و ژیان بردنە سەر لەگەڵ بوونی خوادا.

هیچ شتێك نیە وەك ئیمان بتوانێ بەو شێوەیە دەرون بەرز بکاتەوە، بەڕاستی ئەو ئیمانە ئەو پارێزەرانە زۆر دەکات، کە دەرون دەپارێزن لە دەست دەرچون و نزم بونەوە لەگەڵ گرانیی ئارەزوەکان، پاشان بەرزبونەوەی لا خۆشەویست دەکات لە پەیژەکانی خواپەرستەکان بۆ بەرزترین پلە.

مرۆڤ چەندە لەگەڵ خوا دەژیێ و خۆشی دەوێت و لێی دەترسێ، لە ئاشکرا و نهێنی یادی دەکات و داوای ڕازیبوونی دەکات، چەندە یادی ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە و کۆبوونەوەو لێپرسینەوە و پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ دەکات، ئەوەندە دەتوانێ ئارەزوەکانی بەند و بەست(ضبط) بکات و بەها بەرزەکان لەخۆیدا بنوێنێ، ئەوەندە دەتوانێ خۆی ئامادەبکات بۆ جیهادکردن لەپێناوی خوادا، هەروەها ئارەزومەندی بۆ خۆبەخشینی مەردانە بەئومێدی ڕازیبوونی خوا.

ئەگەر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بکۆڵینەوە دەبینین، بەتایبەتی تەرکیزێکی زۆری لەسەر ئەو کارانە کراوە..

بەڵام ناساندنی خوا بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی و ئەو توانایەی، کە هیچ لەدەستی دەرناچێت و ئەو زانستەی هیچی لێ ون نابێت و ئەو چاودێریەی بێئاگا نابێت لەهیچ و ئەو ڕەحمەتەی هەموو شتی گرتۆتەوە، ئەو دەسەڵاتەی هیچ شتێك لەبەردەمیا خۆی بۆ ناگیرێت؛ ڕوونترە لەوەی لە کتێبە پیرۆزەکەی خوادا ئاماژەی بۆ بکرێت، ئەوەش بابەتی یەکەم و گەورەترینە لە بابەتەکانی قورئانی پیرۆزەدا، لەڕووی ئەو ڕووبەرەوە، کە دایدەپۆشێت و تەرکیزی بەردەوام

لەسەری و ڕونکردنەوەی پێویستیەکانی، ئەویش پەرستنی خوای تاك و تەنهای بێهاوبەشە لەبیروباوەڕی دلْدا و دروشمەکانی پەرستن لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و داوای یارمەتی‌لێکردن و هاوار بۆ کردنی و قوربانی بۆ کردنی و نەزر و پاڕانەوە و پابەندبون بە یاساکانی خوا لە فەرمانەکان و قەدەغەکان و یاساکان و ڕێنماییەکان و ئەحکامەکانە.

بەلاّم دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی لەگەلّ جۆراوجۆری شێوازی ڕانواندنیدا و باسکردنی لەزۆر شوێندا و بیرخستنەوەی نیعمەتەکانی و سزاکانی، هەروەها کارێکی ڕونە بۆ ئەو کەسانەی باش لە قورئانەکەی خوا ورد دەبنەوە.. بەلاّم ئەوەی لە سورەتە مەدینەییەکان سەرنج ڕادەکێشێ بەتایبەتی، کە دوو کارەکە بەیەکەوە دەبەستێ: ئەویش بڕوا بەخوایە و بڕوا بە ڕۆژی دواییە، بە سەلبی و بە ئیجابی، ئەوەشی بە بیروباوەڕ و دروشمەکان و یاساکان و شێوازی ڕەفتار و ڕەوشتەکان پەیوەست کردوە، جا چ لای بڕواداران بێت یان بێبڕواکان: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ: ئەوانەی خاوەن باوەڕن و ئەو کەسانەش کە جولەکە و فەلە و سابیی مەزەب بون، ئەگەر بەخوا و ڕۆژی پەسلاّن باوەڕیان بێ و ئاکار چاك بن، لەلای پەروەردگاریان ڕا پاداشی خۆیان پێدەگا و نە هیچ ترسێکیان لەسەرە، نە خەم دەخۆن.﴾البقرة:٦٢.

﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ: هەرگا ژنانتان تەلاق دا و کاتی حەیایان بەسەرچوو- ئەگەر بە تەرزێکی ڕەوا وەك ئاوجوتانی پێشویان ڕێك کەوتن- ئێوە مەبنە بەرهەلّستی شوکردنیان. کێ لەئێوە بڕوای بەخوا و بەڕۆژی قیامەتێ هەبێ.﴾البقرة:٢٣٢.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ: ئەی کەلی خاوەن باوەڕان! خێرەکانتان بە منەت لەسەر کردن و ئازاردان بەفیڕۆ مەدەن. نەچن وەك ئەو کەسانە بن کە باوەڕیان بەخوا و ڕۆژی سەلا نیە و بۆ ڕوبینی لەماڵی خۆیان دەبەخشن.﴾البقرة:٢٦٤.

﴿يَـٰٓأَيُّهَاٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَـٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا: ئەی کەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بن، هەر کاتێکیش لەسەر شتێ لەنێو خۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژی قیامەتێ هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خودا بکەن. ئەم کارە بۆتان باشترە و ئاکامی چاکتری هەیە.﴾النساء:٥٩.

﴿قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَـٰغِرُونَ: دژی ئەوانە بجەنگن کە بەخودا و ڕۆژی سەلا بێباوەڕن و هەرچی خوا و پێغەمبەری خوا بەناڕەوایان زانیوە، ئەمان بەڕەوای دەزانن و نایەنە سەر دینی ڕاستیش، تا ئەو کاتەی بەزەلیلی و بەدەستی خۆ، سەرانەی خۆ بەنگۆ دەدەن.﴾التوبة:٢٩.

﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا: بێسۆ پێغەمبەری خودا سەرمەشقی چاکە بۆ ئێوە و بۆ هەرکەسێ کە بەخودا و ڕۆژی سەلا هیواداره و هەرخەریکی یادی خوایە.﴾الأحزاب:٢١.

ئەگەر لە سورەتە مەدەنیەکاندا پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەنێوان بڕوا بەخوا و

بڕوا بەڕۆژی دوایی هەبێت، لە سورەتە مەککەییەکانیشدا هەیە، هەرچەندە هەریەکەیان خۆی سەربەخۆ باسی کردوە: ﴿إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ: خودای ئێوە هەر یەکێکە، ئەو کەسانەی بڕوایان بەدواڕۆژ نیە، دڵەکانیان دژ باوەڕن و خۆشیان هەر بەزل دەزانن.﴾النحل: ٢٢.

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَـٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَـٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَـٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُولَـٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا: عەبدە

راستەکانی ڕەحمان ئەو کەسانەن کە بێدەعیە دەچنە ڕێوە و هەر کاتێکیش نەزانەکان بیاندوێنن، پەرسڤی نەرم و نیانیان دەدەنەوە. ئەوانەشن کە شەو تا ڕۆژ، ڕوە و پەروەردگاری خۆیان سوژدە دەبەن و وێستاون. ئەوانەشن کە وا ئێژن! ئەی پەروەردگاری هەمومان! جەزرەبەدانی دۆزەخمان لێ دورخەنەوە؛ چونکە جەزرەبەی جەهەندەم دوایی نایە کە بەڕاستی زۆر شوێنێکی نالەبار و زۆر ئەنوایەکی خراپە. ئەوانەشن کە لەکاتی ماڵ بەخشینا، نە یەکجاری دەست بڵاون، نە تەواویش دەس قوچاون. هەر لەناو ناوەندەدا، ماون. ئەوانەشن کە وێڕای خوا، هیچ شتی تر ناپەرستن؛ کەسێکیش ناکوژن کە خوا ڕژتنی خوێنی بەناڕەوا زانیوە؛ مەگین بە هەق؛ توشی داوێن پیسیش نابن. هەرکێ ئەم کارانە بکا، تاوانی خۆی دێتەوە ڕێی. ڕۆژی سەڵا دوچەندانە ئازار دەدرێ و بە سوکایەتی هەر لەوێدا دەمێنێ، مەگین ئەوی تۆبە دەکا و باوەڕ دێنێ و ئاکاری چاك ڕەچاو بکا، بەڕاستی دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا. ئەوانەشن کە بەدرۆ، شایەتی نادەن و هەرگا بەلای کاری نالەباردا ڕادەبورن، مەردانە خۆی لێ لادەدەن. ئەوانەشن کە هەرکاتێ نیشانەکانی پەروەردگاریان وەبیر دەخرێتەوە وەك کەڕ و کوێر ناوێستن {و گوێ پێدەدەن}. ئەوانەشن کە ئێژن: ئەی پەروەردگارمان! ژن و منداڵانی وامان پێ ببەخشە، ببنە مایەی چاوڕونیمان؛ بشمانکە پێشەوا بۆ خۆپارێزەکان. جا ئەوانە لە پاداشی خۆڕاگرتنیان، ئۆدە{کانی بەهەشت}یان پێ‌دەدرێت و لەوێدا هەر بە درود و سەلامەوە تەکیانا ڕوبەڕو دەبن. هەر لەوێدا دەمێننەوە، کە زۆر بنکەیەکی باشە و زۆر نشیمەنێکی خۆشە..﴾الفرقان:٦٣-٧٦.

بەڵگە پەرەردەییەکەی ئەو کارە ئەوەیە، کە بڕوا بەخوا و ڕۆژی دوایی سەربەخۆن و خۆیان بە ناخی دەرونندا دەچنە خوارەوە، پاشان بەتەواوەمەندی بەستراون بەیەکەوە، ئەوە ئامرازە گەورەکەیە لە بەرنامەی پەروەردەی ئیسلامیدا، کە پەرە بە ئومێدەکەی دەدات بە پەیمانی بەردەوام و بەدواچونی زیرەکانەی بەردەوام.. ئا ئەوە بووە، کە پێغەمبەرﷺ پێی هەڵساوە بەشێوەیەکی تاکی وا، کە لە مێژوودا وێنەی نەبووە، کارە بەردەوامەکەی پێغەمبەرﷺ، لە مەککە بە تایبەتی، قوڵکردنەوەی بڕوا بەخوا بووە و قوڵکردنەوەی بڕوا بەڕۆژی

دوایی بووه لـه دەروونـی هاوەڵـەکانیدا‌ﷺ، پاشان پەیوەست کردنـی نێوان بڕوا بەخوا و بڕوا بەڕۆژی دوایی لـەو دەروونانـەدا، هـەتا وای لێهاتووە ئـەویان بووەتـە بیرخـەرەوەی ئـەویتریان لـەخۆوە و بـەرەو ئـەو؛ بەشێوەیەك کاتێ خـوا بـیری مرۆڤێك بخرایەوە لەگەڵیان بیری ڕۆژی دوایی دەکەوتـەوە، بـە نیعمەتـەکانی و بـە سزاکانی، ئەگەر ڕۆژی دوایی بیربخرایەوە، خوای پاك و بەرزی بیردەکەوتەوە، ئەو خوایەی خاوەنی دونیا و ڕۆژی دواییە و خاوەنی هەموو شتێکە لە بونەوەردا.

بەو ئـامرازە گەورانـە ئـەو لوتکەیـە دەردەکـەوێت، کـە پێغەمبـەرﷺ پێـی گەیشتووە لـە پـەروەردەکردنی هاوەڵـەکانیدا، لـەو وەسـفە جوانـەدا، کـە لـە کتێبەکـەی خـوادا بۆیـان کـراوە، دوای ئـەوەی ئـەو پـەروەردە تاکـەیان کردۆتـە سەرچاوەی خۆیان و بەشی زۆریان لێ وەرگرتووە:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٠﴾ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ: لە ئافراندنی ئاسمانان و زەمیندا ئـاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژان، زۆر نیشانەی پتـەو هەیـە بۆ ئەوانـەی کـە خـاوەنی دڵـی وشیارن. ئەوانەی چ بە وێستاوی و چ لە جێوە، بە دانیشتن، چ لەسەر تەنیشت دەخـەون، هەر یادی خوا دەکەن و لە سازدانی ئەم عاسمانـان و زەمینـە ڕادەمێنـن، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! تۆ ئەم دەزگایەت بەفیڕۆ ساز نەداوە، پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە؛ هەر بۆ خۆشت لە ئازاری بەئاگرمان بپارێزە. پەروەردگارمان! هەرکەس تـۆ

بیخەیتـە ئـاگر، توشـی شـورەییت کـردوە، ئەوانـەی ناھـەقیکارن، ھیـچ کـەس دەھانایان نایە. پەروەردگارمان! ئێمە بیسـتمان بـانگ ڕایـەڵێك گـازی دەکـرد کـە بـاوەڕی بـە پـەروەردگارتان بێنـن، ئێمـەش باوەڕیمـان ھێنـا؛ سـا بـۆ خـۆت ئـەی پەروەردگارمان! لە گوناھانمان خۆش ببە و ھەر خراپەی کردومانە، وەیکوژێنـە و دەگەڵ ئەوانەی پیاوچاکن بن مرێنە. پەروەردگارمان! ئەو شتانەش بەئێمە ڕەوا ببینـە کـە لـە زوان پێغەمبەرانتـەوە بـەڵێنت پێمـان داوە؛ شـەرمەزاری ڕۆژی قیامەتمان مەکە. تۆ لە ھەر پەیمانێ بیدەی لاریت نیە.﴾آل عمران:١٩٠-١٩٤.

ئەو وەسـفە گەورەیـە لـە پـەروەردگاری جیھانیانـەوە ئـەو لوتکـە جوانـە وێنـا دەکات، کە لە چرکەیەك یادی خـوا کاریگەریەکـەی لـە دەرونـدا دروسـت دەبێـت، کەواتە دەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێت، کە بەھـەموو شێوەیەك یـادی خـوا دەکـەن، بەپێوە و بە دانیشتنەوە لەسەر تەنیشت، واتە لە ھەموو حاڵەکانیاندا؟ ئەی دەبێ کاریگەری ئەو یادە چۆن بێت لەسەر دەرونیاندا؟!

لەلایەکی ترەوە بەڕاستی یادی خوا بە دەرونی ئەوکەسەدا نایەت، کە دەرونـی داڕوخاوە و بەرەو ئارەزوەکان اکێش کراوە.. چونکە ئەوە چرکـەکانی بێئاگاییـە، کـە مـرۆڤ تێیـدا لـە یـادی خـوا بێئاگا دەبێـت، بەڕاسـتی کاتـێ مـرۆڤ یـادی پەروەردگاری دەکات، کە بـەرەو بـەرزیی ڕوی کردبێـت، ئەگـەر ئـەو پێوانەیـەمان پێبـوو، بۆمـان دەردەکـەوێت ھـەموو چرکـەکانی یادکردنـەوەی خـوا لـە ڕاسـتیدا چرکەی بەرزبونەوەیە.. کەواتە دەبێ ئەوانە چۆن بن، کە بەپێوەو بە دانیشـتنەوە و لەسەر تەنیشـتیان یـادی خـوا دەکـەن، واتـە لـە ھـەموو بارێکیـاندا چـەند بـەرز بوونەوەو چەند چەسپاون لەسەر بەرزی؟! بەڕاسـتی ئـەوە شـتێکی جوانـە کاتـێ لەسەر حەقیقەتەکەی خۆی وێنای بکەین.

بەرزبوونەوە، لەسەر دەرونی مرۆڤ کارێکی زەحمەتە، ھەتا لەسـەری ڕادێـت! چونکە مستێ قوڕ قورسایەتی‌یەکی ھەیە ھەمیشە بەرەوخوار دەچێـت، پێویسـتی بـە بەرزکردنـەوەی بـەردەوام ھەیـە، ھـەتا ھاوسـەنگ دەبێـت و پێویسـتی بـە بەرزکردنـەوەی زیـاد دەبێـت بـۆ ئـەوەی پاڵنـەری بەرزبوونـەوە زاڵ بێـت بەسـەر پاڵنەری دابەزیندا..

بەڕاستی ئامرازی بەرزکردنەوە، لە ناخی فیترەتیەوە لە پێکهاتەکانی مرۆڤدا هەیە، ئەویش فوە بەرزەکەیە تێیدا: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ۝٧١ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ: کاتێ کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ڕاگەیاند: وا خەریکم مرۆیەك لە قوڕ دروست بکەم، هەرگا لەشیم تەواو کرد و لە گیانی خۆم فوم پێدا کرد، هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص: ٧١-٧٢.

بەڵام ئەوە نەڕێی ئەوە ناکات، کە کۆششێك هەیە دەبێ بدرێت بۆ ڕاهێنانی ئەو ئامرازە لەسەر کارکردن؛ ئەویش ئەو کۆششەیە، کە پەروەردە پێی هەڵدەستێت. لەبەر ئەوەی ئارەزووەکان لەناو پێکهاتەکانی لاشەی مرۆڤدا لەخۆیانەوە کار دەکەن بەپێی ئەوەی سروشتی وایە، کە خۆشەویستە و ڕازاوەتەوە بۆ مرۆڤ، ورووژێنەرەکانیشی ئامادەن لەناو جۆرەکانی خۆشی، کە ژیانی دنیای پێ دەڕازێنرێتەوە. جا ئامرازی بەند و بەست(ضبط) کردن، کە ئارەزوو لە سنورێکی دیاریکراو بەند دەکات، وزەی زیندوو بەرز دەبێتەوە، پاشان بۆ بوارە بەرزەکان، بوارەکانی بەها و کارە بەرزەکان، کە خوا خۆشی دەوێن..
ئەم ئامرازە پێویستی بە مەشق کردن هەیە بۆ ئەوەی بەکارەکانی هەڵسێت، هەروەك چۆن منداڵ پێویستی بە ڕاهێنان هەیە لەسەر ڕۆیشتن، بۆ ئەوەی بەرگەی ڕاکێشانەکانی زەوی بگرێت، لەگەڵ ئەوەی توانای لەسەر ڕۆیشتن لەناو پێکهاتەکانی لاشەیدا شاراوەتەوە و هەیە، لەوکاتەوە خوا دروستی کردووە، ئەگەر ڕاهێنانی پێنەکرا، ئەوا پێگرتنی دوادەکەوێت، یا ناتوانێ بڕوات، ناچار بە کاگۆلکێ دەڕوات:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ۝١٤ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن

تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ: ئارەزوی ژنان کردن و کوڕی زۆر پەیداکردن و دەسکەوتنی کۆمای زلی زیو و زێڕان و ڕەوەئەسپی بە درۆشم و ولسات و زەوی کێلانێ، بۆ مەردم رازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین، بەلآم وەختێ دێنەوە بەردەستی خودا، پێدەزانن کە زۆر لەوە باشتر هەیە.. بێژە: ئاخۆ گەرەکتانە پێتان بێژم لەمە باشتر چۆنە؟ بۆ ئەوانەی لە هەڵە خۆدەپارێزن، لەلای پەروەردگاریانەوە باغاتێکی وایان دەبێ، جۆباریان بەبەرزدا دەڕوا و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن و چەند ژنی پاك و بێگەرد و سەرەڕای ئەو هەموو خۆشیەش، رەزای خودایان پێدەگا. خودا چاوی لە عەبدەکانی خۆی هەیە. ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان! ئێمە بڕوامان پێت هەیە؛ سا تۆ لە گوناهمان ببورەو لە سزادانمان-بەئاگر- بپارێزە، ئەو کەسانەی خۆڕاگرن و بەڕاستیانە و ئامادەی هەر فەرمانێکن و مالی خۆیان لەڕای خودا بەخت دەکەن و هەموو ڕۆژێ-سەرلەبەیان- لەخودا دەپاڕێنەوە لێیان خۆش بێ.﴾آل عمران:١٤-١٧.

ئەوە داخوازیەکانی ئارەزوە، ئەوەش ئامڕازەکانی بەرزبوونەوەیە.

چاکێتی گەورەی ئیسلام لەم بوارەدا ئەوەیە، کە کاردەکات بۆ بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ سەرەوەتر بۆ هاوسەنگ کردنی داخوازی ئارەزووەکان، پالی نانێت بۆ ناوچەیەك، کە هێزی ڕاکێشانی زەوی تێدا نەبێت، وەك ڕەهبانیەکان و هیندۆکیەکان و بوزیەکان دەیکەن، ڕەنگە ئا ئەمە ئاسانکاری بۆ مرۆڤ بکات، کە بۆ بۆشایی ئاسمان بەرزبێتەوە، بەلآم وای لێدەکات ئاوەدانکردنەوەی زەوی و پاراستنی لە گەندەلی، بەهۆی جیهاد و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێبەستن لەخراپە فەرامۆش بکات، ئەوانە هەموو ئەرکباریەکانی خواییێ، خوا فەرمانی بە کردنیان داوە، چونکە دەزانێ کارچاکی ژیانی مرۆڤی تێدایە، هەر خۆیشی دروستی کردووەو دەزانێ چی چاکی دەکات و چی بۆ چاکە:

، ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ: ئاخۆ کەسێ ئافراندویە، چۆن نازانێ؟ وردیلەبین و ئاگادار هەرخۆیەتی.﴾الملك:١٤.

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو خودایە لەم خاکەی وەدی هێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود:٦١.

﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ: ئەوانەی وا ئەگەر لەسەر زەویەدا دایانمەزرێنین، نوێژکەر و زەکات دەرن و فەرمان بەچاکە دەدەن و بەر لە کاری خراپ دەگرن. سەرەنجامی هەموو کاریش هەر بۆ خوایە.﴾الحج:٤١.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ پێژم کە لە ئازارێکی بەژان رزگارتان دەکا؟ بڕوا بە خوا و بە پێغەمبەری ئەو بێنن و بە دارایی و گیانی خۆتان لەڕای خودا تێ بکۆشن؛ ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن.﴾الصف:١٠-١١.

هەروەها هەر خوا ڕێنمایی خەڵك دەکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و خۆشی وەرگرتن لە شتە پاکەکانیدا، بەرەڵای ناکات نوقم بێت لە چڵپاوی ئارەزووەکان، چونکە ئەوکاتە خاو دەبێتەوە و گەندەڵ دەبێت، ئەو ئەرکانەش، کە فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە داوای دەکەن و جیهاد لەڕێی خودای لەلا گران دەبێت، چونکە لە هەستیا چەند پێشگرێك دەردەکەون، کە دەبنە لەمپەر لەبەردەم خۆشیەکانی مرۆڤ.

﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَـٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ: ئەگەر دەسکەوتێ بێڕەنج و سەفەری ئاسانا لەڕێ با، هاسان بەدوتدا دەهاتن، بەڵام مەودای دور و سەختیان لا گران هات.﴾التوبة:٤٢.

﴿وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ: هەرگاو سورەتێك دێتە خوار كە بڕوا بەخوا بهێنن و لەتەك پێغەمبەرەكەیدا بچنە خەزا، خاوەن دەسەڵاتەكانیان دێن ئیزن لەتۆ دەخوازن و دەڵێن: واز لەئێمە بێنە، با ئێمەش لەماڵ بمێنین؛ وەك خانەنشینانی تر... بەوەرازی بوون لەگەڵ بەجێماوەكان بن؛ مۆریان بەسەر دڵەوەیە و هیچ تێناگەن.﴾التوبة:٨٦-٨٧.

بەڕاستی ئیسلام كاردەكات بۆ ئەوەی مرۆڤ هاوسەنگ بێت لەنێوان ئەو دوو ڕەگەزەی لێی پێك هاتووە: كە مستێ قوڕە و فوی گیانە بۆ ئەوەی لە یەك كاتدا كار بۆ دونیا و كار بۆ ئاخیرەت بكات: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ: ئەوە كە ئەم زەمینەی بۆ كەوی كردون، شانەوشان تێیدا بگەڕێن و لە بژێویەكەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك:١٥.

* * *

ئامرازی گەورەی دەستی پێغەمبەرﷺ، بۆ پەروەردەكردنی هاوەڵەكانی، قوڵكردنەوەی بڕوا بەخوا و ڕۆژی دوایی لە دەرونیاندا و بیرخستنەوەی خوای پاك و بەرز بووە بە بەردەوامی، هەروا وای ڕادەهێنان، كە بەپێی توانایان لەگەڵ خوادا بژین. پێغەمبەرﷺ لەم كارەدا خۆی پێشەنگی گەورەیان بوو، هەروەك لە كارەكانی تریش هەروا بووە.

بەڕاستی پێشەنگ كاریگەرییەكی زۆری هەیە لە پرۆسەی پەروەردەدا.. خوا كە دەرونی مرۆڤی دروست كردووە خۆی دەزانێ، كە ئامۆژگاری بەتەنها بەس نییە، جا ڕەوانبێژی و هێزی ئەو ئامۆژگارییە هەرچەند بێت، گەر دڵی مرۆڤ هەڵی نەگرێت و لەخۆیدا نەینوێنێ و لە بەردەم خەڵكدا نەیگۆڕێت بۆ واقیعێكی بەرچاو، پاشان خەڵك بانگ بكات بۆ شوێنكەوتنی، بەكردەوەش پێشەنگیی بۆ دەرخستن، كە شوێنكەوتن چۆن دەبێ.

خوای بەرز دەیتوانی قورئان بەنوسراوی لە چەند پەڕاوێکدا بنێرێتە خـوارەوە، پاشان عەرەبە نەخوێندەوارەکان وا لێکات بیخوێننەوە.. بەڵام خـۆی کارناسـك و ئاگادارە بـە دەرونـەکان، کـە ئـەو کـارە لەسـەر ئـەو شـێوەیە وەرنـاگرن و وەك پێویستە کاریگەری نابێت، کە کارەکە بگۆڕێت بـۆ جوڵەیـەکی واقیعـی هـێزدار و توانای دەرچوونی هەبێت، بەڵکو خوای پاك و بەرز قورئـانی بـۆ سـەر دڵـی مرۆڤ ناردە خوارەوە، کە بەتەواوەتی بینوێنێ و تەرجەمەیـەکی واقیعـی بکـات و خـەڵك ببینن، جا ئەو کەسە حەز بەو واقیعە دەکات کە خـوا دڵـی گوشـاد کردبێـت، جـا ئەوکاتە دڵی بۆی شەیدا دەبێت و ملکەچی دەبێت، ئنجا دێتە ناو ئایینی خوا.

لە خاتوو عائیشە پرسیار کرا دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ، ئـەویش گوتـی: ((كانَ خُلُقُهُ القُرآن: ڕەوشتی قورئان بوو)).[1]

لەسەر ئەو شێوەیە لەفەرمودەی خوای بەرز تێدەگەین کە دەفەرموێت:

﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ: پێغەمبـەریش لـە ڕاگـەیاندن بەولاوە هیچی تری لەسەر نیە.﴾النور: ٥٤.

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ: وا بـۆ تـۆش ئـەم کتێبـەمان نـارد، تـا خـەڵکی لێ تێبگەیـەنی و شـایەتا بیربکەنەوە.﴾النحل: ٤٤.. ڕاگەیاندن تەنها ئـەوە نیـە پێغەمبـەر بـە خـەڵك بڵێت: پەروەردگارتان ئەوە و ئەوەتان پـێدەڵێت.. ڕونکردنـەوەش نـە محازەرەیـە و نـە وانەی تیۆریی، تا پێغەمبەر بە خەڵکی بڵێتەوە..

ئەگـەر ڕاگـەیاندن بـەو مانایـە بێـت، ڕونکردنـەوەش بـەو واتایـە بێـت، ئـەوا هەردوکیان پێویستن بۆ ڕاگەیاندنی خەڵك بە کاروباری ئایین، ئەوانەی کە نایزانن.. بەڵام گۆڕینـی ئەو زانستە بۆ واقیعێکی دەرونی، ئەوا بە دەوری خۆی دەگۆڕێت بـۆ واقیعێکی کردەیی، جا کارێکیتر هەیە پێویستی بەوەیە، کە پێغەمبەر فەرمودەی پەروەردگاریان بەواقیعی بە خەڵك ڕابگەیەنێت، کە لە کـردەوەدا ڕەنـگ بداتـەوە و خـەڵك چـاوی لێبکـەن، کـە بـە وانەیـەکی کردەیـی فـێر بـن چـۆن هەڵسـن بـە

1: أخرجه: أحمد.:

جێبەجێکردنی، لەوەشدا وانەیەك هەیە بۆ بانگخوازان، لە دواییدا بەدرێژی باسی دەکەین.

پێغەمبەرﷺ هەمیشە یادی خوای دەکرد، هەموو ژیانی لەگەڵ خوادا دەژیا، دڵی لە یادی خوا بێئاگا نەدەبوو و زمانی لەیادی خوا سارد نەدەبۆوە، پەروەردگاری پەروەردەیەکی زۆرباشی کردبوو، ئەوەندەی وزە دابوێ، کە بتوانێ ئەو پەیوەندیە هەمیشەییەی بەخواوە هەبێت.. بەڕاستی ئەوە بۆ مرۆڤ کۆششێکی ماندوکەرە..

مرۆڤ نیە بتوانێت، هەتا هاوەڵەکانی پێغەمبەریش، کە هەموو ژیان لەسەر ئەو ئاستە بەرزە بەرنە سەر، ئەو ئاستەی پێغەمبەریﷺ لەسەر بوو، لە پەیوەندی بەردەوامی بەخواوە هەروا یادی بەردەوامی بۆ خوای پاك و بەرز لە هەموو بار و چرکەکانی ژیانیدا.

ئەمە تایبەتمەندیەکە، خوا تایبەتی کردووە بە پێغەمبەرەکانیەوە –علیهم السلام– لەمەشدا بەشێکی زۆری تایبەت کردووە بە گەورەی پێغەمبەرانەوەﷺ، بەڵام صەحابەکان دوای پێغەمبەرەکان چاکترین مرۆڤن، لەگەڵ ئەوەشدا سکاڵای حاڵی خۆیان بردە لای پێغەمبەرﷺ، وتیان: کاتێ لەگەڵ تۆدایـن لەسەر بارێکین، کە لێت دوردەکەوینەوە دەکەوینە بارێکی ترەوە، وەك ئەو بارە نیە، کە لەگەڵ تۆداین، ئەویش فەرمووی: ((وَالَّذي نَفسي بِيَدِهِ لَو تَدُومُونَ عَلى مَا تَكُونُونَ عِندي وَفِي الذِّكر لَصافَحَتْكُمُ المَلائِكة عَلى فَرشكُم وطُرقكُم. وَلَكِن يا حَنظَلَة ساعة وَساعة: بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بەردەوام وەك ئەو کاتە وابن کە لای منن، یا لە یادکردن دان، فریشتەکان لەسەر جێگاکانتان و لە ڕێگاکانتاندا تەوقەیان لەگەڵدا دەکردن، بەڵام حەنزەڵە ! ساتێك بۆ زیکرکردن و ساتێك بۆ لەهوی حەلاڵ.))[1]

لەگەڵ ئەوەی ئەو ساتەی صەحابە سکاڵایان تێدا کرد ساتی دابەزین و ساتی بێئاگایی نەبوو لە یاد(ذکر)ی خوا، وەصفەکەی خوا بەسە بۆیان، کە ئەوان یادی خوایان بەپێوە و دانیشتنەوە و لەسەر تەنیشتیان دەکرد، بەڵام جیاوازی

---

١ رواه مسلم والترمذي وأحمد وابن ماجة.

نێوان ئەو ساتە و ئەو ساتەی تێیدابوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ جیاوازی پلەبوو، نەك لە جۆردا.

دەگەڕێینەوە بۆ ئەو وەسفە جوانەی، کە خوا وەسفی صەحابەی پێکردوە ﷺ..

ئەوان بەپێوە و بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوایان دەکرد، ئەو یادکردنەی خوایان چۆن بووە؟ ئایا ئەو یادەیە، کە لەسەر ڕێگای صۆفیگەریی دەبێتە لەناوچون و مردن، گۆیا لەناوچون(فناء) لای ئەوان حەقیقەتی بوونە؟ یان ئەو یادەیە، کە دەبێتە هۆی ئامادەبوونی وزەی مرۆڤی لە واقیعی بینراودا و کۆبوونی بۆ ئەوەی کاربکات لە ڕەزامەندیەکانی خوادا؟

ئەوان یادی خوایان دەکرد بۆ ئەوەی لەخۆیان بپرسن: خوا لەم کاتەدا چی لەئێمە دەوێت؟ جا ئەگەر خواستی کات جیهاد لەڕێگای خوا بوایە، ئەوە یادەکە پاڵنەرە بۆ جیهاد.. ئەگەر خواستی کات بەدەستهێنانی زانستی بێت، کە فەرزێکە لەسەر هەموو موسڵمانێك، ئەوا یاد(ذكر)ەکە پاڵنەرە بۆ بەدەست هێنانی زانست.. ئەگەر خواستی کات کۆشش بوایە بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی حەڵاڵ، یا بەخشین لەڕێگای خوادا، یا ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەپێی پێویستی بەرنامەی خوایی، ئەوە یاد(ذكر)ەکە پاڵنەریەتی، ئەگەر خواستی کات ئەوە بێ، هەڵسوکەوتی چاك بکە لەگەڵ خێزاندا، ئەوە یادی خوا پاڵنەرە بۆ هەڵسوکەوت کردن بەچاکە.. هەروەها لەهەموو ئەرکەکانی خوایی و هەموو بوارەکانی کار لە واقیعی ژیاندا.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یادی خوایان دەکرد بۆ ئەوەی لەخۆیان بپرسن ئەوان — ئەو کاتە— لەڕەزامەندی خوادا لەکوێن؟ ئایا ئەوان لەو باوەڕەدان، کە خوا لێیان ڕازی دەبێت؟ جا ئەگەر بەو شێوەیە بوون، سوپاسی خوایان دەکرد و کاریان دەکرد بۆ زیاتر بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، بەزیاتر نزیکبوونەوە لەخواوە بە کردنی ئەو کارانەی خوا خۆشی دەوێن، ئەگەر بەو شێوەیەش نەبوان هەروەها یادی خوایان دەکرد، بەڵام بە گۆڕینی ئەوەی تێیدابوون: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن

يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ: ئەو كەسانەی هەرگا كاری خراپ دەكەن، یا ناحەقی لەخۆ دەكەن، خودا لەبیر نابەنەوە و لەبەری دەپاڕێنەوە: لە خەتاكانیان ببورێ؛ بێجگە خوداش كێ لە گوناهان دەبورێ؟ جا ئەوانە كە زانیویانە هەڵەیە، پێداگر نین.. ئەوانە پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان لێبوردنە و باغاتێكە كە جۆباران بەریاندا دەڕۆن و هەر لەو باغاتە دەمێننەوە. بەه! چەند جوانە پاداشتی ئاكارچاكان.﴾آل عمران:١٣٥-١٣٦.

با سەیری ئەو ئایەتانە بكەین، كە لە سورەتی (آل عمـــران)دا ئاماژەمان بۆ كردن، تا ببینین یادكردنی خوا دەبێتە مایەی چی؟ ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ: ئەوانەی بەپێوەو بە دانیشتنەوە لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەكەن و بیردەكەنەوە لە بەدیهێنانی ئاسمانەكان و زەوی﴾آل عمران:١٩١.

بەڕاستی خواستی كات لەهەموو كاتەكانی بیركردنەوە لە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی پێویستە و خوازراوە، بۆ ئاشنابوون لەو هەقەی لەناو پێكهاتوەكەیدا هەیە: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ: ئاسمانەكان و زەمینی بە ڕاستی وەدی هێناوە و وێنەی بۆ ئێوە كێشاوە و شكڵی فرەجوانی داناوە و هەر بۆ لای ئەویش دێنەوە.﴾التغابن:٣.

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ: ئێمە ئاسمان و زەویمان- ئەوەش كە لە بەینیاندایە- بە خۆڕایی دروست نەكرد؛ ئەو كەسانەی وا بیردەبەن، خوانەناسن. های لەوانەی خوانەناسن، بۆ ئەو ئاگرەی دەیچێژن.﴾ص:٢٧..

بەڕاستی ئەوان هەستیان بەوانە کردبوو، کە پەروەرگاریان فێری کردبون، هەروا هەستیان بە ڕێکوپێکی یاساکانی خواییان کردبوو، جا چ ئەو پەیوەستن بە پێکهاتەی مادیی، یا بە ژیانی مرۆڤایەتییەوە، کەوا وەدیهێنانی بونەوەر نابێت پوچەڵ بێت، یا بێهودە بێت، حیکمەتیش لە هەموو بەشەکانیدا دیار و بەرچاوە.. کاتێ بیرکردنەوەیان دەگاتە ئەو ڕادەیە، ئنجا دەزانن ژیانی دونیا کۆتایی دەوران نیە، نابێت واش بێت، مرۆڤ هەیە ستەم دەکات، هەتا دوا هەناسەی ژیانی بە ستەمکاری دەمێنێتەوە.. جا ئەگەر ژیانی دونیا کۆتایی دەورانەکە بوایە، ئەدی هەق لەکوێیە؟ ئەو کاتە ژیان بێهودە و بێمەبەست بوو هەقی تێدانەبوو.

لێرەدا یادی خوا، بیرکردنەوە لەو هەقەی، کە لەو دروستکراوە شاراوەتەوە، دەیانگوێزێتەوە بۆ یادی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ، پەناش بەخوا دەگرن لە ئاگر: ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ: هەر یادی خوا دەکەن و لە سازدانی ئەم ئاسمانان و زەمینە ڕادەمێنن، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! تۆ ئەم دەزگایەیەت بەفیڕۆ سازنەداوە، پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە؛ هەر بۆ خۆشت لە ئازاری بەئاگرمان بپارێزە.﴾آل عمران:١٩١.

ئەگەر ئاگریان وەبیرهاتەوە، لەخوا دەپاڕێنەوە، کە ڕزگاریان کات، وەك بڵێی شایستەیی و گونجاوی خۆیان دەخەنە بەردەم خوای گەورە، کە بەهۆیەوە داوای ڕزگاربون لەئاگر دەکەن: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ: پەروەردگارمان! ئێمە بیستمان بانگ ڕایەڵێك گازی دەکرد کە باوەڕی بە پەروەردگارتان بێنن. ئێمەش بڕوامان هێنا، سا بۆ خۆت ئەی پەروەردگارمان! لە گوناهانمان خۆش ببە و هەر خراپەی کردومانە، بیکوژێنەوە و لەگەڵ ئەوانەی پیاوچاکن بمانمرێنە.. پەروەردگارمان!

- ئەوشتانەش بەنێمە ڕەوا ببینە کە لە زمانی پێغەمبەرانتەوە بەڵێنت پێمان داوە؛ شەرمەزاری ڕۆژی قیامەتمان مەکە، تۆ لە هەر پەیمانێ بیدەی لاریت نیە.﴾آل عمران:١٩٣-١٩٤..

خوا وەڵامی ئەو پاڕانەوە ملکەچیەی بەندەکانی دەداتەوە، بەڵام بۆچی خوای پاك و بێگەرد وەڵامیان دەداتەوە؟ تەنها لەبەر یادەکەیە؟ لەبەر بیرکردنەوەکەیە؟ لەبەر تێڕامانە؟ لەبەر لاڵانەوەکەیە؟ هەموو ئەوانە لە بڕواداری ئیمان ڕاست خوازراوە: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ: پەروەردگاریان ئاوا بەدەنگیانەوە هات، کە: من کردەی هیچ مرۆیەك- لەنێر و مێ- بەبێ پاداش ناهێڵمەوە؛ گشتتان لەلای من چون یەکن. ئەو کەسانەی لەزێدی خۆ دەرکراون و لە ڕای من ئازاریان دیوە و چونە خەزا و دژی منیان کوشتبێ یان بەکوشت چووبن، بێگومان گوناهیان دەکوژێنمەوە و لە پاداشتی کردەوەیان دەیانخەمە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوا؛ کە ئەمە چاکەی خودایە دەربارەیان؛ پاداشتی هەرەباشیش وا لای خوایە.﴾آل عمران:١٩٥

لێرەدا ئەم ئایەتانە دەبنە وانەی پەروەردەیی، کاتێ خوا بەو شێوە جوانە وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ دەکات: ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ..﴾ ئەوە یادکردنێکە، کە لە واقیعدا دەبێتە مایەی کردەوەیەکی بەرچاو. کۆچیان کرد و دەرکران لەسەر ماڵ و حاڵیان، لەڕێگای مندا ئازاردران ئارامیان گرت، جەنگان و کوژران.. خواش وەڵامی دانەوەو پاڕانەوەکانیانی وەرگرت.

لەسەر ئەو یاد کردنە پێغەمبەرﷺ هاوەڵەکانی پەروەردە کرد، یەکەم جار بەپێشەنگی خۆی، پاشان بە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی و بەدواداچوونی و

بەردەوامیی و سەرپەرشتیکردنی و چاودێری کردنی، هەتا بەرەو ئەو لوتکە مرۆڤیانە ڕۆیشتن، کە لە مێژوودا وێنەی نەبوو.

* * *

با ئێستە سەیر بکەین بزانین پێغەمبەرﷺ چی دەویست، ئامانجی چیبوو کە ئەو هەموو هەوڵە گەورەیەی دا، بۆ پەروەردەکردنی ئەو هاوەڵانەی.. تەنها بۆ ئەوەی ببنە حەواری خۆیﷺ؟ تەنها بۆ ئەوەی ببنە بڕواداری ڕاستەقینە؟ بەڵێ بێگومان ئەوە ئامانجێکی بەرزە و شایستەی ئەوەیە، کە هەوڵی زۆری بۆ بدرێت، بەڵام! ئایا ئەو هەموو هەوڵەی دەوێت؟

بەڕاستی بەشێك لەو هەوڵە بەس بوو بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئامانجە لەسەر چاکترین شێوە، کە پێغەمبەرﷺ حەزی پێدەکرد! ئەوەندە هەوڵە بەس بوو، کە عیسای کوڕی مەریەمعليه السلام دای لە پەروەردەکردنی حەواریەکانیدا، ئەوانەی بەدەوریا بوون و دڵسۆزی بوون و دوای خۆی ئایینەکەیان بڵاوکردەوە، نمونە بوون لە دڵنەرمی و میهرەبانی و دونیا نەویستی و ڕەوشت پاکیدا: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ: پاشان بەشوێن ئەواندا گەلێك پێغەمبەرمان ناردن؛ دوای ئەوانیش عیسای کوڕی مەریەممان نارد و ئینجیلمان پێ خەڵات کرد. دلۆڤانی و بەزەیشمان خستە دڵی پەیڕەوانی؛ ئەو ڕەبەنیەش کە هەیانە ئێمە بۆمان نەنوسیون، بۆ خۆیان دایانهێناوە. ئەم کارەشیان بۆ ڕەزامەندی خوا بو.﴾الحديد:٢٧. بەڵام پێغەمبەرﷺ نەیدەویست کۆمەڵێك لە بڕواداران پەروەردە بکات، وەك ئەو هەموو بڕوادارانەی پێغەمبەرەکانی پێش خۆی پەروەردەی کردبوون، بەڵکو کارێکی گەورەو بەرزتری دەویست.. دەیویست ئەو بنکە پتەوە پەروەردە بکات، کە بە ڕۆڵی خۆی پێك بێت:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا.﴾آل عمران:١١٠.

جیاوازی نێوان هەر کۆمەڵێك لەو کۆمەڵە بڕوادارانەی، کە پێغەمبەرە بەڕێزەکان پێش محمدﷺ پەروەردەیان کردبوو و، نێوان ئەم کۆمەڵە بڕوادارەی پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوون؛ لە ئەرکبارییەکانی خواییدا دابوو، کە خوا دابووی بەسەر ئەوان و ئەمانیشدا و ئەو ئەرکەش، کە لەمانیش و لەوانیش داواکرابوو.

بەڵام کۆمەڵە بڕوادارەکەی پێشوو خوا دەربارەیان فەرمویەتی:

﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ: فەرمانیشیان هەر ئەوەندە پێدرابوو کە دەبێ خواپەرست بن و لەدین ئەودا دڵپاك بن و بەرەو هەقانەت بڕۆن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، کە ئەمە دینی دروستە.﴾البینة:٥.

کۆمەڵەکەی پێغەمبەریشﷺ هەمان ئەو ئەرکانەیان بەسەردا درابوو، کە بەپاکی خوا بپەرستن و ڕونەکەنە بتپەرستی و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، پاشان ئەرکی تریش درابوو بەسەریانا، کە ئەو ئەرکانە تایبەت کرابوو بەوانەوە، کە نەدرابوو بە نەتەوەکانی پێشوو:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا؛ فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن. باوەڕیشتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران:١١٠.. ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بکا.﴾البقرة:١٤٣.

نەتەوەکانی پێشوو سەریان هەڵدا بۆ ئەوەی بڕوا بەخوا بهێنن و بەردەوام بن و تەنها لەسەر ئەو بڕوایە ڕاستاڵ بن، ئەم ئوممەتەش بۆ خەڵك سەری هەڵدا، بۆ ئەوەی ببێتە نمونەیەك، کە هەموو مرۆڤ بێنێتە سەرڕێ ڕاست.. جیاوازی هەیە

لەنێوان ئامادەکردن و پێکهێنانی کەسێکدا، کە چاوەڕێی ئەوەی لیَ بکریَ، هەر تەنها بەردەوام و ڕاست و ڕێك بێت لە سنوری قەومێکی دیاریکراودا، لەنێوان کەسێکدا کە چاوەڕێی ئەوەی لیَ بکریَ ببێتە نمونەیەك چاوی لیَبکرێت، نەك هەر لەناو قەومەکەی خۆی، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو مرۆڤایەتی کاتیَ لە هەر شوێنێکی سەر زەوی پێی بگات.

بنچینەکە یەکە، ئەویش پەرستنی خوای تاك و تەنهای بیَهاوبەشە، بەڵام جیاوازیەکە هەر دەمێنیَ لەنێوان ئەو بناغەیەدا، کە دەتەویَ خانویەکی قەبارە بچوکی لەسەر دروست بکرێت، کە سنورداربێت، هەروا بناغەیەکیش دەتەویَ لەسەری بینایەیەکی بەرزی فراوانی لەسەر دروست بکرێت، هەردوکیشیان پێویستیان بە وردەکاری هەیە، هەردوکیان پێویستیان بە کۆشش هەیە، بەڵام چۆن ئەو بناغەیە و ئەو بناغەیە، ئەو کۆشش و ئەو کۆششە، ئەو وردەکاریە و ئەو وردەکاریە دەبن بەیەك.

لەسەرەتاوە جیاوازیەکە لەکتێبەکەی خوادا هەست پیَدەکەین..

هەموو نەتەوەیەکی بڕوادار بانگکراون بۆ بڕوابوون بەخوا و ڕۆژی دوایی، بەڵام کتێبێك نیە لەناو ئەو کتێبانەی، هاتونە خوارەوە لەم مەسەلەیە بەو شێوەیە تەرکیزی کردبێتە سەر ئەو دوانەی لە قورئاندا تەرکیزیان کراوەتە سەر و ئەوەندە فراوان بێت. هەموو نەتەوەکان ئەرکە داوالێکراوەکانیان بەستراوە بەو کێشە سەرەکیەوە کە بناغەی هەموو شتێکە و شوێنی دەرچونی هەموو شتێکە، بەڵام پەیامێك نیە ئەوەندە بەتوندی ئەو ئەرکانەی بەستبێت بەو کێشە سەرەکیەوە وەك پەیامەکەی دوایی بەستویەتی، لەگەڵ زۆری ئەرك لەناو ئەو پەیامەدا و لەگەڵ فراوانی و گشتگیریەتی بۆ هەمو بوارەکانی ژیان.[1]

پاش ئەوە جیاوازیەکە دەبینین -لەسەر هێڵێکی تەریب بەوەی لە کتێبەکەی خوادا هاتووە- دەبینن لە بەرنامەی پێغەمبەردا، کە پێغەمبەر هاوەڵەکانی پیَ پەروەردە کردبوو، جا چ لە تەرکیزبوونی بەرنامەکە لەسەر کێشەی بڕوا بەخوا و

---

١ ئەگەر حەزت کرد سەیری بەشی (مقتضيات لا اله الا الله في الرسالة المحمدية) بکە لە کتێبی (لا اله الا الله عقيدة وشريعة ومنهاج الحياة).

ڕۆژی دواییدا بێت، یا لە توندکردنی پەیوەست کردنی هەموو ئەرکەکان- بیروبڕوایی و ڕەفتاریی- بەو کێشە سەرەکیەوە بێت. لە قۆناغی مەککەدا هێشتا یاساکان و ئەو ڕێنماییانە نەهاتبونە خوارەوە، کە ژیانی ڕامیاری و ئابوری و کۆمەلایەتی کۆمەڵە بڕوادارەکە ڕێك بخات، بەڵکو هەموویان تایبەت بوون بە چاندنی بیروباوەڕی ڕاستەقینە لە دەرونیاندا، هەروا ئامادەکردنی ئەو دەرونانەش بۆ پێویستیەکانی ئەو بیروباوەڕە، کە لە عیلمی خوادا دانراوە، لەکاتی گونجاویدا بێتە پێشەوە.

ئێستا باسی ئەو بڕوادارانە دەکەین، کە بڕوایان هێنابوو بەوەی جگە لەخوا خوایەکی تر نیە و محمد نێرراوی ئەوەﷺ بڕواشیان بە زیندووبوونەوەو گەڕانەوەو لێپرسینەوەو پاداشت هەیە، چونکە ئەوانە ئەو بنکە پتەوە بوون، کە پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوون، ئەو بنکە پتەوەش لەم بەشەدا بابەتی باسەکەمانە..

بەلام لەیادمان نەچێت بیرتان بخەمەوە، کە پێغەمبەرﷺ چەند ئازاری توش بوو لە نیشاندانی ئەو کێشەیەدا و گەیاندنی بەخەلك، جا لە ستەمکارەکانی قوڕەیشەوە بوبێت کە لەسەنگەردا وەستابوون بەرامبەر بانگەوازەکە و دژی دەجەنگان بە هەموو هۆیەکانی جەنگەوە، یان لەو جەماوەرەوە بێت، کە دژی دەجەنگان لەبەر ئەوەی پێچەوانەی شتە باوەکانی بوو، هەروا لەبەر ئەوەی ئەوانە هەر لەو کاتەدا بەندەو کۆیلەی ئەو ستەمکارانە بوون، جا هەستیان پێکردبێت، یا نەیانکردبێت، دەرونیان پێی ڕازیبوبێت، یا ڕقیان لێی بوبێت..

لەم ماوەیەی کە ئێمە لێی دەدوێین تەنها تەرکیز لەسەر داخوازی و پێویستیەکانی (لا اله الا الله) دەکەین.

بەلام ئەو کاتە گۆکردنی (لا اله الا الله) نیشانەیەکی ئاشکرای بڕوا بوو، چونکە لەو کاتەدا هەرکەس بڕوای ڕاستەقینەی نەبایە شایەتمانی بە دەمدا نەدەهات، ئەوانەی بڕوایان دەهێنا دەهاتنە لای پێغەمبەرﷺ بڕواهێنانەکەی خۆیان بۆی دەردەخست، ژیانی خۆیان دەخستە مەترسیەوە و خۆیان دەخستە بەر ئەو ئازارەی لە هەموو دۆڵ و شیوێکدا خۆی بۆ مات دابوون و هەموو نەفامی چواردەوری دەبونە دوژمن بەو بڕواهێنانە، بە ئاشکرا ئینکاری‌یان لێدەکرد و

ڕقیان لێی دەبووەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەو کاتە گۆکردنی شایەتمان نیشانەی ئیمانی ڕاستەقینە بوو، چونکە کەس خۆی نەدەخستە بەر ترسی گۆکردنی شایەتمان، ئەوانە نەبونایە، کە بەڕاستی بڕوایان هێنابوو، ڕاستی بڕواکەیان گەیشتبوە ڕادەی یەقین، جا ئایا پێغەمبەرﷺ بەوە وازی دەهێنا، کە لەناو دڵیانا ڕاستگۆ بن و بەزمان بیڵێن؟!

ئەگەر بەوە وازی لێبهێنانایە، ئایا ئەو بنکە پتەوە دادەمەزرا، کە خوا ڕوی زەوی پێ وەرچەرخاند؟

کەواتە بۆچی لە ماڵەکەی ئەرقەمدا لەگەڵیانا کۆدەبوەوە، بۆچی هاوەڵی دەکردن، بۆچی چەند سەعاتێ لەگەڵیاندا دەیبردە سەر؟ بۆ ئەوەی پێیان بڵێ جگە لە (الله) کەس شایستەی پەرستن نیە، هەرچەندە ئەوان بە تەواوەتی بڕوایان هێنابوو؟ یان بۆ ئەوەی پێیان بڵێ بە زمانتان بڵێن جگە لە (الله) کەس شایستەی پەرستن نیە، هەرچەندە وتیشیان؟ بەڵکو بۆ ئەوە لەگەڵیان کۆدەبوەوە، بۆ ئەوەی لەسەر پێویستیەکانی (لا اله الا الله) پەروەردەیان بکات، خۆیشی نمونەی کردەیییان پێشکەش بکات.

لە پێویستیەکانی (لا اله الا الله) لەو کات و هەموو کاتێکدا، ئارامگرتنە لەسەر ئازاری ڕێگای هەق، ئارامگرتن لەڕێگای ئەو بیروباوەڕە ڕاستەی، کە مرۆڤ بڕوای پێی هەیە.. جا ئایا تەنها بڕوای ڕووت، واتە بڕوا بە (لا اله الا الله) هێنان و وتنی بە زمان لەخۆیەوە دەبێتە هۆی ئارامگرتن لەسەر ئازار، هەرچەندە توندوتیژبێت دەبێتە دەست گرتن بە هەقەوە چەندەی لە ماڵ و گیانی تێبچێت؟ یان ئەم کارە پێویستی بە کۆششی دیاریکراو هەیە بۆ بەهێزکردنی پێکهاتەی دەرون، هەتا بەرگەی فشار بگرێت بێئەوەی لاربێتەوە، یان دابڕمێ؟ لەکوێ ئەوە فێر دەبن؟ ئایا بەتەنها پێیان بوترێت ئارام بگرن هەستیان ڕێك دەبێت، عەزیمەتیان پتەو دەبێت، دونیا بەو هەموو خۆشیەی تێدایە لەبەرچاوی خاوەنەکەی بێنرخ دەبێت، سەیری ئەوە دەکات، کە بەرزترە و ڕونترە و، بەرگەی ئازارەکە دەگرێ بە ئارامەوە، کەمتەرخەمی ناکات دەرهەق بەو هەقەی بڕوای پێهێناوە؟ نا سوێند بەخوا! بەڵکو ئەو کارە پێویستی بە فێرکردن و ڕاهێنان و ئاڕاستەکردن هەیە..

مامۆستای گـەورەﷺ هـەر ئـەوە مرۆڤ فـێر دەکـات و وانـە دەدات و ڕادەهێنـێ و ڕێنمایی دەکات.. بەڵام نەك بە وشەی ڕووت بیدات بە گوێی هاوەڵەکانیدا، بـەڵکو بە نموونەی کردەیی بە چاو دەیانبینی، ئەوەی ئـەوانی بۆ بـانگ دەکرد، لـە سـەر ئاستێکی بەرز، لەخودی خۆیدا پیادە دەکـرد، بەڕاسـتی سـەرداری پێغەمبـەرانﷺ ئازارێك دراوە، کە کێوی دادەڕماند..

بە بەدرۆخستنەوە ئازار دەدرا، ئای! بەدرۆخستنەوە چـەند گـران بـوو لەسـەر شانی ڕاستگۆی ئەمین.. بە گاڵتەپێکردن ئـازار دەدرا، ئـای! گاڵتـەپێکردن چـەند قورسە لەسەر دڵێك، کە بڕوای بە هەق بهێنێ، بزانێت ئەو کـارە هەقـە و چاکەیـە، ڕێی ڕاستە، ڕزگارییە، سەرکەوتنە و گاڵتەچیەکانیش لە گومڕاییەکی دووردان. بە پڕوپاگـەندەی دژایـەتی و نـاوزڕان و خـەڵك لێدورخسـتنەوەو هـەوڵدان بـۆ دورخستنەوەی شوێنکەوتوانی، بەڵکو هەوڵدان بۆ دورخستنەوەی خەڵك، هەتا لـە گوێگرتنـی ئـازار دەدرا.. بـە ئـازاردانی لاشـەیی و هەسـتی ئـازار دراوە.. بـەردیان تێگرتووە هەتا هەردوو پێی پیرۆزی خوێناوی بووە، یان دڕك و داڵ لەسەر ڕێگایدا فڕێدراوە بۆ ئەوەی بچێت بەپێیدا، وەك ئەبولەهەب و ژنە دارکێشـەکەی کردیـان، یا بە فڕێدانی پیسی بەسـەریا، لـەکاتێکدا لـە کڕنوشـدا بـوو یـادی خـوای دەکـرد، ئەمەو چەندەها شتی تر..

هەموو ئەمانە دەبوونە هۆی ئەوەی زیاتر دەست بە هەقەوە بگرێت و لەسـەری بەردەوام بێت، هەرچی شتی فریودەر هەیە خستیانە بەردەمی، کـە واز لـەو کـارە بهێنێ، ئەو شتانەی خـەڵك لـە ژیـانی دونیـادا پێـی لەخشـتە دەبـرێ، پاشـایەتی، دەسەلات، ماڵ و پلەوپایە خۆشی دونیا، ئەویش بە مامی دەفەرمو: ((وَاللهِ يا عَمُّ، لَو وَضَعوا الشَمسَ في يَميني والقَمَرَ في شمالي، على أن أترُكَ هذا الأمر ما فَعَلْت، حتى تَنفَرِدَ سافلتي -أو قال- حتى أُهلَكَ دونه: مامە! سوێند بەخوا! ئەگـەر ڕۆژ بخەنـە لای ڕاستم و مـانگ بخەنـە لای چـەپم، بـۆ ئـەوەی ئـەو کـارە واز لێبـهێنم، وازی لێناهێنم هەتا ملم نەقرتێ -یان فەرموی- هەتا لەپێناویدا دەمرم.))[1]

بەو شێوەیە وانەی دەدا بـەگوێی هاوەڵـەکانیدا، نـەك وشـەی ڕوت، هەرچـەندە

---

١ تەماشای کتێبەکانی سیرە بکە.

وشەکان بۆ ڕونکردنەوە پێویستن، بەڵام ڕەفتارێکی کردەیی، کە وشەکان شی دەکاتەوە و دەیانگۆڕێت بۆ ڕاستیە بینراوەکان لەجیهانی بینیندا.

لە پێویستیەکانی (لا اله الا الله) لەو کاتە و هەموو کاتێکدا، پڕکردنی دڵە بە خۆشەویستی خوا، هەروا هەستکردن بە گەورەییەکەی و پەیوەست بوون پێی بەپەرۆشەوە سەیری بکرێت و ڕووی تێبکرێت لە هەموو ڕەفتار و هەستێکدا. جا ئایا بڕوای ڕووت واتە بڕواکردن بەوەی جگە لەخوا خوایەکی تر نیە و گۆکردنی، لەخۆیەوە دەبێتە ئەو ئاراستە و ئەو ڕەفتارە؟ یان فەرمانەکە پێویستی بە فێرکردن و تەلقین کردن و ڕاهێنان و ڕێنماییە؟

پەروەردیار نەبێتﷺ کێ ئاراستەدەدات و فێردەکات؟ بە وشەی ڕووت نا، بەڵکو بە ڕەفتاری کردەیی، کە هاوەڵەکانی دەیانبینی، سەیریان دەکرد و لێوەی فێر دەبوون. کاتێ هەموو ساتێ دەیانبینی لەیادی پەروەردگاریدا بوو، ڕووی تێکردبوو چاوەڕوانی ڕەحمەتی بوو، بە زەلیلی و لاڵانەوە هاواری بۆ دەکرد بە تۆبەکاری و گەڕانەوە بۆ لای، زمانی لەپاڕانەوە سارد نەدەبۆوە، دڵیشی لە یادی خوا سارد نەدەبۆوە..

هەر لە پێویستیەکانی (لا اله الا الله) ئەو کاتە و هەموو کاتێك، بڕوا بوونە بە قەزاو قەدەری خوا، بڕوا بوونە بەوەی کە هەرخۆی بەکاروباران ڕادەگا و هەر خۆی بەتەنها ئەندازەگیری دەکات، هەرخۆی بەتەنها چی بوێت دەیکات، هەرخۆی بە تەنها ڕۆزیدەرە، هەرخۆی بەتەنها زیاندەر و سودبەخشە، هەرخۆی بەتەنها دەژێنێ و دەمرێنێ، هەر خۆی بە تەنها خاوەنی هەموو شتێکە و خاوەنی هەموو کارێکە، هەرخۆی بەتەنها بونەوەر و خەڵك بەڕێوە دەبات، هیچ شتێك بێ فەرمانی ئەو نابێت، هیچ شتێك نابێت، هەتا خۆی نەیەوێت.

جا ئایا تەنها بەڕاست دانانی (لا اله الا الله) و گۆکردنی، ئەو بڕوایە لەناو دەرونەکاندا دروست دەکات؟ یان کارەکە پێویستی بەفێرکردن و وانەدان و ڕاهێنان و ڕێنمایی هەیە؟ ئایا بۆ چەقاندنی ئەو بڕوایە، وشەیەك، یان چەند وشەیەك، یا وانەیەك یا چەند وانەیەك بەسە؟ بەڕاستی ئەمە تیۆر(نظرية)ێك نیە بخوێنرێت و لەبەر بکرێت و لەبارەیەوە پرسیار لە مرۆڤ بکرێت، ئەویش بە زمانی

وەڵام بداتەوە، بەڕاستی ئەوە موعاناتی واقیعیە، لە هەموو ساتێکدا لەبەریەك ڕادەچێ لەگەڵ ئارەزوویەك لە ئارەزووەکانی، یا خەیاڵێك لە خەیاڵەکانی، یا ئەزموونێکی تاڵ، کە مرۆڤ پێیدا دەڕوات، پاشان لەمیانەی ئەو ڕەنج و ناڵاندنانەوە فێر دەبێت و وانەکە لەبەر دەکات، نەك تەنها بە عەقڵی نەك تەنها بە ویژدانی، بەڵکو بە دەمارەکانی و لاشەی و گیانی و هەموو پێکهاتەکانی.

ئەم نمونەیە لە کتێبێکەی پێشوومدا هێنراوەتەوە:[1] ئەگەر لەڕێگا لە هەرکەس بپرسیت کێ ڕۆزی تۆ دەدات؟ بێ بیرکردنەوە وەڵام دەداتەوە: خوا ڕۆزی دەرە، بەڵام کاتێ دەست تەنگ دەبێت، یا ڕۆزیەکەی کەم دەکات: کاتێ لە ڕۆزیەکەی ئازار دەخوات بۆ پەیداکردنی چی دەڵێت؟ لەزۆرجاردا دەڵێت: فڵانەکەس ڕزقی بڕیم، یان فڵانەکەس دەیەوێت ڕزقم ببڕێت! ئەوە نیشانەی چیە؟ نیشانەکەی ئەوەیە، کە هەرچی بەڵگەنەویستە بوترێت لەڕاستیدا نیە! یان بڵێ: ئەو بەڵگەنەویستی بیر(ذهني)یە نەچوەتە قوڵایی ویژدانەوە، نەبووەتە بەڵگەنەویستی دڵی، کە ڕەفتاری لەسەر بنیات بنرێت! یا هەستە ڕاستەکانی دوای ئەو ڕەفتارە ڕاستە لەسەری بنیات بنرێت!

کاتێ لە سورەتی (البقـرة)دا ئەم خیتابەی خوام خوێندەوە، کە بەرەوڕوی نەوەی ئیسرائیلی کردبوو کارێك سەرنجی ڕاکێشام: ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ؛ ئەوسا کە ڕزگارم کردن لە فیرعەون و داروودەستەکەی کە سەرەڕای سزادانتان، کوڕانی لێ سەردەبڕین و ژنەکانی ساغ دەهێشتەوە، کە لەمەدا ئەزمونی زۆر مەزن هەبو لە پەروەردگارتانەوە.﴾البقرة:٤٩.

سزاکە لە فیرعەون ڕوی‌دا؛ نێرینەکانیانی سەردەبڕی و مێینەکانیانی دەهێشتەوە، بەڵام توشی بەڵابوونەکە لەخواوە بووە! ئایا کاتێ سزاکە دەبینی ئەو خەیاڵە بێبیرکردنەوە دێت بەدڵدا، یا دەیبیستی؟ یان بیر(ذهن) ڕوودەکاتە

1 کتێبی (واقعنا المعاصر).

بکەری ڕاستەوخۆ، کـە کارەکـەی لێـوە ڕودەدات؟ مـرۆڤ پێویستی بـەفێربوون و وانەوەرگرتن هەیە، بۆ ئەوەی بزانێت بکەرەکە هەڵساوە بە کارەکـە، بـەڵێ، بـەڵام لەدوای ئەوەوە قـەدەری خـوا هەیـە؟ کاتـێ مـرۆڤ ئـەوە دەزانـێ، لەمێشکیشـیدا جێگیر بوو، هـەتا دەبێتـە ڕاستی و دڵنیـایی، کەواتـە ڕو دەکاتـە کـێ بـۆ ئـەوەی مەینەتیەکەی لەسەر لابات؟ ئا ئەوە ئەو وانەیە، کە لەدوای ئاڕاستە دایـە.. بـەڵام ئەمە لە هەستی بڕواداردا نەرێ(نفي) ناکات لەگەڵ دەستگرتن بەهۆکانـەوە، بـەڵام بێئەوەی پشت بەهۆکانەوە ببەستێت، بێئەوەی بڕوای بەوە هـەبێت، کـە هۆکـان لەخۆیانەوە کار دەکەن؛ بەڵکو بە قەدەری خوا کار دەکەن و لەو سنورەدا کە خوا داینـاوە هەمیشـە لـەدوای ڕوداوەکـان و کەسـەکانەوە سـەیری بەڕێوەبـەر و دروستکەری ڕاستی دەکرێت، کە ئەویش خوایە و خاوەنی هەموو شتە.

لە پێویستیەکانی (لا اله الا الله) لەو کاتە و -لە هەموو کاتێکدا- برایەتی لەبەر خـوا و خۆشویسـتن و ڕق لێبـوون لەبـەر خـوا و، لایـەنگری و خۆبـەریکردن لەبـەر خوا.. ئەوانە هـەموو سـەبارەت بـە ژینگـە عەرەبیەکـەوە بـوو.. هـەروا بـۆ هـەموو ژینگەیەکی نەفامی لە کۆن و نوێدا، چەند کارێکی جیـاواز و دژ بـە نـەریتی ژینگـە هەیە.. لە نەفامی عەرەبیدا پەیوەندی خوێن، پەیوەندیەکی چەسپاوی هەمیشـەی توند بوو، هەموو پەیوەندیەکانی تریش، جگە لەوە یا لاواز و پچڕاو بوو، یا هەر لە بنەڕەتدا نەبوون.. لە نەفامیەکانی نوێدا پەیوەندی نەتەوایەتی و نیشتمانی بوەتە جێگری پەیوەندی خوێن، کە ئەو نەفامێتیانە شانازی پێوە دەکـەن و دەمارگیری لەسەر دەکەن، وەك ئەو شێوەیەی، کـە نـەفامی عـەرەبی شانازی بـە پـەیوەندی خوێنەوە دەکرد و دەمارگیری دەکـرد بـۆ ئـەو پەیوەندیـە خوێنـەی لـە هۆزەکـەدا خۆی دەنواند.. جا جیاوازی فراوانیە نەك لە کاکڵەدا:

بەڵام خۆشویستن و ڕق لێبـوون لـە نـەفامی عـەرەبی و لـە هـەموو نەفامیـەکدا لەتەوەری بەرژەوەندیە، لە زۆرینەشـدا بەرژەوەندیـە مادیـە نزیکەکانـە، لەلایـەکی ترەوە تەوەرەکەی ((مـن))ە، من و کەرامـەتم، مـن و ماڵەکـەم، مـن و دەسـەڵاتم، نەتەوەکەم، شوێنکەوتوەکانم، ئەگـەر لـە ((دەسـەڵاتدارەکان)) بم، یا گەورەکـەم ئەگەر لە بێدەسەڵاتەکان بم!

بەڵام دۆستایەتی و بەریبوون(الـولاء والـبراء) هـاودەمی خۆشویسـتن و ڕق لێبوونەوەن، هیچ ڕێسا و ڕێکخەرێکی نیە، جگە لەو بەرژەوەندیانەی ئەمڕۆ لـێرەدا بێت و سبەینێ لـەوێ.. لەبـەر ئـەوە هەمیشـە لـە گۆڕاندایـە و لەسـەر بـارێك ناچەسپێت، هاوڕێیەتی ئەمڕۆ ڕەنگە بەیانی بگۆڕێت بە دوژمنایـەتی، دوژمنایـەتی ئەمڕۆش ڕەنگە بەیانی بگۆڕێت بە دۆستایەتی، نەك بۆ گۆڕینـی ڕێبـاز و بـەهاكان، بەڵام بۆ گۆڕینـی بـەرژەوەندی كـاتی، كـە لەسـەر یـەك بـار نامێنێتـەوە.. هـەموو نەفامیەكانیش لەو كارانەدا وەك یەكن!

تەنها بڕوای ڕووت–بەواتای بەڕاسـت دانـانی– (لا الـە الا الله) و گۆكردنـی، لـەو هـەموو كارانـەدا لەخۆیـەوە نابێتـە هـۆی گۆڕانـی ڕیشـەیی، كـە نـەریتی جـاهیلی پاڵپشتی دەكرد، هـەروەها ڕەوشـی ڕامیـاری و ئـابوری و كۆمەڵایـەتی و فیكـری و ڕەوشتی پاڵپشتیان دەكردن.. بێگومان هەرچـەندە بـڕوا بـە (لا الـە الا الله) دەرون ئامادە دەكات بۆ گۆڕین و وەرگرتنی گۆڕین.. بەڵام پێوانە تازەكـان، بـەها(قیـم)ە تازەكان و ئەو ڕەوشە تازانەی، كـە دەویسـترێت دروسـت بكرێـت، كـە لەخۆیەوە نایەت، لە چركە ساتێكدا ئـەنجام نـادرێت، ئەگـەریش چركـە سـاتی بـڕواش بێـت، بەڵكو خشت خشت دەخرێتە سەر یەك، هـەتا بینـا تازەكـە ڕاسـت دادەمـەزرێت.. بەمەش پەروەردە پێی بەرپا دەبێت.

هـەر ئـەوەش بـووە، كـە پـەروەردیاری گـەورە ﷺ پێـی هەڵسـاوە لـە نـەریت و چـاودێری و بـەدواداچوون، هـەتا گەیاندیـە ئـەو لوتكـە بەرزانـە، تـا وای لێهـاتبوو برایەتی بۆ خوا لە دەرونەكاندا لـە پـەیوەندی خوێـن بـەهێزتر بـوو، وای لێهـاتبوو خۆشویستن و ڕق لێبوون پەیوەندی بە بەرژەوەندیەكانی سـەر زەویـەوە نـەمابوو، بەڵكو لەگەڵ برایەتیەكەدا چووبونە ترازوییەكەوە، ئەو تایـەی بـۆ خـوا و لـەپێناوی خوادا قورستر بوو، وەلا و بەڕائیش پەیوەست كرا بە بەهاكانی ئیمـان و تەنـها بـۆ خوا.

لە پێویستیەكانی (لا الە الا الله) لەو كاتە و لەهەموو كاتێكدا، كۆمەڵێك چاكەی ڕەوشتی بـەرز بـوون، هـەندێكیان لـە ژینگـە عەرەبیەكـەدا هـەر هـەبوون، بـەڵام نەفامیەكە خراپی كردبوون و لەڕێگا ڕاستەكەی خۆی لایدابوون.. وەك ئازایـەتی،

کە نەفامی هەڵگێڕابووەوە بۆ دەمارگیری نەفامی، وەك لە سورەتی (الفتح)دا هاتووە..[1] سەخاوەت و بەخشین لە نەفامێتی، لەڕێگا ڕاستەکەی خۆی لایدابوو وای لێهاتبوو بوو بە ماڵ بەخشینەوە بۆ ڕوبینی خەڵك وەك لە سورەتی (البقرة)دا هاتووە،[2] جا پێویست بوو ڕێڕەوەکەی ڕاست بکرێتەوە و بگێڕرێتەوە بۆ بنەڕەتە ڕاستە فیترەتیەکەی خۆی، بۆ ئەوەی بۆ خوا بێت و لەبەر خوا بێت.. هەندێ لەو چاکێتی ڕەوشتی بەرزەدا لەسەردەمی نەفامی عەرەبیدا نەبوو، ناکرێ لەهیچ جاهیلیەکیشدا هەبێت، وەك ڕێگرتن لە ستەمکردنی خەڵك، بەرپاکردنی ژیان لەسەر دادپەروەری، نەك لەسەر یاسای دارستان، ڕێزگرتنی مرۆڤ وەك ئەوەی مرۆڤە، بە چاوپۆشین لە ڕەگەز و ڕەنگ و زمان و نیشتمانەکەی و باری کۆمەلایەتی، یا رامیاری، یا ئابوری، ئەوەش کارێکە نایەتە دی، هەتا دەروون بۆ خوا یەکلانەبێتەوە.[3]

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە باسی هەموو پێویستیەکانی (لا اله الا الله) بکەین بەکورتکراوی، تەنانەت سەبارەت بە ماوەی پەروەردەی مەککەیش، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە بڵێین: هەر لەو کاتەوە لەلایەن خواوە هاتۆتە خوارەوە، تەنها بەڕاست دانان(تصدیق) و دان پێدانان(اقرار)ی ڕووت نەبووە، وەك بیرۆکەی

---

١ {إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمِ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ: سزادانی کافرەکان لەبەر ئەوەیە، دەمارگیرییەکی نەفامانە لە دڵ و دەرونیاندا هەیە.}الفتح:٢٦.

٢ {كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لاَ يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ: نەچن وەك ئەو کەسانە بن کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی سەلا نیە و بۆ ڕوبینی لەماڵی خۆیان دەبەخشن، ئەم کارەیان لەوە دەکا کە تاتە بەردێکی زۆر لوس هێندێ خۆڵی لەسەر بارە و بارانی توندی وێ کەوێ و بیشواتەوە و هەر تاتێکی ڕوت بمێنێ. هیچ بەهرەیان لەو بەخشینە دەسگیر نابێ و خودا گرۆی خوانەناسان لەڕێگە شارەزا ناکا.}البقرة:٢٦٤.

٣ دیموکراسیەت پێی وایە ئەو یەکەم جار بڕیاری ئەم ڕێبیرانەی داوەو بەکردەوە جێبەجێی کردووە، مافی بوون و مافی دەربڕینی خودی خۆ هەر لە لایەن ئەوەوە بووە! وەلام لەسەر ئەوە ئەوەیە ئەوەی لە بۆسنە و هێرسك ڕووی‌دا و ئەوەی لە چیچان و ئەوەی لە فلیپین و لە کشمیر ڕوودەدات و ئەوەی لە فەلەستین ڕوودەدات و ئەوەی لە هەموو شوێنێك لەو شوێنانەی موسڵمانان لەژێر دەسەلاتی جولەکە و دیانان دان، بەرامبەر ئەو دادپەروەری و لێبوردەییەیە لە موسڵمانانەوە بۆ ئەو جولەکە و دیانانەی کەوتبونە ژێر دەستیان!

ئیرجائی، تەنها بەڕاست دانان و دان پێدانان، هەتا ئەو کاتەی نیشانەی ڕاستی بڕوا بووە لەسەرەتای بانگەوازیدا، لەو کاتەی کەس بەرەو مەترسیی وتنی نەدەهاتە پێشەوە، مەگەر بڕواداری ڕاستەقینە نەبوایە، بەتەنها شتێکی پێ نەدەکرا و کاریگەریی نەدەبوو، وەك کە (لا الـه الا الله) کاریگەریی لە دڵ و دەروونی ئەو کۆمەڵە بڕوادارەی دروست کرد، کە پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوون، بەڕاستی ئەو کاتە کاری خۆی کرد، ئەوانەی (لا الـه الا الله)یان لەئامێز گرت و بڕوایان بە پێویستیەکانی هێنا و لەسەر پێویستیەکانی پەروەردە بوون و لەجیهانی واقیعدا کاریان پێکرد.

هەروەها مەبەستمان ئەوە نیە بڵێین: پەروەردەکردن لەسەر ئەو پێویستیانە تاکە کاری پێغەمبەرﷺ بووبێت، بەتایبەتی سەبارەت بە بنکە پتەوەکە، بەڵکو ئەو کارە لە هەموو پەروەردیارێك خوازراوە، کە بیەوێت بنکەیەکی بانگەوازیی لە هەر شوێنێکی زەوی دروست بکات، لە هەر کات و ساتێکی ڕۆژگار هەتا ڕۆژی دوایی، بەڵکو ئەو کارە تاقانەی پێغەمبەرﷺ پێی هەڵسا ئەوەبوو، کە هاوەڵەکانی پێ گەیاندە پلەیەکی سەرسوڕمان لە کارکردن بە پێویستیەکانی (لا اله الا الله).

پلەیەك بوو واقیع بە نمونەیی گەیشت، کە کارە سوننەتیەکان و پەسەندەکانی لە دەرونیاندا گۆڕی بۆ ئەرك و فەرزەکان، خۆیان بەو پلەیەوە پابەند کردبوو، بێئەوەی خوا داوای لێکردبن یا پێغەمبەرەکەی، کە بەو شێوەیە خۆیانی پێوە پابەند بکەن، بە پلەیەکی سەیر بڕوایان بەڕۆژی دوایی هەبوو، لە هەموو چرکەساتێك لەگەڵی، ژیان وەك بڵێی ئامادەیە و ئێستا ئەو ڕۆژە دەبینین، نەك ماوەیەکی دوورودرێژی تر بێت، ئا ئەوە بوو ئەو نەوە تاقانەی کە لەسەر دەستی پەروەردیاری گەورەﷺ پەروەردەببو، لە هەموو نەوەکانی تری جیاکردبۆوە، نەك تەنها پابەند بوون بە پێویستیەکانی (لا الـه الا الله)، کە لە هەموو کەسێکیش داواکراوە و تینوی بانگەوازیە بۆ (لا اله الا الله).

* * *

پاشان وردەوردە لەسەرخۆ پێویستیەکانی (لا الـه الا الله) فراوان بوو، زۆر لایەنی نوێی لەناو دەرون و ژیاندا گرتەوە، کە لەوەپێش نەبون، کە خوای گەورە

بە حیکمەت و دانایی خۆی ناردیە خوارەوە لەو کات و ساتەی خۆی دایناوە، لەبەر ئەوە پابەند بوون پێی بووە کارێکی پێویست(واجب)؛ چونکە پێویستیەکانی یەکەم بە تەنها ئیمانی پێ جێبەجێ نەدەبوو.

پێشەوا (ابو عبيد القاسم بن سلام) (١٥٧-٢٢٤هـ) لە کتێبی (الإيمان)[1] ل٥٤ دەڵێت: ((ئەگەر کارەکەمان گەڕاندەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەرﷺ و کتێبەکەی لە پێناودا نێرراوە، دەبینین ئەگەر سەرەتا بڕوای کردووە بە شایەتمان (لا الـه الا الله محمد رسول الله)، پێغەمبەرﷺ دوای ئەوەی پەیامی خوایی بۆ هات دە ساڵ یان یازدە ساڵ لە مەککەدا مایەوە، بەتایبەتی بانگەوازی بۆ ئەو شایەتیدانە دەکرد، ئیمان لەو کاتەدا جگە لەو شایەتیدانە فەرزی تری نەبوو، جار هەر کەس بەدەم ئەو بانگەوازەوە بچوایە بڕوادار بوو، لەدیندا شتێکی تری لە سەر نەبوو، نە زەکات و نە ڕۆژووی فەرز و نە ئەوانەی ئێستا لە یاساکانی دیندا هەن، بەڵکو ئەو بارسوکیە بۆ خەڵك وەك زانایان گێڕاویەتیانەوە، ڕەحمەتێك بوو لە خواوە بۆ بەندەکانی و بەزەیی هاتنەوە بووە پێیان، چونکە ئەوان نەو مسوڵمان بون، ئەگەر هەموو فەرزەکانی بەیەکەوە بەسەریان بدرایە، دڵ سارد دەبوون، لەبەر ئەوە بڕیاردان بەزمان بەتەنها وای کرد، کە تەنها ئیمان ئەوکاتە لەسەر خەڵك فەڕز بێت، هەموو مانەوەشیان لە مەککە هەر لەسەر ئەوەبوو؛ چەند مانگێکیش دوای کۆچکردنیان بۆ مەدینە، جا کاتێ خەڵك بۆ لای ئیسلام گەڕانەوە و ئارەزومەندی بوون، خوا لە بڕواکەیاندا ڕووەو کەعبەی لەنوێژدا بۆ زیادکردن، کە لەوەپێش ڕووەو (بيت المقدس) بوو، ئەگەر لەکاتی گۆڕینی قیبلە بۆ کەعبە ملیان نەدایە و دەستیان بگرتایە بەو بڕوایەی تەنها ناوەکەی فەرز بوو لەسەریان و ئەو قیبلەیەی لەسەری بوون سودی نەدەبوو بۆیان، بەڵکو هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکەیان دەبوو، لەبەر ئەوەی یەکەم جار گوێڕایەڵی بەناوی بڕواوە شایستەتر نەبوو لە گوێڕایەڵی دووەم. جا کاتێ بۆ وەرگرتنی نوێژ چوون بەدەم بانگەوازەکەی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە، وەك چۆن هاتن بەدەم بڕیار و دان پیادانەوە، ئەو دوانەش بونە بڕوا بەیەکەوە، کەوا نوێژیش خرایە سەر دان پیادانان، ماوەیەك لەسەر

---

[1] بە تەحقیقی محمد ناصرالدين الالبانی- چاپی دار الارقم لە کوێت ١٤٠٥هـ.

ئەوەش مانەوە کاتێ بە پەلە دەچون بۆ نوێژ و سنگیان بۆی کرایەوە خوا زەکاتی فەرز کرد و خستیە سەر بڕواکەیان و چوە پاڵ ئەوانی پێشوو فەرمووی: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ: نوێژ بکەن و زەکاتِ بدەن.﴾البقرة:٨٣ و ١١٠.

هەروا فەرمووی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا: لە دارایيەکەيانە سەدەقەيان لێ وەربگرە، تا بەوە پاك و خاوێنيان بکەيتەوە.﴾التوبة:١٠٣.

ئەگەر ئەوان زەکاتيان لە کاتی دان پيانان نەدايە، بەزمان بياندايە و نوێژيان بکردايە، بەلاَم زەکاتيان نەدايە ئەوە دەبوە هۆی لابردنی پێش خۆی، هەڵوەشاندنەوەی دان پيانان و نوێژکردن، وەك چۆن نەکردنی نوێژ لەپێشەوە هەڵوەشانەوەی دان پيانانەکە بوو، بەڕاستگێڕەوەی ئەمەش جيهادەکەی ئەبوبەکری صديق بووﷺ بە موهاجير و ئەنصارەوە، کەکرديان دژی ئەو عەرەبانەی زەکاتيان نەدەدا، ئەو جيهادە و جيهادی پێغەمبەر دژی ئەهلی شيرك وەك يەك بوون، جياوازی نەبوو لەنێوانياندا لەخوێن ڕشتن و ديل گرتنی منداڵ و ژن و ماڵ بە غەنيمەت گرتن، لەگەڵ ئەوەی ئەوان تەنها زەکاتيان نەدەدا، ئينکاريان لێنەدەکرد. بەو پێيە هەموو شەريعەتەکانی تری ئيسلام هاتە خوارەوە هەرکاتێك شەريعەتێك دەهاتە خوارەوە دەخرايە سەر شەريعەتەکانی پێشی و هەموويان ناوی بڕوا دەيگرتنەوە بە ئەهلی ئەو فەرزانەيان دەوت بڕوادارەکان، ئا ئەوە ئەو بابەتە بوو، کە خەڵك بەهەڵە لێی تێگەيشتبون دەيانوت بڕوا بە گوفتارە..)) –تەواو–.

*　*　*

ئەگەر سەيری ئەو بنکە پتەوە بکەين کە پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوو، دەپرسين پێغەمبەرﷺ بۆ چ ئامانجێك ئەو هەوڵە زۆرەی دەدا لەماوەی سيانزە ساڵدا لە مەککە و دەساڵ لە مەدينە، ئايا بۆ دەرهێنانی ئەو نمونە تاکەيە لە مرۆڤدا؟ يان تەنها بۆ ئەوەی کۆمەڵێك بڕوادار بەدی بهێنێت بڕوايان بەخوا و ڕۆژی دوايی بێت و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، خواپەرستن؟!

هەندێ لەو کۆششە گەورەیە لە جیهانی واقیعدا ئەو ئامانجە بەجێدێنێ، ئەوەش لەخۆیدا ئامانجێکی پیرۆزە شایستەی ئەوەیە کۆششی بۆ بدرێت، بەلام پێغەمبەری گەورەﷺ وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد، ئامانجەکەی لەوە گەورەتر و بەشکۆتر بوو..

ئەرکی ئەو کۆمەڵەیە تەنها خواپەرستن نەبوو لەسەر ئەو شێوازەی، کە وەك کۆمەڵە بڕوادارەکانی پێشوو پێی هەڵدەسان، بەڵکو ئەرکەکەیان بڵاوکردنەوەی یەکخواپەرستی بوو لە زەویدا، هەروەها دەرهێنانی هەموو خەڵك لە پەرستنی بەندەوە بۆ پەرستنی خوا، وەك رەبیعی کوڕی عامرﷺ بەرامبەر رۆستەم سەرکردەی فارسەکان دەریبڕی، کە رۆستەم یەکێ بوو لە گەورە ستەمکارەکانی ئەو سەردەمە.. وێنەی ئەو کۆمەڵە پێویستی بە ئامادەکردنی تایبەت هەیە، نەك بە تەنها کۆمەڵێك لە خەڵك پێك بهێنرێت، کە بڕوای بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت و خواپەرستن.

لە جیهانی بازرگانی و پیشەسازیدا خەڵك دەزانن ئەو کەلوپەلانەی بۆ ناوخۆ دروست دەکرێت وەك ئەو کەلوپەلانە نیە، کە بۆ ناردنە دەرەوە دروست دەکرێت، یەکەمیان دەبێت بەهەر شێوەیەك بێت کە مەبەستەکە بێنێتە دی، بەلام ئەوەی تریان دەبێ بەچاکی دروست بکرێت، بەو ڕادەیەی کە وای لێبکات خۆی بسەپێنێ بەسەر بازاڕدا و ببێتە هۆی بەلاوەنانی ئەوانەی ناگەنە ئاستی ئەو.. جا ئەگەر ئەوە بۆ بازرگانی ماددی زەوی پێویست بێت، ئەو کارە بۆ بازرگانییە بەرزەکەی خوای گەورە لەپێشترە، کە دەربارەی فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ۝١٠ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ بێژم کە لە ئازارێکی بەژان رزگارتان کا؟ بڕوا بە خوا و بە پێغەمبەری ئەو بێنن و، بە دارایی و گیانی خۆتان لەڕای خودا تێبکۆشن؛ ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن.﴾الصف: ١٠-١١.

لەبەر ئەوە بۆ ڕێنیشاندانی مرۆڤایەتی، کۆمەڵێکی تاکی پتەو دروستکراو پێویست بوو، کە بە ڕەوفتاری واقیعی شایەت بۆ ئەم ئایینە بدات، کە ئایینێکی هەقە، ئەو ئایینەیە شوێنکەوتنی پێویستە، هیچ شتێك شان لە شانی نادات، هیچ شتێ ناشێت ببێتە جێگری.. پێویست بوو کەسانی وا بێتە کایەوە، کە بەرەنگاری هەموو نەفامی ببێت، نەك بەرامبەری بوەستێ و بەس؛ بەڵکو بەسەریا سەرکەوێت، بیناکەیان بڕوخێنێ و، لەجێگەیدا بینایەکی نوێ دروست بکرێت، کە لەسەر بناغەیەکی ڕاست دابمەزرێت.. هەر ئەوەش بەکردەوە لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺ هاتە کردن.

بەرەنگاربونەوەکە بەتەنها لەگەڵ نەفامی عەرەبیدا نەبوو، هەرچەندە ئەو نەفامیە بە حوکمی واقیع یەکەم نەفامی بوو، کە بانگەوازەکە لە یەکەم سەرهەڵدانیدا بەرەنگاری بووبوو.. بەڵکو سەرزەوی گشتی لە نەفامیدا دەژیا، جا چ بت پەرست بوبن، یان ئاگرپەرست، یا جنۆکەپەرست، یا بەردپەرست، یا بونەوەر پەرست، یا تاغوت پەرست بوبن، یا ئەهلی ئایینی ئاسمانی بوبن لادان و گۆڕینی تێدا ڕودابێت.. لە بەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەوانەدا، ئایینە تازەکە و پێغەمبەرﷺ و ئەو کۆمەڵە بون، کە خۆیﷺ هەڵسابوو بە پەروەردەکردنی.

ئایا تەنها دروست کردنی کۆمەڵێك موسڵمانی خواپەرستی ڕاستاڵ، سەرەڕای گۆڕانی.. سەرەڕای دامەزراندنی ئایینێکی ڕاست لەجێگایدا بەسە بۆ بەرەنگاربونەوەی هەموو ئەوانە؟

نا! ئەو کارە پێویستی بە کۆمەڵێك هەیە زۆر پتەو پێك هاتبێ، کە ببێت بە ناوکێك بۆ کۆمەڵە تازەکە، ئەو کۆمەڵەش کۆمەڵەکەی پێغەمبەرﷺ بوو، ئەو بنکە پتەوە بوو، کە لەسەر شانیدا بیناکە دامەزرا، کە بە واقیعیەتی واقیعی زەوی گۆڕی.

کتێبەکانی سیرە زۆر دەربارەی ئەو بنکە پتەوە شت دەگێڕنەوە، هەروا دەربارەی ئەو ئاستە جوانانەی، کە پێی گەیشتبون.. ئێمە لێرەدا ناکرێ ژیاننامەی ئەو صەحابانە باس بکەین، کتێبەکانی ڕێژین(سیرة) لەبەردەست هەمواندایە، باسی گەورەپیاوانیشیان ناکەین، باسکردنیان دەرون دەبزوێنێ و

دەیلەرزێنێ لەبەر گەورەیی و جوانیدا، بەڵکو ئێمە لێرەدا ئەوەمان لەسەرە باسی ئەو سیفەتانە بکەین، کە بنکە تاقانەکەی لەسەر بنیات نراوە، لەبەر تێڕامان و پەند وەرگرتن.

لەگەڵ ئەوەشدا خۆم بە نمونەکانیان موچڕکم پێدا دەهێنێ، خۆم بێناگیرێت زۆر کارم تێدەکات، ئەم کارتێکردنە هەموو بۆ گەورە صەحابەکان نیە، بەڵکو هەندێکی بۆ کەسانێکە، کە مێژوو بە چەند دێڕێکی کەم لەگەڵ جوانیەکەی بەسەریاندا تێپەڕیوە، بەباشی دەزانم لای ئەوانەش هەڵوێستەیەك بکەین.

* ئافرەتێك هەبوو توشی بورانەوە(صرع) بووبوو، کاتێ فێی دەگرت لەشی دەردەکەوت، چوو بۆ لای پێغەمبەر باسی حاڵی خۆی کرد و داوای لێکرد بۆی بپاڕێتەوە، تا خوا چاکی بکاتەوە لەو بورانەوەیە، پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموو: ((ئەگەر دەتەوێت بۆت دەپاڕێمەوە، ئەگەریش نا، ئارام بگرە لەسەر نەخۆشیەکەت بەهەشتت بۆ دەبێت.))، ئەویش وتی: ئەی نێرراوی خوا ئارام دەگرم، بەڵام بۆم بپاڕێوە لەشم دەرنەکەوێ، ئەویش بۆی پاڕایەوە، ئیتر دوای ئەوە لەشی دەرنەدەکەوت..[1]

* ژن و پیاوێك هەژاری زۆری هێنابوون، پیاوەکەی پێی وت: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ بەشی موحتاجەکان دەدات، با داوای لێبکەین لەو ماڵەی لەبەردەستیایە بەشمان بدات؟ ژنەکەش پێی وت: دەتەوێت لای پێغەمبەرەکەی شکات لەخوا بکەیت؟ ئیتر هەردوکیان ئارامیان گرت.

* شەوانە عومەر دەگەڕا بۆ ئەوەی بزانێ ئەحواڵی ڕەعیەتەکەی چۆنە، بەلای ماڵێکدا تێپەڕی گوێی لێبوو منداڵەکانی دەگریان، ئەویش چووە ژوورەوە ژنێکی بینی مەنجەڵێکی لەسەر ئاگر دانابوو تێکەڵی هەڵدەدا، منداڵەکانیش بە دەوریا دەگریان، پرسی ئەو منداڵانە بۆ دەگرین، وتی: لە برسانا، وتی: ئەو مەنجەڵە چیە؟ ژنەکە وتی: بەرد و چەوم تێکردووە تێکی هەڵدەدەم هەتا منداڵەکان خەویان لێدەکەوێت، چونکە خواردەمەنیمان نیە بیاندەمێ، عومەریش ئاگای لێمان نیە.. نەیدەزانی ئەوە عومەر خۆیەتی.. عومەر پێی وت: عومەر چۆن

[1] رواه مسلم.

بەتۆ بزانێ؟ وتی: ئەی بۆچی کاروباری موسڵمانانی گرتۆتە دەست؟ عومەر گریا چوو بۆ (بیت المال) لەگەڵ ئەو کەسەی لەگەڵیدا بوو ئارد و ڕۆنی هەڵگرت وگەڕایەوە بۆماڵی ژنەکە، ئەوەی لەگەڵیان بوو وتی: گەورەی بڕواداران! لێگەڕێ با من لەجیاتی تۆ هەڵی گرم، ئەویش وتی: ئەی کێ ڕۆژی قیامەت لەجیاتی من هەڵیگرێت؟ پاشان ئارد و ڕۆنەکەی کردە مەنجەڵەکەو، دەستی کرد بە فوکردن لە ئاگرەکە هەتا دوکەڵ چووە ناو ڕیشە پڕەکەی، جا شوێنەکەی بەجێنەهێشت هەتا بینی منداڵەکان تێریان خوارد و نوستن.

* یەکێ لە جەنگاوەرەکان بەخۆشی چونە بەهەشتەوە بەخۆشی شەهیدبوونەوە بەرەو گۆڕەپانی جەنگ کەوتەڕێ، دەنکە خورمایەکی لەدەستابوو -یان چەند دەنکێك- نەیتوانی ئارام بگرێت، هەتا دەیانخوات، فڕێیدان و دەیوت: ئەگەر بمێنمەوە هەتا ئەمانە تەواو دەکەم زۆر دەخایەنێت! جا چووە ناو جەنگەکەوە. ئەو شەهیدیەی بەدەسات هێنا، کە هەوڵی بۆ دەدا.

* یەکێ لە موجاهیدەکان دیرعێکی لەبەرکرد و خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ، هاوەڵەکەی پێی وت: کونێك لای ملتەوە لە دیرعەکەدایە ترسی ئەوە هەیە تیرێکی لێوە بچێتە ناوەوە، ئەویش بە خەندەوە بە هاوەڵەکەی وت: من لای خوا بەڕێزم ئەگەر لەو شوێنەوە تیرێك بمپێکێ، جا چووە جەنگەکەوە تیرێك لەو کونەوە پێکای و خوا ڕێزی شەهیدی پێبەخشی..

دیارە نمونەش کۆتایی نایەت..

*   *   *

لەوانەیە باشترین ڕێگا بۆ دیاریکردنی ئەو سیفەتانەی بنکە پتەوەکەی لەسەر دروست بووە ئەوەبێت، کە هەموو ئەو سیفەتانە بخرێتە سەر یەك، کە خوا و پێغەمبەرەکەی باسی ئەو کۆمەڵە تاقانەی پێکردووە، یان ئەو فەرمانانەی خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمانی پێکردوون، کە بە جوانترین شێوە پێوەی پابەند بون، یان ئەو ئاڕاستانەی خوا و پێغەمبەرەکەی ئاڕاستەی کردن، ئەوانیش بەپەلە جێبەجێیان کرد، جێبەجێکردنی ئەوانە هەموویان سیفەتی ڕاستن، کە بنکەکەی لەسەر دامەزراوە:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾: بێگومـان بڕواداران، ڕزگـارانن، ئـەو کەسانەی لە نوێژیاندا خۆیان بە گەورە نازانن؛ ئەوانەی کە لە قسـەی پـوچ دووری دەکەن؛ ئەوانەش کە زەکات دەدەن؛ هـەر ئەوانـەش کـە شـەرمی خـۆ دەپـارێزن؛ مەگین لە هاوسەری خۆیان، یان ئەوی ملکی خۆیانن؛ کـە نابـێ سـەرکۆنە بکرێـن؛ هەر کێش جیا لەمانەی بوێ، ئەو لە ئەندازە لادەرە. ئەوانەش-لە ڕزگـارانن- کـە ئەمانەت و بـەڵێنیان دەپـارێزن؛ ئەوانـەش کـە لەسـەر نوێژکردنـێ سـوورن؛ ئەمانـە گشتیان بەش بەرن. ئەو کەسانەی کە بەش بەری بەهەشـتن و تامەتایـە هـەر تیـا دەبن.﴾المؤمنون:١-١١.

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ: ئاخۆ کەسـێ

بڕوای وابێ لەئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تـۆ هاتۆتـە خـوارەوە هـەموو راسـتە، وەك ئەوەیە كە لەم بارە كوت و كوێرە؟ ئەم رلمانە هەر بۆ خاوەن ئاوەزانە. ئەو كەسانەی فەرمانی خوا پێك دێنن و تازە لێی پاشگەز نابنەوە؛ ئەو كەسـانەش كـە هەودای نێوان خۆیان لەگەڵ خودا-وەك خـودا فـەرمانی داوە- قـوت ناكـەن و لـە پەروەردگاریان دەترسن و لە حیساب كێشانی دژوار نیگەرانن. ئەو كەسـانەش كـە لەڕاهی رەزای خودا خۆیان گرت و-بەنهێنی و بە ئاشكرا- لەو بەشەی ئێمە پێمان دان، خێر دەكەن و بە چاكـە خراپـەكانی خۆیـانْ دەشۆنەوە؛ دواڕۆژی خـۆش بـۆ ئەوانە. خۆیان و باب و كاڵیان و ژنەكان و تۆرەمەشیان-ئەوانەی خوداپەسند بن- لە باغاتی دور لە نەمان دەچنە ژور و، فریشتە لە هەموو لاوە دەچنە لایان هەر لە سایەی هێمنیـدا بـن، چونكـە ئێـوە خۆراگـر بـوون، پیرۆزتـان بـێ دواڕۆژی ڕوون.﴾الرعد:١٩-٢٤.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ خاوەن بڕوا ئەو كەسـانەن هەركـە ناوی خودا برا، دڵیان ترسی لێ دەنیشێ و كە نیشانەكانی ئەویان بۆ خوێنرایـەوە، بڕوایان بەهێزتر دەبێ و دەربەست خۆیان بە پـەروەردگاریان دەسـپێرن. ئەوانـەن كـە نوێـژ دەكـەن و لـەو بژێـوەی كـە بـەشمان داون بەشـی هـەژارانیش دەدەن. بڕواداری بێكەمایەسی ئەمانەن كە لە پەروەردگاریانەوە پلەو پایە و لێخۆشبون و بژێوی پەسندیان هەیە.﴾الأنفال:٢-٤.

﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ژن و پیاوی بڕوادار دۆستی یەكترین؛ فەرمان بە چاكە دەدەن و بەر لە كاری ناشـیرین

دەگرن و نوێژەکەن و زەکات دەدەن و بەرفەرمانی خـودا و پێغەمبـەری خـودان. خـوا ئەوانــە وەبــەر بــەزەیی خـۆی دەخـا. خـودا خـاوەن دەسـتەلات و لەکارزانە.﴾التوبة:٧١.

﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ: بەلام پێغەمبەری خودا و ئەوانەی دەگەڵ ئەودان و بڕوادارن. بە ماڵ و گیان چونە خەزا؛ خۆشی و چاکی بۆ ئەوانە و رزگارەکانیش ئەوانن.﴾التوبة:٨٨.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ: خـوا ئـەو کەسانەی خۆش دەوێ کە بۆ خـەزا لـەڕێی خــودا، ڕیـز دەبەستن، وەك دیواری قورقوشمە.﴾الصف:٤.

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ: پەلـە بکـەن بـۆ گەیشتن بـە بەخشینی پـەروەردگارتان و بەهەشتێ کـە هـەڕاوی بـە ئـەندازەی ئاسمانـەکان و زەویـە و سـازکراوە بـۆ ئەوانـەی لەخواترسن. ئـەو کەسـانەی لـە تەنگانـە و لـە فـەرحانیدا مـاڵی خۆیان لـەڕێی خـودا دەبەخشـن و ڕکـی خۆیـان دەخۆنەوە و لە مــەردم چاوپۆشـی دەکـەن؛ خـوا چاکـەکاری خـۆش دەوێن. ئـەو کەسانەی هەرکاتێ کاری خراپ دەکەن، یان ناحـەقی لـەخۆ دەکـەن، خـودا لـەبیر

نابەنـەوە و لەبـەری دەپاڕێنـەوە: لـە خـەتاكانیان ببـورێ، بێجگـە خـوداش كـێ لەگوناهان دەبورێ؟ جا ئەوانە لەسەر كـارێ كـە زانیویانـە هەڵەیـە، پـێداگر نـین. ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریان لێبوردنە و باغاتێكە كە جۆباران بە بـەریاندا دەڕۆن و هەر لەو باغاتـە دەمێننـەوە. چـەند جوانـە پاداشـتی ئاكـار چاكـان.﴾آل عمران:١٣٣-١٣٦.

﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ: تۆبەكارن، خواپەرستن، هـەر پەسندی خـودا دەدەن، ڕۆژووگرن، بە كڕنوش و سوژدەبەرن، هانەی كاری چاك دەدەن و بـەر لـە نـاڕەوا دەگــرن و ســنوری خــوا دەپــارێزن. مــژدە بــدە بەوانــە خــاوەن باوەڕن.﴾التوبة:١١٢.

﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ والصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا: پیـاو و ژنـی موسـڵمان و پیاو و ژنی بڕوادار، پیاو و ژنی فەرمانبـەر و پیـاو وژنـی قسەڕاسـت و پیـاو و ژنـی خۆڕاگر و پیاو و ژنی بێفیز و خۆبەزل نـەزان، پیـاو و ژنـی سـەدەقەدەر و پیـاو و ژنی ڕۆژوەوان و پیـاو و ژنـی نـامۆس پـارێز و ژن و پیـاوێ كـە زۆر یـادی خـودا دەكەن، لە خوداوە لێخۆشبون و پاداشێكی گەورەیان بۆ داندراوە.﴾الأحزاب:٣٥.

﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي

وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا: موحەممەد پێغەمبەری خوایە؛ ئەوانەش کە لەگەڵ ئەون، لە بەرانبەر دیـن دوژمنـان توندوتیـژ و لـەناو خـۆدا دلۆڤـانن. لـە کڕنـۆش و سوژدە چاوت پێدەکەون. هەر بە هیوای ڕەزامـەندی و چاکـەی خـودان. دروشمـی سوژدەبردنیان بەناوچەوانـەوە هەیـە؛ وێنەشـیان لـە تەوراتدایـە و نمونەشـیان لـە ئینجیلدا. شوبهێنراوە بە چنـارێك تیشـەی بـەرەوژوور هـەڵچووبێ و وەچـەی زۆری دەکردبێ و ئەستور بوبێ و لەسەر لاسك خۆی گرتبێ و وەرزێـران سـەیری بمێنـن، تا چاوچنۆکانی سپڵەی پێی قەڵس کا. ئەوانەی خاوەن باوەڕ و ئاکار چـاکن. خـوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشێ گەورەی پێداون.﴾الفتح:٢٩.

﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ: ئـەو بڕوادارانـەی بـەرەژەوەندی براموسـڵمانەکانیان لەپێشـتر دەزانـن، هەرچـەندە دەسـت تەنگیشـیان هەیـە. کەسانێکیش خۆ لە ڕژدی دەپارێزن، ئەوانە ڕزگارەکانن.﴾الحشر:٩.

﴿وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ: ئەوانەی لە تاوانی گەورە دوورن و لـە کردەوەی شورەیی دەپرینگێنـەوە و لـە جەنگـەی توڕەبونیـاندا عـەفو دەکـەن. ئـەو کەسـانەش کـە

بەدەنگی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژ دەکەن و کارەکانیشیان بە ڕاوێـژە و لـەو بژێوەی پێمان بەخشیون دەبەخشن. ئەو کەسانەش کە زۆرێکیان لێ بکرێ، تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە. سزا بۆ هەر خراپەیەك خراپەیـەکی وەك ئـەوە. کێش لـە تۆڵـە چاو بپۆشێ و کۆشش بۆ ئاشـتی بکـا، پاداشـتی لەسـەر خودایـە. بێگومـان خـودا ناهەقکارانی خۆش ناوێن. ئەو کەسانەی لەپاش ناهـەقی لێکردن، تۆڵـەی خۆیـان دەستێننەوە، خەتابار نین.﴾الشورى:٣٧-٤١.

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ: بـا سسـتی ڕوتان تێنەکا و خەمیش مەخۆن. هەر ئێـوەن کـە سـەر دەکـەون، ئەگـەر بڕوالـان بەخوا هەیە.﴾آل عمران:١٣٩.

﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ: بڵێ: ئەمە ڕێگای منە، هەم خـۆم و هەم ئەوکەسانەش شوێنم کەوتون–بە ڕۆشنبینی– بۆ خواناسی، بـانگی دەکـەم. خـواش هەمیشـە پاکـە و تاکـە و لەوانـەش نیـم کـە شـەریکی بـۆ پەیداکەم.﴾یوسف:١٠٨.

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ۝ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ: هەر ئەو هاتـە هـاواری خـۆت و بـڕواداران و یاریدەی دان. بە دڵ وانی کردە هۆگری یەکتری، ئەگـەر هـەرچی لـەم سـەر زەمینـە هەیـە، هەموت بەخت بکردایە، نەت دەتوانی وا لێکیان کۆبکەیتەوە؛ بەڵام خـودا وا لێکـی کردوون بەهۆگر، هەر خۆی خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە.﴾الأنفال:٦٢-٦٣.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بـە یەکسـانی و بێجیاوازی–بە کاری مـەردم ڕابگـەن– و بـۆ خـوداش شـایەتی بدەن؛ هەرچەندە

شایەتی دانتان بە زیانی خۆتان و دایك و بابتان و خزمانیشتان بێ.﴾النساء:١٣٥.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بۆ خوا ڕاست و بێخەوش بن و بە هەقانەت شایەتی دەن. دوژمنی و قینی دەستەیێك هەڵتان نەنێ بە هەقانەت ڕەفتار نەکەن. بە یەکسانی و بێجیاوازی لەگەڵ خەڵکا ڕەفتار کردن دەبێتە هۆی پتر نزیکەوە بوون بە پارێزکاری. لە خواش ترستان هەبێ، چونکە لە هەرکارێ ئێوە دەیکەن ئاگادارە.﴾المائدة:٨.

﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ۝٤ أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ: الم، ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە بۆ ئەوانەی پارێزکارن ڕێنیشاندەرە، ئەو کەسانەی بڕوایان بە نەدیار هەیە و نوێژ دەکەن ولەو بژێوەش کە پێمان داون دەبەخشن. ئەوانەش کە بەو کتێبەی لە ئێمەوە بۆ تۆ هاتوە و بەوانەش بۆ پێغەمبەرانی بەر لەتۆ بەرێ کراوە، بەبڕوان لە هاتنی ڕۆژی پەسڵانێ گومانێکیان نیە. ئەوانە پەروەردگاریان ڕێبەریانە و دیارە گرۆی ڕزگارانن.﴾البقرة:١-٥.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوارانێکە کە هەندێك هەندێکی توند دەکات.))[1]

((مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى: بڕواداران لە خۆشویستن و میهرەبانیان بۆ یەك،

١ أخرجه الشيخان.

وەك یەك لاشەن، كاتێ یەكێ لە ئەندامەكانی ئەو لاشەیە توشی ئازارێك بوو، هەموو لاشەكە توشی بێخەوی و تا لێ هاتن دەبێت.))[1]

((إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا بالأنساب، كُلُّكُمْ لآدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ: بەڕاستی خوا لوت بەرزی سەردەمی نەفامی لەگەڵ شانازی كردن بە نەسەبەوە لە كۆڵ خستن، هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵ دروست كراوە.))[2]

((لَيْسَ الشَّدِيدُ بالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ مَنْ يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ: پاڵەوان بەوە نیە خەڵك بخەیت، بەڵام پاڵەوان كەسێكە، كە لەكاتی توڕەییدا خۆی بگرێت.))[3]

((تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ: دەم بە خەندەت بەرەو ڕوی براكەتەوە خێر و سەدەقەیە.))[4]

((إِنْ قَامَتِ السَّاعَةُ وَبِيَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ فَلْيَغْرِسْهَا: ئەگەر ڕۆژی دوایی هات و نەمامێك بەدەستی یەكێكتانەوە بوو با بیڕوێنێت.))[5]

((مَثَلُ الْقَائِمِ فِي حُدُودِ اللَّهِ، وَالْوَاقِعِ فِيهَا، كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ فَكَانَ بَعْضُهُمْ أَعْلَاهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا، فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنْ الْمَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ، فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا فَلَوْ تَرَكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا، وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعًا: ئەو كەسەی هەڵدەستێت بە بەجێگەیاندنی سنورەكانی خوا و ئەو كەسەی دەكەوێتە ناویان، وەك كۆمەڵێك وان، كە بە پشك خستن لەسەر كەشتیەك هەندێكیان دەكەونە ژێرەوەی و هەندێكیان دەكەونە سەرەوەی، ئەوانەی لەژێرەوە بن كاتێ ئاویان پێویست بێت بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا تێدەپەڕن بۆ ئاوهێنان، جا وتیان: ئەگەر كونێك بكەینە بەشەكەی خۆمان و ئاوی لێوە بهێنین نەك ئازاری ئەوانە بدەین

---

١ متفق عليه.
٢ رواه أبوداود والترمذي.
٣ أخرجه الشيخان.
٤ رواه الترمذي.
٥ رواه أحمد

لەسەرومانەوەن؛ ئەگەر وازیان لیٚ بهێنن ئەو کارە بکەن، هەموویان تیادەچن، ئەگەر دەستیان بگرن خۆیان و ئەوانیش رزگار دەبن.))[1]

((إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ: خوا چاکەی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە، ئەگەر کەسێکتان کوشت لە تۆڵەدا بەچاکی بیکوژنەوە، ئەگەر ئاژەڵێکتان سەربڕی بەچاك سەری ببڕن، با ئەو کەسەتان چەقۆکەی تیژبکات، با سەربڕاوەکەی ئازار نەدات.))[2]

((أَلاَ إِنِّي أَتْقَاكُمْ لِلَّهِ وَأَخْشَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَقُومُ وَأَنَامُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي: بزانن من لە هەمووتان زیاتر خۆم لەخوا دەپارێزم و لێی دەترسم، بەڵام بەڕۆژوش دەبم و بەڕۆژوش نابم، شەونوێژ دەکەم و دەخەوم، ژنیش دێنم، جا هەرکەس واز لە ڕێوشوێنی من بێنێت لەمن نیە.))[3]

* * *

لەسەر ئەو سیفەتە تاکانە و لە بەرزترین پلەیدا، ئەو بنکە پتەوە دامەزرا، کە پێغەمبەرﷺ دروستی کردبوو، کەواتە ئەو بنکە پتەوە چی لە واقیعی سەرزەوی کرد؟

ئەو بنکەیە لەسەرەتاوە ناوك(نواة) بوو، کە موسڵمانەکان لە نیوەدورگەی عەرەبدا بەدەوریا کۆبووبوونەوە کە بێشکەی بانگەوازی یەکەم بوو، یا بەزمانی سەردەم بڵێن: ئەو ناوکەی بنکە جەماوەریەکە بەدەوریا کۆبووبوونەوە، کە بانگەوازەکەی بەرەو هەموو لایەك پێ بزوا..

دەبێ هەموو بانگەوازێکی کارا لە واقیعی زەویدا بنکەیەکی جەماوەری هەبێت، کە پێی بجولێت و لەمیانەی ئەوەوە بجولێت، بەڵام ئەو بنکەیە بە قەبارە پێویستەکەی کۆنابێتەوە، مەگەر بەدەوری پێشەوایەکی پەروەردەکەر و نەواتێکی پتەو هەتا خۆی بگرێت و تیشکی بەهێزی لێببێتەوە، کە (جەماوەر) بە

---

١ أخرجه البخاري

٢ رواه مسلم والنسائي والترمذي وأبوداود وابن ماجه.

٣ رواه الشيخان.

کۆبوونەوەو دەورەدانی فریو بدات، بەڵام -لەواقیعی کارەکەدا- کۆمەڵەکە لەسەر ئەو ئاستە نابێت کە کۆمەڵە پاڵفەتەکەی لەسەر بوو، پێغەمبەرﷺ خۆی پەروەردەی دەکرد و چاودێری تایبەتی دەکرد و هەوڵی ئاراستەکردن و بەدواداچونی حاڵ و باری دەدا.

کۆمەڵەکەی پێغەمبەرﷺ هەموویان لەسەر یەك ئاست نەبوون، هەروەك لە قورئاندا هاتوە تەمەڵ و خۆوەدواخەر و بڕوالاوازیسان تێدابوو، هەروەها ئەو هەلفریوانەشیان تێدابوو کە هەموو دەرچوویەك و هاتویەك دەیلەرزاندن، هەموو ئەوانە بەپێچەوانەی دووڕووە ئاشکراکان و خۆشارەوەکانەوە بوو!

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! چیتانە کە پێتان دەڵێن وەدەرکەون بۆ خەزا لەڕای خودادا، تەمەڵن و لەجێی خۆ نابزون؟!﴾التوبة:٣٨.

﴿وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَـٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ۝٧٢ وَلَئِنۡ أَصَـٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَـٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ فَوۡزًا عَظِيمٗا: هێندێکی واتان لەناودان کە لە ئانقەست خۆ وەدوا دەدا و ناتانگاتێ. ئەگەر ئەوسا ئێوە توشی بەلایەك بن، دەڵێ: خودا منی بە چاکە خوێندەوە کە من لەگەڵیاندا نەبوم. ئەگەر ئێوە لە سایەی چاکەی خوداوە دەستکەوتێ باشتان دەست کەوت، وەك کەسێکی کە لەپێشدا هەر یەکترتان نەناسیبێ و دۆستایەتیتان نەبوبێ، دەڵێ: خۆزگە منیش ڕەگەڵیان کەوتبام؛ ئەوسا منیش لەو خێر و بێرە گەورەیە بەشدار دەبوم.﴾النساء:٧٢-٧٣

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ

أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍۢ قُلْ مَتَـٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌۭ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌۭ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا: ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە، پێیان گوترا هەتا لە مەککەن شەڕ مەکەن؛ نوێژ بکەن و زەکات بدەن. کاتێ بیستیان خەزایان لەسەر نوسراوە و زانیان دەبێ بچنە شەڕێ، ئەوەندەیان لەو خەڵکەی کە دەچنە گژیان ترسی لێ نیشت، کە لە خوداش هەر ئەوەندە ترساون و بگرە پتریش دەترسان! دەیانگوت ئەی پەروەردگارمان! بۆچی خەزات بۆ نوسیوین، چی دەبو تا ماوەیەکی تر دوات خستباین؟ بڵێ ژیانی دونیایە کەم و کورتە و بۆ ئەوانەی کە ترسیان لە خودا هەیە، ژیانی ئەولا زۆر باشترە و بەقەد داوی زراوی ناو دەنکە خورما، کەس ناهەقی لێناکرێ.﴾النساء:٧٧.

﴿وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌۭ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَـٰنَ إِلَّا قَلِيلًا: هەرکاتێ سەبارەت بە هێمنایەتی یان مەترسی، دەنگ وباسێکیان پێدەگا، سەربەخۆ لەلای هەمو کەس بڵاوی دەکەنەوە. گەر هەر لەلای پێغەمبەر و کاربەدەستانی خۆیان بیانگوتایە، دەیانزانی ڕاستەقینەکەی کامەیە و ئەو جۆرە دەنگ وباسانە لەکوێوە سەریان هەڵداوە. ئەگەر چاکە بەزەیی خواتان نەبوایە، -کەمتان نەبێ- دەبوونە پەیڕەوی شەیتان..﴾النساء:٨٣.

بەڵام مونافیقەکان چۆن باسیان دەکەیت بیکە قەیدی نیە..

ئەوانە هەموو لەناو کۆمەڵگاکەی پێغەمبەردا بوون، پێغەمبەریش لەناویاندا بووەو وەحیش بەدوای یەکدا دەهاتە خوارەوە بۆ سەریان و ڕێنمایی دەکرد، هەست و ڕەفتارەکانی ڕاست دەکردەوە، کەواتە دەردەکەوێت، کە (بنکە جەماوەریەکە) هەمویان بۆ ئەو ئاستە بەرز نەبونەوە، ناشبێت هەموویان وەك کۆمەڵە پوختەکە بن، کە چاودێری سەرکردەی پەروەردەکەر لەسەریان بوو..

بەڵام واقیعی مێژوویی دەڵێت: ئەو قاعیدە پتەوەی پێغەمبەرﷺ بەچاودێری خۆی پەروەردەی کرد و گرنگی پێدانی خۆی و چاودێری خۆی دانێ، ئەوەندە پتەو و

بڕوا چەقیو و ڕاست و ڕێك بوون بەشێوەیەك هەموو ئەوانەیان هەڵگرت کە بەرەو ئامانجەکانی بردن. هەتا تەمەڵ و بارگران و بڕوا لاواز و دووڕووەکان و دوژمنە ئاشکراکانیش نەیاندەتوانی لەو پێشڕەوییە بیانوەستێنن! ئا ئەوە پەند وەرگرتنە لە بەدی هێنانی بنکەیەکی پتەوی بڕوا قوڵی ئاست بەرز، چونکە بێ ئەوە (جەماوەر) کەسێکیان دەست ناکەوێت بەرزیان بکاتەوە بۆ سەرەوە، هەرکاتێ بەلای نزمایی دا دەدات، یان هەنگاوەکانی ڕاست بکاتەوە، هەر کاتێ بەلای لاڕێیی دا دەدات، یا ڕێنمایی بکات، هەر کاتێ ڕێگای ون کرد.

کەواتە بنکەی پتەو پێویستە، بۆخۆشی نیە، یا زیاد لە پێویست نیە، یا شتێك نیە بتوانرێت بەبێ ئەو ڕێگای ڕاست بگیرێتە بەر.

* * *

پاشان ئەو بنکە پتەوەی کە پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردبوو، سەرکردایەتی (جەماوەر)ی پێ سپێررا، جا هەر سەرکردایەتیەکی سەربازی لە جەنگی، یان سەرکردایەتی ئاکاریی لە مامەڵەی تاکەکەسی، یان سەرکردایەتی کۆمەڵایەتی بۆ پێکهێنانی پەیوەندیەکانی کۆمەڵ، یان سەرکردایەتی فیکری یا لە هۆشیارکردنەوەی خەڵك بە حەقیقەتی ئیسلام، بە پێشەنگی و بە وشە، ئەو بنکەیە بوو لە دورگەی عەرەبدا، کە بەرەنگاری نەفامێتی بووەوە جاهیلیەتی بەزاند و بونی سڕیەوەو بیناکەی تێکدا و لەجێگایدا بینای نوێیان دروست کرد.

لەڕاستیدا ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو.

ئەو کەسەی دوای ڕوداوەکانی مێژوو بکەوێت، ئەو کەسەی باش لە ئایەتەکانی قورئان ڕابمێنێت کە وەسفی جەنگی نێوان هەق و باتڵی کردووە، دەزانێ چەند هەوڵی زۆر دراوە لەو جەنگە گەورەدا، هەتا لە کۆتاییدا بە بەرژەوەندی ئایینە هەقەکە کۆتایی پێهێنرا، جا چ کۆششی دەرونی بوبێت لە ئارام گرتن لەسەر مەینەتی و سەختی جەنگ و بوون بە سەرباز، یا هەوڵی جەستەیی و مادی، چەند قوربانی بۆ دراوە، چەند پاڵەوانێتی و چەند لە نمونەی جوان لە واقیعی زەویدا بەدی هات.. هەروەها جێگای ڕاست و دروستی پێغەمبەرﷺی بۆ دەردەکەوێت لە سەرکردایەتی کردنی ڕاستەوخۆی بۆ کۆمەڵە پوختەکە، هەروا سەرکردایەتی

کردنی پێغەمبەر بۆ (جەماوەر) بەیارمەتی ئەو کۆمەڵە پوختەیە، لە کۆتاییشدا لەو جیهادەدا شوێنی ئەو بنکەپتەوەی بۆ دەردەکەوێت، کە واقیعی دورگەی عەرەبی گۆڕی، پاشان واقیعی زەویش.

جەنگەکە وا ئاسان نەبوو، چونکە بەرەنگاری بیروباوەڕە گەندەکان و بەها گەندەکان و نەریتی گەندەڵ و، جۆرەها ڕەفتاری گەندەڵ، هەروا چەندەها دەروون، کە لاڕێی بیروباوەڕی و بەهایی و نەریتی و ڕەفتاری گەندی کردبوو، پاشان ئەو کەسانە رازی بوون و ملیان دا بەو لادانە، وایان دەزانی هەقە و ڕاستە، ئەوە ئەو شتەیە دەبێ پارێزگاری بکرێت و جەنگی لەسەر بکرێت!

کارێکە خوا ململانێی نێوان هەق و ناهەقی چواندووە بەوەی ئاگری لەسەر دەکەنەوە: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدًا رَّابِيًاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ: لەو ئاسمانە ئاوێکی داڕژاندوە، پڕاوپڕی بارستایی دۆڵەکان دێ؛ لافاو کەفێکی بڵندی هاتە سەر، هەروەك ئەو کەفەی بەهۆی ئاگر دەماندنێ، دێتە سەر کەرەسەی خشڵ و ئەسبابی تر. ئا بەم تەرزە خودا باسی ڕاست و دەغەڵ دەخاتە ڕوو. جا کەفەکە لەناو دەچێ و هەر ئەو شتەی کە بۆ مەردم بەهرەی هەیە دەمێنێتەوە. خودا ئاوا نمونە دەهێنێتەوە.﴾الرعد:١٧.

بەڕاستی ئەوە ئاگری ڕاستەقینەیە! ئاگرێکە دەمێنێ! ئاگرێکە داخ دەکات! ئاگرێکە شت دەتوێنێتەوە.. بڕوادارەکان هەڵیدەگرن بە ئارام و عەزم و پشت بەخوا بەستن و ڕوکردنە خوا، پاشان یەکەمجار لە ئەنجامەکانی لابردنی پیسیەکانە لەدڵی بڕوادارە موجاهیدە ئارامگرەکاندا، کاتێ دەرونیان پاك دەکاتەوە و خۆیان بۆ خوا یەکلادەکەنەوە، پاشان لابردنی پیسی لە زەویدا ناهەق نامێنێ و فشۆڵی و پەلاماری و ستەمەکەی دەڕوات. هەق حوکم دەکات..

بنکە پتەوەکە لە هەموو ئەوانەدا بەتەواوەتی بەڕۆڵی خۆی هەڵساوە، هەتا

کارەکە لە دورگەدا بۆ ئیسلام جێگیر بوو. پاشان بنکە پتەوەکـە هەڵسا بـە ڕۆڵی فراوانتر..

دورگەی عەرەبی بوو بە بنکە، بوو بە لانە، بـوو بـە شـوێنی دەرچـوون، بـەڵام ئامانجەکە هەموو زەوی بوو!

بەڕاستی ئـەم ئایینـە بـۆ هـەموو خـەڵك هاتۆتـە خـوارەوە، بڕوادرەکـانیش لـە دورگەی عەرەب بە سەرکردایەتی پێغەمبەرﷺ ڕێنماییکەر بوون بۆ مرۆڤایەتی، ئەو بانگخوازانە بوون، کە خەڵکیان بـانگ دەکـرد بـۆ ئـایینی هـەق، ئـەو مامۆسـتایانە بوون، کە خەڵکیان فێر دەکـرد حەقیقـەتی ئایینەکـە چـۆن دەبێـت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّـةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَـكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِـيدًا: بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتـە ئوممـەتێکی هـەڵبژاردە، تـا ئاگاو لە مەردم هەبن و پێغەمبەریش چاودێریتان لیّ بکا.﴾البقرة:١٤٣.

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّـةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ: دەبێ لـەنێو ئێـوەدا کۆمـەڵێك ببن، فەرمان بە چاکـە بـدەن و ڕێ لـە خراپـە بگـرن؛ هـەر ئەوانـەش ڕزگـار دەبـن.﴾آل عمران:١٠٤.

ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو..

بەڕاستی مێژوو تەرکیز دەکاتە سـەر ئـەو جەنگانـەی، کە لـەنێوان سـوپاکاندا ڕوودەدات.

لەڕاستیدا جەنگی سوپاکان لـە کۆتـاییدا ئـەنجامی ململانێ یـەکلا دەکاتـەوە، بەڵام سەرنج دان لە کارەکە ئەوەیـە، کـە تەنـها ململانێیـەکی جەنگیـە، سـوپا لـە مەیدانی جەنگدا بڕیاری لەسەر دەدات، لایـەنێکی گرنـگ لـە هەقیقـەتی ململانێکـە دەشارێتەوە، لە شوێنێکی تـەسکدا بەندی دەکات، کارێك لادەبات، کە زۆر گرنکە، یا لە پلەوپایەی کەم دەکاتەوە، ئـەویش بیروبڕواکـان و بەهاکانـە، کـە لـەپێناویدا ململانێکە دەکرێت.

بەڕاسـتی ململانـێ-بـەزمانی سـەردەم- لــە حەقیقەتەکــەیدا ململانێیــی

شارستانیەتە، ململانێیە لەنێوان شارستانیەتی ساغ(سلیم) و شارستانیەتی گەندەڵ(فاسد)، لەنێوان شارستانیەتی ئیمانی و شارستانیەتی نەفامیدا، ململانێیەکی گشتگیرە، هەموو لایەنەکانی دەرون دەگرێتەوە، هەموو لایەنەکانی ژیانیش، هەرچەندە ململانێی شەڕئامێز ئەو لوتکەیە، کە ئەنجامەکە یەکلادەکاتەوە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت!

تەتارەکان لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا سەرکەوتن و زەویان ڕامالّی، بەلاّم شارستانیەتێکی ڕاستەقینەیان دانەمەزراند، کە شایستەی مانەوە بێت و شایستەی ژیان بێت، سەرەڕای هەموو پێشکەوتنێکی مادی و زانستی و تەکنۆلۆجی، کە هەیان بوو، بەڵکو لە زەویدا یاسای دارستانیان بلاّو کردەوە؛ بەهێز بێهێز دەخوا، یا لەڕێگای خۆی لایدەدا، هەروا فەسادی بیروباوەڕیان بلاّو کردەوە لەگەڵ ڕەوشت خراپی لەسەر ناشیرینترین شێوە، کە مێژووی نەفامی ناسیبێتی.

ململانێی شەڕئامێز ململانێی ڕاستەقینە نیە، یا بڵێ –بەلانی کەمەوە– بەتەنها ململانێی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو ململانێی ڕاستەقینە بریتییە لەو بەهایانەی، کە سوپاکان لەپێناویدا دەجەنگن، ئەو بەهایەی کاتێ سوپاکان سەردەکەون، خاوەنەکانی بلاّوی دەکەنەوە! ئا لەوەدا فەتحی ئیسلامی لە هەموو بزوتنەوە فراوانخوازەکانی خۆ فراواکردندا لە مێژوو جیادەکرێتەوە.

ئارەزوی فراوان بوون، ئارەزووی داگیرکردنی زەوی، ئارەزوی تێکشکاندن و زەبونکردن نەبۆتە بزوێنەری سوپا عەرەبیەکان بۆ فەتح، بەڵکو ئامانجەکە – بەفەرمانێك لەخواوە– بلاّوکردنەوەی یەکخواپەرستی بوو لە زەویدا و لابردنی نەفامیی و ستەمەکانی بوو، بۆ ئەوەی قسەی خوا لەسەرەوە بێت، ئایین هەر بۆ خوا بێت: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ: لەگەڵیان شەڕکەن هەتا ئاژاوە نامێنێ و دین گشتی دینی خوا دەبێ.﴾الأنفال:٣٩.

ئەوەش ئەوەیە هەروەك ڕەبعی کوڕی عامیرﷺ بەسەرکردەی فارسەکانی وت: دەرهێنانی خەڵکە لە پەرستنی بەندەوە بۆ پەرستنی خوا، لە ستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام، لە تەسکایەتی دونیاوە بۆ فراوانی دونیا و ئاخیرەت..

بزوتنەوەیەکی شارستانی بەرزە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە پەرستنی تاغووت و ستەمکارانەوە بۆ پەرستنی خوا، لە ئامێزگرتنی خەیاڵ بۆ ئامێزگرتنی حەقیقەت، هەروا لە زۆر و ستەمەوە بۆ دادپەروەری و یەکسانی، لە نەزانیەوە بۆ زانین، لە تاریکیەوە بۆ ڕوناکی.

هیچ بزوتنەوەیەکی شارستانی لە مێژوو نیە وەك فەتحی ئیسلامی کردبێ.

جوانی فەتحی ئیسلامی تەنها لە بلیمەتی جەنگدا نیە، کە چەند پیاوێکی ژمارە دیاریکراو و کەلوپەلی جەنگی سەرکەون بەسەر فارس و ڕۆم، کە بە ژمارە و کەلوپەلی جەنگی و هونەری جەنگی و توانستی مادی، چەند ئەوەندەی ئەوان بن. ئەوە بە هیچ لێك نادرێتەوە -دوای یارمەتی خوا- جگە لە شوێنەواری بیروباوەڕی ڕاست بەخوا و بە ڕۆژی دوایی لە دەروونی ئەو جەنگاوەرانەی ئەو بیروباوەڕەیان وەرگرتبوو، جگە لە پەروەردەبونیان لەسەر ڕاستیەکانی بیروباوەڕی ڕاست، کە ڕاستی توانای و هێزی بەخشی بەو جەنگاوەرانەی ژمارە و کەلوپەلیان دیاریکراو بوو تا بگەن بە ئۆقیانوس لە ڕۆژئاوا و هندستان لە خۆرهەڵات لە ماوەی نیو سەدە کەمتر، ئەو ماوەیە خێراییەی، کە لەمێژوودا بێوێنەیە.

جوانیەکە تەنها لە بلیمەتی جەنگدا نیە، بەڵکو ئەوە -بەخۆی- کارێکی زۆر گەورەیە لە تەرازوی مێژودا، بەڵام جوانیە گەورەکە لە کردنەوەی دڵەکاندایە بۆ ئیسلام، هەروا بە ملیۆنەها چونە ناو ئایینە هەقەکەوە، بێ زۆرلێکردن!

جەنگ هەرگیز بۆ زۆر لەخەڵك کردن نیە، کە بێنە ناو ئیسلامەوە: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ: لەم دینەدا بەزۆر داسەپاندن نیە، شارەزایی لە گومڕایی هاوێر کرا.﴾البقرة:٢٥٦.. بەڵکو جەنگ بۆ لابردنی نەفامیی بوو، ئەو نەفامیەی لە بیروباوەڕی نەفامیدا خۆی دەنوێنێ، کە ڕژێمی نەفامی لەسەر دادەمەزرێ و سوپاکانی نەفامی دەیانپارێزێ، جا ئەگەر ئەوە لابرا خەڵك دوای ئەوە سەربەستن چیان بوێت بۆ خۆیانی هەڵدەبژێرن: ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ: شارەزایی لە گومڕایی هاوێر کرا.

هەرکێ لە تاغوت نەبانە و بڕوای بە خودا بهێنێ، هەنگڵێکی هێندە توندی بەدەستەوە، هەرگیز پسانی بۆ نیە. خوداش بیسەر و زانایە.﴾البقرة:٢٥٦.

بەڵام(ئەوەیتر) کە دەیەوێت بە ئایینەکەی خۆی بپارێزێت، ئەو کەسە لەسەر گومڕاییەکی ڕوونە و لەگیان و ئاین و هەموو شتێکی ئەمینە، هەتا ئازار نەگەیەنێ بەبڕوادارەکان و جەنگیان لەدژ نەکات: ﴿لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ: خودا ڕێتان لێ ناگرێ کە ئێوە دەگەڵ ئەوانەی بەگژ ئێوەدا نەچوون و لەزێدی خۆتان وەدەریان نەناون، چاکەیان دەربار بکەن و بە یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن. خوا مرۆی خاوەن ئینسافی خۆەش گەرەکە.﴾الممتحنة:٨.

ئەو ملیۆنەها مرۆڤەی چونە ناو ئیسلامەوە بێئەوەی زۆریان لێبکرێت، بەڵکو لەبەر ئەوە چوونە ناوی، چونکە بینیان لەو مرۆڤانەدا خۆی دەنوێنێ کە کردویانەتە بیروباوەڕی خۆیان و کاری پێدەکەن، ئەو مرۆڤەی لەسەر حەقیقەتی ئیسلام پەروەردە بووە، بڕواکەیان گۆڕیوە بۆ واقیعێکی بینراو، کە سەری بینەرانی سەرسام دەکرد، بۆیە دڵیان حەزی دەکرد و ئەوانیش دەچونە ناویەوە، جا ئەگەر ئەوانە بەو شێوە ڕۆشنە نەبونایە، ئەوا بەم ماوە کەمە ئەم هەموو خەڵکە نەدەچونە ناو ئایینی نوێوە، با لە مەیدانی جەنگیشدا شکابن، چونکە شمشێر زەوی دەکاتەوە بەڵام دڵەکان ناکاتەوە! ئەگەر خوا بە پێغەمبەرەکەی بفەرموێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ: ئەگەر یەکێ دڵڕەق و توند و تۆسن بای، بڵاوەیان لێ دەکردی.﴾آل عمران:١٥٩. کە پێغەمبەریش بووە، جا دەبێ چی بڵێت بەو مرۆڤە ولات ڕزگارکەرانە ئەگەر لەسەر ڕەوشتێکی بەرز نەبونایە؟!

گۆڕانی هەموو گەلەکان بۆ ئیسلام لەو چاوتروکانەی ڕۆژگاردا ئەوە شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی ئەو تاکە پەروەردەی، کە پێغەمبەرﷺ ئەو بنکە پتەوەی لەسەر پەروەردە کردبوو، کە بە چاودێری و گرنگیدانی خۆی پەروەردە

بووبوون، بۆ ئەوەی ببنە پارێزەرێك بۆ قەدەری خوا، خوا چی بوێت پێیان بکـات: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ: ئەو خودایە پێغەمبـەری خـۆی بـەڕێکرد بـۆ ڕێبـەری و ڕاگەیاندنی دینـی ڕاست، تا سەری خا بەسەر هەموو دینەکاندا.﴾الصف:٩.

جوانی ڕزگارکردن(الفتح) تەنها لە چونە ناو ئیسلامی ئەو نەتەوانەدا نەبوو بـەو خێراییە، بەڵکو لەو دادپەروەرییـە نمونەییەشـدا بـوو، کـە موسـڵمانان مامەڵـەیان پێکردووە –ئەوانەی پێغەمبەرﷺ بـە ئیسـلام پـەروەردەی کردبـون– لەگـەڵ ئـەو وڵاتانەی ڕزگاریان دەکرد، هەتا لەگەڵ ئەوانەش کە لەسەر ئایینەکەیان دەمانەوە، بەسەرهاتەکەی (عمر)ﷺ لەگەڵ باوکی لاوە قیبتیەکەدا، کە کـوڕی عـەمری کـوڕی عاص بەدار لێیدابوو، لە مێژودا بەناوبانگە و ئەو قسەیەی (عمر) بە (عـەمر)ی وت: ((یا عمرو! متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمـــهاتهم أحـــراراً: عـەمر! لەکەیـەوە خەڵکتان کردۆتە بەندەی خۆتان کە دایکەکانیان بە ئازادی هێناویەتیانـە بـوون))، ئەو قسەیە بەناوبانگە، هەروەها لە مێژوودا تاکە!

ئەمانە و قسەکردنی ئەو هەموو نەتەوانە بە زمانی عـەرەبی –بـێ زۆر لێکـردن– سەیرە و لەمێژوودا بێنمونەیە، سنوری ئەو جوانیە زۆرە نەبوون، کە بەشـێوەیەك بوو ئەو نەتەوانە زمانەکەی خۆیان لەبیر چووبوەوە، هەتا ئەوانەشـیان کـە لەسـەر ئایینەکەی خۆیان مابونەوە وایان لێهاتبوو زمانەکەیان بوو بەعەرەبی، بە عەرەبی قسەیان دەکرد و بیریان دەکردەوەو خواپەرستیان پێدەکرد!

لەکۆتاییدا هەرچەندە کۆتایی نیە، بەڕاستی ئەو بایەخ دانە زۆرەی پێغەمبەرﷺ بە پەروەردەکردنی ئەو بنکە پتەوە، ئەوە دەستەبەر(ضمان)ە –دوای خوای پـاك و بـەرز– بـۆ بـەردەوامی بەرنامـە(منـهج)ەکـە، دوای ئـەوەی دامەزرێنەرەکـەیﷺ دەگاتـە لای پـەروەردگاری خـۆی، خەلیفـە راشـدینەکان –بەهـەموو ئـەو نمونـە بەرزانەی تێیدابوو لە هەموو بوارێك لە بوارەکانی ژیـان– شـایەتی ڕاسـتن بـۆ ئـەو حەقیقەتە، کە ئەوانیش درێژەپێدەری واقیعی بوون بۆ بەرنامەکـەی پێغەمبـەرﷺ، دوای پچڕانی سروش(وحي) و نەمانی سەرکردەی گەورەﷺ و ونبوونی لەبەرچاوان.

ڕاستە ئـەم قۆناغـە زۆری نـەخایاند و بـۆی دانـەنرابوو بخایـەنێت، بـەڵام ئـەوە

دابەزین و کۆتایی ئیسلام نەبوو وەك ڕۆژهەڵاتناسەکان و دوژمنانی ئەم ئایینە بەگشتی بڵاوی دەکەنەوە، بەڵکو ئەو قۆناغە بەرزبوونەوە بوو بۆ کەشکەلانی بەرز، بەشی زۆر لە کارەکانی پشتی بەستبوو بە خۆبەخشی جوامێرانە، کە لە سەرەوەی سەپاندنە، بەوەی کە فەرزکرابوو لەلایەن خوا و پێغەمبەرەکەیەوە، جا ئەگەر خەڵك دوای ئەوە بۆ زەمینەی پابەندبوون دابەزین یا نزیك بوو لێی، ئەوە لە حەقیقەتدا دانەبەزیون، بەڵکو باڵەکانیان لە فڕین شل کەوتونە سەر زەوی ڕەق و بەپێ دەڕۆن! ئەوەشیان بەسە -دوای ئەوەی هاتنە خوارەوە لەو بەرزاییە کە ئەوپەڕی بەرز بوو- لەوەی پێی هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی یەکخواپەرستی لە زەویدا، هەروا ئەو بەها شارستانیە بەرزەی کە بە مرۆڤایەتیان داوە، کە بەردەوام ئەوروپا هەتا سەدەی حەڤدەهەمی زایینی لێی وەردەگرت، واتە دوای گەیشتن بە لوتکە بە دە سەدە!

ئەو ماوەیە لەگەڵ ئەوەدا کە بریسکەیەکی شەوقدار نەبوو، ماوەیەك ڕوناکی بداتەوە پاشان نەمێنێ، بەڵکو شەوقە بریسکەدارەکەی هێشتا هەتا ئەم چرکەساتەش ڕێگا ڕوناك دەکاتەوە و هەتا ئەو کاتەی خوا دەیەوێت هەروا دەبێت! -هێشتاش- بە نمونەییە واقیعیەکەی یارمەتیدەرە بۆ هەموو نەوەکان، ئەو نەوانەی لایەنی شەوقەکە دەگرن و هەوڵ دەدەن پێی بەرز ببنەوە، جا ئەگەر بە کردەوە بەرز نەبونەوە ئەوەیان بەسە کە ڕووەو بەرزین. ئەو ڕووەو بەرزییە هەمیشە باشترە لەو دواخستنەی، کە دەبێتە هۆی دابەزین بەهۆی ڕاکێشانی زەوی و ڕاکێشانی ئەوانەی حەز بە چون بەلایدا دەکەن. هەموو بزوتنەوە چاکسازیەکان و بوژانەوەیەك لە مێژووی ئیسلامدا -کە چەند زۆریشە و ئێستا یەکێکە لەوانە- شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی ئەو ماوە بریسکەدارەی، کە هێشتا ڕۆشناییەکەی ڕێگا ڕۆشن دەکاتەوە. جا لەپێناوی ئەوەدا بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتناسەکان و دوژمنانی ئیسلام بەگشتی هەوڵ دەدەن بۆ ناشیرین کردنی ئەو ماوەیە، بۆ ئەوەی ئەو ڕوناکیە شەوقدارە نەهێڵن و بێشگیری لە تیشکەکەی بکەن لە گەیشتن بەو نەوانەی، کە ڕێی خۆیانی پێ ڕۆشن دەکەنەوە و سەرلەنوێ بەرەو لوتکە ڕادەپەڕن، خەیاڵ خاون کە هەوڵە پیسەکەیان سەردەکەوێت، ئەوان

ئینکاری قەدەری خوا دەکـەن: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ: گەرەکیانە تیشـکی خـودا هـەر بـە فـووی دەم بکوژێننـەوە، خـواش تیشـکی خـۆی هـەر سـەردەخا؛ جا بـا خـودا نەناسـانیش خۆشیان نەیە.﴾الصف:٨.

*　*　*

لێرەدا کارێکی گرنگ لە پەروەردەی پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئـەو بنکـە بتـەوە دێتـە پێشەوە، ئەویش زۆر ڕاوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ بووە بە هاوەڵەکانی.

لە سەرەتاوە دەپرسـین: ئایـا پێغەمبـەر ﷺ پێویسـتی بـەڕاوێژکردن هـەبوو لـە کاتێکدا وەحی بۆی دەهاتـە خـوارەوە، کـە خـوا چـۆن مـەیلی لێبا ڕونکردنـەوەی دەنارده خوارەوە، ڕێڕەوی کۆمەڵە موسڵمانەکە ڕاست بکاتـەوە هـەرکاتێ ویسـتی لارێیی لێ ڕوبدات؟ بەڵکو هەندێ ڕەفتاری پێغەمبەری ڕاسـت دەکـردەوە، کـە لێـی ڕودەدا، وەك ڕەفتـاری لەگـەڵ ئیبن ئـوم مـەکتوم و ڕەفتـاری لەگـەڵ دیلـەکانی (بەدر)دا کردی؟

نـا! پێغەمبـەر پێویسـتی بـەڕاوێژ نـەبوو، ئەوکاتـە هەڵدەسـتا بـە بـارگرانیی بانگەوازەکە و ژیانی کۆمەڵە بڕوادارەکەی بەڕێوە دەبرد، چ لە مەککە بوبێت، یا لە مەدینە، بەڵکو ئەوە پەروەردە و پێویستیەکانی بووە.

پـەروەردەکردن لەسـەر گوێڕایـەڵیکردن و بەرفـەرمانی بـە تەنـها، سـەربازی پابەند(ملتزم) دەردەچوێنێ، بەڵام سەرکردە دەرناچوێنێ.

پابەندبوون بە فەرمانی پێغەمبـەر ﷺ پەرستنێکە لەلایـەن خـواوە فـەرزکراوە: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ: هـەر کەسێکی بەرفـەرمانی پێغەمبـەرە، دیارە بەرفەرمانی خوایە.﴾النساء:٨٠.

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ: هەرکەسێکمان بـە پێغەمبـەر ناردووە، بۆیە بـووە کـە بـە خـەڵك ڕابگـەیێنێ، بـە ئیزنی خـوا دەبـێ فەرمانی قبوڵ کەن.﴾النساء:٦٤.

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟: هـەرچی

پێغەمبەر دەتانداتێ، لێی وەرگرن، لە هەرچیشتان بێبەش دەکا، دەستی بۆ مەبەن.﴾الحشر:٧.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمان خودا و پێغەمبەری خودا بن.﴾النساء:٥٩.

﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: با ئەوانەی کە خۆیان لە فەرمانی ئەو دەدزنەوە ترسیان هەبێت کە بەڵایەکیان بەسەر بێ، یا وەبەر جەزرەبەیەکی بەژان کەون.﴾النور:٦٣.

﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ: مەدینەیی و ئەو عارەبە دەشتەکیانەی لە دەوریانن، نەدەبوایە پێغەمبەری خودایان وەلا بنایە و خۆیان لەو هەڵاوێردایە.﴾التوبة:١٢٠.

بەڵام پێغەمبەرﷺ نەیدەویست هاوەڵەکانی تەنها سەربازی گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانی سەرکردەیان، هەرچەندە دەستگرتن بە فەرمانەکەیەوە ڕزگاری و سەرکەوتنە، جگە لەوەی پەرستنێکی فەرزە، بەڵکو دەیوست لەناویاندا سەرکردە بۆ مرۆڤایەتی دروست بکات، ئەوەش بەجێهێنانی قەدەری خوایە بۆیان، هەروا مەبەستی خوای بەرز لە دەرهێنانی ئەم نەتەوەیە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بکا.﴾البقرة:١٤٣.

ڕاهێنان لەسەر سەرکردەیی و سەرۆکی تەنها بەڕاوێژی ئەو سەرکردەوە دەبێت کە پەروەردەیان دەکات.. چونکە ڕاوێژکردن، شارەزایی و گەشەکردن لەناویاندا دروست دەکات: ﴿قُلْ هَـٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ: بێژە: ئەمە ڕێگای منە،

هەم خۆم و هەم ئەو کەسانەی شوێنم کەوتون –بە ڕۆشنبینی– بۆ خواناسی، بانگەواز دەکەم، خواش هەمیشە پاکە و تاکە و لەوانە نیم کە شەریکی بۆ پەیداکەم.﴾یوسف:١٠٨.

لە ڕێزبەندی ئایەتەکەدا ئاشکرایە، کە ڕۆشنبینی شتێکە سەربەخۆیە و خۆی لەخۆیدا خوازراوە لە تەك ئەو ئیمانەی، کە لەو ئایەتەدا دەربڕاوە، کە فەرمویەتی: ﴿وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ: خواش هەمیشە پاکە و تاکە و لەوانە نیم کە شەریکی بۆ پەیداکەم.﴾یوسف:١٠٨.

بەڵێ ئیمان خوازراوە، بەڵام ڕۆشنبینیش هەر خوازراوە، بۆ ئەوەی لە جیهانی واقیعدا جوڵە بەم ئایینە بکات، بۆ ئەوەی بزوتنەوەکە، بە فەرمانی خوا بەری بە تەواوەتی بدات، کۆششەکە هەمووی، یا بەشێکی، لە جوڵانەوەی هەڵەدا؛ لە ناونەچێت.

ڕاوێژ لە سەرکردەوە بۆ شوێنکەوتوەکانی وا لە شوێنکەوتووەکان دەکات، لە هەڵوێستە جیاجیاکان و لە ڕا جیاجیاکاندا بە عەقڵی خۆیان بیربکەنەوە، بۆ ئەوەی ڕاسترین و شایستەترینیان بەو هەڵوێستە هەڵبژێرن، کە دەویسترێت وەربگیرێت، هەروا ڕایان دەهێنێ لەسەر گرتنەئەستۆی لێپرسراوێتی، جا لێرەدا ڕا دەربڕین لێپرسراویە لەگەڵ ئەوەی ڕاسپاردەشە.. کاتێ ڕاوێژ دووبارە دەبێتەوە بیرکردنەوەو هەڵاوێردن لەگەڵ لێپرسراوی گرتنەئەستۆ دووبارە دەبێتەوە، ئەو لێپرسراویەی مرۆڤ ئامادەی کردون بۆ بەرەنگاربوونی هەڵوێستی کردەیی کاتێ تێیدا دەبێت، هەستەکانی لە بەرەنگاربوونەوە ناسڵەمنەوە و ناترسێت لە لێپرسراوێتی، ئا ئەوانە ئەو سیفەتە خوازراوانەیە، کە لە سەرکردەی سەرکەوتودا دەبێ هەبێت. هەموو مرۆڤێکیش نابێتە سەرکردەیەکی سەرکەوتو، بەڵام ئاشنای کەسێکی شایستە نابیت بۆ ئەوەی ببێتە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو، هەتا هەل نەدرێت بە کۆمەڵێك خەڵك –ئەوانەی هەڵدەسن بە پەروەردەکردنیان– بۆ ئەوەی وەك پێویست مەشق وەربگرن، جا ئەو کاتە تواناکانیان دەرکەوێت، دەرکەوێت کێ شایستەی دەرکەوتنە. بەڵام ئەگەر لە هەموو کارەکاندا لەسەر گوێڕایەڵی و بەرفەرمانی پەروەردەت کردن، کەس لەوانە ناتوانێت شارەزایی خوازراو بەدەست

بهێنێ، کاتێ ئەرکێکیان دەخرێتە ئەستۆ شپرزە دەبن، پاشان هەرەس دێنن، ڕێڕەوەکەش دوای سەرکردەی دانا و ژیر لەسەر دەستیان نوشستی دێنێت، با ئەوانە لەژیانی سەرکردەشدا لە سەربازە دڵسۆزەکانیش بووبن!

لێرەدا سووربوونی پێغەمبەرﷺ لەسەر ڕاوێژکردن بە شوێنکەوتوەکانی ڕوون دەبێتەوە، لەکاتێکدا خۆی پێویستی بە ڕاوێژکردن نەبووە، چونکە ئامادەی دەکردن –لەسەر زانست– بۆ ئەوەی دوای خۆی ببنە سەرکردەی دانا و ژیر، یان بەلایەنی کەمەوە ببنە ڕاوێژکاری ڕا پێکاو و ڕاست، بۆ ئەوەی ڕاڕەوەکە دوای خۆی بەردەوام بێت و نەوەستێت، هەروا توشی نوشستی نەبێت لەدوای ئامادەنەبوونی سەرکردەی لێهاتووی گەورە.

*  *  *

ئەوە بنکە پتەوەکە بوو، کە پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردن، ئەوەش ڕۆڵەکەی بوو لە مێژوودا.

پێکهێنانی ئەو بنکەیە بۆ خۆشی نەبووە، ئەو کۆششە گەورەیەی پێغەمبەرﷺ داوێتی بۆ پەروەردەکردنی کارێکی زیاد لەپێویست نەبووە، بەڵکو بە ئیلهامی خوا و یارمەتی و پشتگیری خوا بووە، کە پێویستترین شت بووە بۆ ئەو ئایینە و بۆ ئەو کارە گەورەیەی خوا لە پێناوی ئەو ئایینەدا ناردویەتیە خوارەوە.

با ئێستا بچینەوە سەر باسی واقیعی ئێستامان بۆ ئەوەی بە وێنە ڕاستەقینەکەی ئاشنابین و پایەی پێشەنگ لە بەرنامەکەی پێغەمبەرﷺ لە پەروەردەکردنی بنکە پتەوەکەدا ئاشنابین، ئەو بنکەیەی، کە یەکەم جار بارگرانی ئەم ئایینەی خستۆتە ئەستۆی.

حاڵی نەفامیی ئەمڕۆ چییە؟

ئیبن تەیمیە –بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت– دەڵێت: (لەپاش ئەوەی پێغەمبەرﷺ نێررا جاهیلیەتی ڕەها(مطلق) لە ولاتێکدا هەبوو لە ولاتیکی تردا نەبوو، وەك حاڵی ولاتانی بێبڕوا، هەروەها لە کەسێکدا هەبوو لەکەسێکیتردا نەبوو، وەك پیاوێك پێش ئەوەی موسڵمان بێت لە نەفامیدایە هەرچەندە لە ولاتی ئیسلامیشدا بێت.

بەڵام لە سەردەمی ڕەهادا نـەفامی نـەماوە دوای هـاتنی پێغەمبـەرﷺ، چونکـە بەردەوام لەناو نەتەوەکەیدا کۆمەڵێك هەن پشتی هەق دەگـرن هـەتا ڕۆژی دوایـی، بەڵام نەفامی بەندوبەسـت(مقيـد) لـە هـەندێ وڵاتـانی موسـڵماناندا سـەرهەڵدەدا و لەناو زۆریش لە موسڵماناندا.)[1]

جا ئەگەر ئەوە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا بوبێت، کە موسڵمانەکان هێشـتا دەستیان بە زۆر بە فەرمانەکانی ئایینەکـەیان گرتبـوو، ئەگـەریش لـە زۆرینـەیاندا زیادەڕەویان کردبێت، ئەدی ئەگەر ئیبن تەیمیـە واقیعـی ئێسـتامانی بدیایـە، چـی دەربارەی دەوت، کە لەم سەردەمەدا بیدعەی یاسادانان بە غـەیری ئەوانـەی خـوا ناردویەتیە خوارەوە؛ بڵاوبۆتەوە و قەدەغەکردن و ڕەواکردن بـە غـەیری ئەوانـەی خوا ناردویەتیە خوارەوە تا وای لێهاتووە حوکم کردن بە یاسای خوا قەدەغە بێت بە دەقی دەستورەکان. داوای حوکم کـردن بـە یاسـای خـوا تاوانێکـە لـەپێناویدا، سـەرەکان لـە لـەش جیادەکرێنـەوە، لـە پێنـاویدا هـەزارەها و سـەدەها هـەزار لـە بەندیخانەکاندا ئازار دەدرێن.. وایلێهاتووە ڕووتـی ئـافرەت بووەتـە بنەمایـەك لـە بنـەماکان، سەرداپۆشـینیان –وەك خـوا فـەرمانی داوە– بیدعەیـەکی خراپـە و هۆکانی ڕاگەیاندن بـە هـەموو شـێوەیەك هـێرش دەکەنـە سـەری.. (یاسـا)ش وای لێـهاتووە پارێزگـاری لـە کردنـی خراپـەکاری دەکـات مـادام هـەردوولا ڕازیـن، وەك ئەوەی هەردوولا بەتەنها خاوەنی کارەکە بن لە مەسەلەکەدا، خوا هیـچ پـەیوەندی پێوەی نەبێت، لە نەریتی نەفامیدا دروست نیە پـەیوەندی بـە کارەکـەوە هـەبێت، خوا ئەوە نیە، کە قەدەغە دەکات و ڕەوا دەکات، وەلا و بەڕا بۆ خـوا و لـەپێناوی خوادا وای لێهاتووە بووەتە کێشەیەك لە کێشەکانی دەمارگیری، زەوقـی سـەردەم پێی ڕازی نیە، چونکە جیهان وای لێهاتووە بەهۆی هۆکانی گەیاندنەوە بوەتە یەك گوند، کەس بۆی نیە ڕێزپەڕ(شاذ) بێت لە داب و نەریت و بیرۆکەکانیدا، جا بەهـەر بیانویەك، بـە تایبـەتی ئـایین لـە هـەموو بیانوەکـانی تـر زیـاتر نابەجێ و نوقمـی دەمارگیری نابەجێیە ! بەو شێوەیە هەموو شتێك وای لێهاتووە.

ئیبن تەیمیە –ڕەحمەتی خوای لێبێ– ئەگەر واقیعی ئێستای ڕۆژئـاوا و زۆر لـە

---

١ کتێبی (اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم)ص٧٨–٧٩.

ولآتانی ئیسلامی بەچاوی خۆی ببینیایە چی دەوت؟

((بَدَأَ الإسلامُ غَرِيباً وَسَيَعُودُ غَرِيباً كَما بَدَأ، فَطُوبَى لِلغُرَبَاء))[1].

ئەمڕۆ چی لە نامۆکان داواکراوە؟ ئەو شتە گەورەیە چیە، کە لەلایەن خواوە شایستەی ئەو ڕێزەیان دەکات؟

بەڕاستی هەر هەوڵێك نامۆکان پێی هەڵسن بۆ لابردنی نامۆیی دووەم بۆ ئیسلام؛ لای خوا پاداشتی دەدرێتەوە بە دەقی کتێبەپیرۆزەکەی خوا: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: چونکە هەرچی لە تینویەتی و ماندووبوون و لە برسیەت-کە لەڕای خودا توشیان دێ- و هەر هەنگاوێکی دەیهاوێن، خوانەناسان توڕە دەکا و هەر گورزێ لە دوژمنی دەوەشێنن، گشتی خودا بە چاکەیان بۆ دەنووسێ، خودا پاداشی چاکەکاران ون ناکا.. هەرچەندە ماڵ بەخت دەکەن، کەم و زۆری و لە هەر دۆڵێك دەرباز دەبن، خودا بۆیانی دەنوسێ، تا پاداشتی لەوە چاکتریان بداتێ.﴾التوبة:١٢٠-١٢١.

بەڵام ئەمە ڕێگری ناکات، کە نامۆکان پلانێکیان هەبێت لەسەری بڕۆن، هەروا ئەولەویاتیان هەبێت بۆ ڕێکخستنی ئەو کارەی پێی هەڵدەستن بۆ لابردنی نامۆیی لەسەر ئیسلام لە واقیعی ئێستایدا.

جا ئایا دەشێ کار بکرێت بەبێ بنکەی پتەو، بۆ ئەوەی بانگەوازەکە لێیەوە بگوێزرێتەوە بۆ جەماوەر.

لەسەرتاوە دەڵێین: ئێمە تەماعی ئەوەمان نیە -کەسیش تەماعی ئەوەی نیە- بنکەیەك دابمەزرێنێ لەسەر ئاستی ئەو بنکەیەی، کە پێغەمبەرﷺ دایمەزراندبوو،

---

[1] پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە.

جا چ سەبارەت بە بنکەی پتەو بێت، یا بنکەی جەماوەریی.. لەگەڵ ئەوەشدا چەند سیفەتێکی پێویست هەیە، کە بنیاتنانەکە بێ ئەوانە دڵنامەزرێت، هەرچەندە کۆششی زۆری بۆ بدرێت و کات و ناسۆر و ناڕەحەتی بوێ.

ئێمە داوا لەکەس ناکەین بەرزبێتەوە بۆ کەشکەلانی فەلەك، وەك هاوەلانی پێغەمبەری خوا تێیدا بەرزبووەوە لە جێگیربوون و هێزدا، ئەوە لە بنەڕەتدا بەسەر کەسدا ناسەپێنرێت.. هەرچەندە بە درێژایی مێژووی ئیسلامی کەسانێك هەبوون یارمەتیان هەرگیز نەبڕاوە، خۆیان بەرز کردۆتەوە بۆ ئەو کەشکەلانە، بەڵام داوای پێشتر هەنگاونان دەکەین لەسەر زەوی پابەندبوندا، یا نزیك بێت لێی، بۆ ئەوەی کردەوەکەمان لای خوا گیرا بێت، بەفەرمانی خوا ئامادەبێت بۆ سەرکەوتن.

ئەو سیفەتانە چین، کە لە بنکەی پتەودا خوازراوە، کە بە ڕۆڵی خۆی هەڵدەسێت بۆ پێکهێنانی بنکەیەکی جەماوەری و ڕێنمایکردنی و پەروەردەکردنی..

ئایا هەرمرۆڤێك تەنها بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، نوێژ بکات و زەکات بدات، لەخواترسەکانە؟ بەڕاستی ئەوانە هەموو سیفەتی گەورەن و هەمویان خوازراون، بەڵام پلەی خوازراوەکە چەندە؟ ئایا سەبارەت بە بنکەی پتەو بەتایبەتی، هەر ئەوە بە تەنها خوازراوە؟

ئەوەپێش نمونەیەکم هێناوە دوبارە لێرە ئاماژەی بۆ دەکەینەوە..

ئەگەر لەڕێگا لە مرۆڤێکت پرسی: کێ ڕۆزیت دەدات؟ بێگومان دەڵێت خوا! ئەگەر لەسەر ڕۆزیەکەی ئازار درا دەڵێ: فلانەکەس دەیەوێت ڕۆزیم ببڕێت، ئایا ئەوە ڕوای بەو هەقیقەتە هەیە، کە خوا خۆی ڕۆزی دەری بەهێزە و، لە هەستیا قوڵ بۆتەوە بەشێوەیەك بوبێتە یەقینێکی دڵی، کە ڕەفتاری لەسەر پێك بێت؟ یان پێویستی بە قوڵکردنەوەی ئیمانەکەی هەیە، هەتا بگاتە پلەی دڵنیایی(یقین)؟ هەروەها حەقیقەتی ئەوەی، کە خوا زیان دەگەیەنێت و سود دەبەخشێت و هەر ئەو دەژێنێ و دەمرێنێ: ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ: لە مەردمدا ئی واش هەیە، دەڵێ: ئێمە

باوەڕیمان بەخوا هەیە، هەرگا لەسەر خودا ناسین ئازار درا، وادەزانێ ئازاری خەڵك وەکو سزای خودا وایە.﴾العنكبوت: ١٠.

ئایا ئەو کەسە دەشێت خشتێك بێت لەناو ئەو بنکە پتەوەی، کە بیناکە هەڵدەگرێت؟ ئایا بەرامبەر تاقیکردنەوە چەسپاو دەبێت، کە تاقیکردنەوە شێوەی کارێکە لە شێوەی کاروباری خوا:

﴿الٓمٓ ۝ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ: ئەلیف، لام، میم، ئاخۆ مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێ و توشی هیچ ئەزمونێ نابن؟ ئێمە ئەوانەی بەر لەمانیشمان بەتاقی کردەوە. بێگومانە خوا ئەوانی کە ڕاستیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن، دیاری دەکا.﴾العنكبوت: ١-٣.

تاقیکردنەوە تەنها سزادان نابێت، چونکە لەوانەیە زۆرکەس بەرگەی بگرن: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً: بەخراپە و بە چاکەبێ، بەتاقیتان دەکەینەوە.﴾الأنبياء:٣٥.

تاقیکردنەوە بەچاکە ترسناکترە، چونکە خەڵك زۆرتر پێی دەکەونە ناو گێژاوەوە، لەوانەیە لەژێر تاقیکردنەوەی سزادان خۆیان بۆ ڕابگرن، بەڵام توانای خۆڕاگرتنیان نەبێت لەبەردەم ماڵ و دەسەڵات و پلەوپایەی لەخشتەبەر و زۆری شوێنکەوتوان و یارمەتیدەران.. جا ئایا هەر کەس لە میحنەت و ناخۆشیدا خۆی بگرێت، دەشێت ببێتە خشتێك بۆ بنکەی پتەو، چ جای ئەوەی بێجگە لەوەی ببێت بە یەکێك لە سەرکردەکانی؟

لێرەدا نمونەیەك دەهێنمەوە، کەپێشتر لە کتێبی (واقعنا المعاصر)دا ئاماژەم بۆ کردووە:

برایەتی واتایەکە لە واتا جوانەکان، کە دەتوانرێت قسەی جوانی کاریگەری خۆش بەدەوریا ڕێك بخرێت، هەروا لە واتاکانی ئیسلامی ڕەسەنە، لەو پایانەیە، کە پێغەمبەرﷺ کاتێ برایەتی خستە نێوان کۆچکەران و یارمەتیدەران، گرنگی دەدا

به چەسپاندنی لەناو ئەو بنکە پتەوەی، کە دروستی کرد، ئەو برایەتیە وای لێـهات لە برایەتی خوێن بەهێزتر بـوو، کە پتـەوتر بـوو لـەوەی نـەفامی عـەرەبی بتـەوی کردبوو.

وەك لـە کتێبـی (واقعنـا المعـاصر)دا وتومـە: برایـەتی دەتوانرێـت بـە ئاسـانی مومارەسە بکرێت کاتێ خەڵك لەخۆشیدابن، چونکـە لـەو بـارەدا زۆری تێنـاچێت، بەڵام ئەگەر رێگاکە بەشێوەیەك تەسك بـووەوە، کـە مـن و براکـەم هاوشـانی یـەك نەمانتوانی پێیدا برۆین، بەڵکو دەبێ یەکێکمان پێش یەکێکمان بکـەوین، جـا ئایـا خـۆم پێـش دەکـەوم یـان براکـەم پێـش دەخـەم؟ پێویسـتمان بـەوە نیـە خۆمـان بەرزبکەینەوە بۆ ئاستێکی بەرزی وا، کە جادەکە تێیدا زیـاتر تەسـك ببێتـەوە وای لێبێت رێی رۆیشتنی کەسێك بێت، نەك دوان بە یەکەوە، یا من بم، یا براکەم بێـت، جـا ئـەو ئاسـتە سـەپاو نیـە، ئـەوەش خـوای پـاك و بـەرز باسـی کـردووە، کـە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِـــهِمْ خَصَاصَـــةٌ: ئـەو بڕوادارانـەی بەرەژەوەندی براموسڵمانەکانیان لەپێشتر دەزانن، هەرچەندە دەسـت تەنگیشـیان هەیە..﴾الحشـر:٩.. ئـەوەی شـتێکی ئاسـایی بـوو لـەو بنکەیـەی، کـە پێغەمبـەر دروستی کردبوو، ئەمڕۆ وای لێهاتووە بەدەستهێنانی شتێکی دوورە.

* * *

بەڵام من لێرەدا بەتایبەت تەرکیز دەخەمە سەر دوو شت، لەوانەی کـە بنکـەی پتەو پێویستی پێی هەبێت، کە ئەمڕۆ لێی دەویسترێ بەرەنگاری نەفامی هـاتووی ببێتەوە کە لەهەمو لایەکەوە چواردەوری ئیسـلامی داوە، ئـەوانیش: یەکلابونـەوە بۆ خوایە و هۆشیاریی: بزاڤی(حرکي) و سیاسی‌یە.

رێگای چونە ناو دەرون لەلایەن شەیتانەوەو بەتایبەتی بۆ ناو دەرونی ئەوانەی بەهرەدارن فیتنەی ((خۆویستنە))، فیتنەی (من). کاتـێ مـرۆڤ لـە ریـزدا سـەرباز دەبێت لە تەڵەکەی شەیتان دورترە، لـەو کاتـەی بـەهرەکانی خـۆی دەردەخـات و پلەوپایەیەکی تایبەتی‌دەبێت، ئا لێرەد شـەیتان هـەلێکی گـەورە دەدۆزێتـەوە بـۆ گومڕایی و لەڕێلادان! هەتا مرۆڤ دەرکەوتوتر بێت! هەوڵی شەیتان بۆ لەڕێلادان و گومڕاکردنی زیاتر دەبێت!

مرۆڤ کە ئامادە دەبێت بۆ پلەی سەرکردایەتی، یا پلەی سەرۆکایەتی، ئا لەوکاتەدا فیتنە لەوپەڕی دایە.. جا لێرەدا کارەکە لە زۆر دەرونـدا دەشێوێ، ئەگەر پەروەردە نەکرابێت لەسەر خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوا، لەنێوان بانگەوازیی و لەنێوان ((من– أنا))ی هەڵساو بەو باونگەوازە.

من نوێنەری بانگەوازەکەم! من ئەو کەسەم سیفەتی خوازراوی سەرکردایەتیم تێدایە! کەواتە چی توشی من بێت؛ توشی بانگەوازەکەش دەبێت! هەرچی ئاسودەم بکات و دەرونم بۆی ئاسودە بێت، لە بەرژەوەندی بانگەوازەکەدایە! بەو شێوەیە شەیتان دەچێتە ناو دڵ و دەرونەوە، وامان لێدەکات ببینە بنکەی بایەخدان و بنکەی جوڵەکردنمان.

بەڕاستی فڵانەکەس لەڕێما دەوەستێ، دژایەتیم دەکات، یان بەرهەڵستیم دەکات، یان دەرونم لێی مورتاح نیە.. کەواتە بوونی لەبەرژەوەندی بانگەوازیدا نیە، بەڵکو ترسی دەبێت بۆ بانگەوازەکە! دەبێ لە سنوری خۆیدا بوەستێنرێت! دەبێ بەری بگیرێت! ئەگەر باشتر نەبو لە کۆمەڵ دەربکرێ بۆ ئەوەی بانگەوازەکە بەڕێی ڕاستی خۆیدا بڕوات، واتە ئەو ڕێگایەی عیزەت و پلە و دەسەڵاتی منی تێدا بێت.

ئەوە دەردێکە لە توندترین دەردەکانی کاری ئیسلامی، دەردێکە لە جیهادی ئەفغانیدا بووە هۆی بەهەدەر ڕشتنی خوێنی ملیۆن و نیوێك شەهید، بووە هۆی گاڵتەجاڕی شتە ڕێزدارەکانی نەتەوە و لەناوچوونی هیوایەك، کە هەموو موسڵمانانی لەسەر زەوی پێوە بەسترابوو! تا ئێستاش توشی هەندێ کۆمەڵ دەبێت لە جیابونەوەو بەحیزب بون و دوژمنایەتی و دژایەتی، دژایەتی توند پێچەوانەی ڕێبیر(مبدأ)ەکان، یان پلان یا شێوازەکانە.

کاتێ بۆ خوا خۆمان یەکلا دەکەینەوە بەرگەی رەخنە دەگرین، جا ئەو رەخنەیەی چ لە خۆمان بێت، یان لە بیرۆکەکانمان بێت، یا لەبەر ڕەفتارەکانمان..

نمونەیەك لەو کۆمەڵە دێنینەوە؛ کە گەیشتبونە لوتکە، نەك لەبەر ئەوەی بیروباوەڕمان وابێت، کە بتوانرێت لەم سەردەمەی ئێمەدا بەدی بهێنرێت! بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی ببینین، یەکلابونەوە بۆ خوا چی لە دەرونی مرۆڤ دەکات و،

بەرزیان دەکاتەوە بۆ ئەو لوتکە بەرزە، کـە لـەکاتێکدا هێشـتا مرۆڤـن و نەبونەتـە فریشتە، لە هیچیان پێشبینی ناکرێت ببنە فریشتە!

عومەرﷺ چووە سەر دوانگە و وتی: ئەی خەڵکینە گوێبگرن و بەرفەرمان بن!

سەلمانی فارسیﷺ وتـی: ئـەمڕۆ نـە گوێت لێدەگرین و نـە بەرفـەرمانت دەبین! عومەر وتی: بۆچی؟ وتی: هەتا بۆمان ڕون نەکەیتـەوە ئـەو کراسـە خـەت خەتـەت لەکوێبوو، کە لەبەرت کردوە، تۆ پیاوێکی درێژی، کراسێك بەشت ناکات وەك ئەو کراسەی بەر موسڵمانەکان کەوتوە! عومەر، (عبـدالله)ی کـوڕی بـانگ کـرد و پێـی وت: تۆبی خودا! ئەو کراسەی لەبەرم کردوە کراسـی تـۆ نیـە؟ (عبـدالله)ﷺ وتـی: بەڵێ کراسەکەی منە، داومە پێت، بۆ ئـەوەی بیکەیتـە بـەرکۆش، چونکـە ئـەوەی وەك موسڵمانەکان بەرت کەوتووە بەشت ناکات، چونکـە تـۆ پیـاوێکی درێژیـت! سەلمانیش دەڵێت: ئێستا فەرمان بکە گوێدەگرین و بەرفەرمانتین.

ئا ئەوە عومەر بوو ئەمیری هەموو بڕوادارەکانە! نەك ئەمیری کۆمەڵێك بێت لە کۆمەڵە ئیسلامیەکان!

دەبێ چەند ئەمیر لە ئەمیری کۆمەڵە ئیسلامیەکان هـەبێ، دان بـەخۆیدا بگـرێ لە بەرامبەر ڕەخنەی یـەکێ لـە شـوێنکەوتوەکانی؟ چـەند ئـەمیر دەگەڕێتـەوە بـۆ هەق، کاتێ یەکێ لە براکانی، کە بۆ خوا بونە برای، ڕەخنەیەکی لێبگرێت، چ جای ئەوەی سەربازێك لە سەربازەکانی ڕەخنەی لێ بگرێت؟!

کاتـێ خۆمـان بـۆ خـوا یـەکلا دەکەینـەوە، خـودی خۆمـان نابێتـە تـەوەرەی بایەخدانمان و تەوەرەی بزوتنمان، هەست بە غیرەت ناکەین، کاتێ جگە لەخۆمان پلەی بەرز بێتەوە، کاتێ لە لێهاتوویی پلەی بەرز دەبێتەوە، پێمان ناخۆش نابێت خەڵك بەدەوریا کۆببنەوە خۆشـیان بوێـت، بـە کـەمی پایـەی خۆمـان نـازانین، یـا کـارێکی دوژمنکـاری بێـت دژمـان، پاڵمـان نـانێت هـەوڵ بدەیـن لەبـەردەم شـوێنکەوتوانمان بەکـەم دایبنێـین تـا (وەلائیـان) لـە ئێمـەوە نـەگوڕێت بـۆ ئـەو ((مونافیسە))ی، کە خەڵك لە دەوری کۆبونەتەوە!

کاتێ بۆ خوا یەکلابوینەوە، وەلائمان بۆ خۆمـان، یـان کۆمەڵەکـەمان نـابێت — باشتر وایە بڵێین: ((حیزبەکەمان))— ئەوە سەنگی مەحەکە لەسەر شیاوێتی خەڵك

و لێهاتووییان، بەڵکو دەبێ مەحەك مەحـەكی خوایـی بێـت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ: بەڕێزترینتان لای خـودا پارێزگارترەكانتـانن، خوا زانایە و ئاگادارە.﴾الحجرات:١٣.. شـێوازی حوكم كردنـی خـەڵك دەبێ ئـەو شێوازە بێت، كـە خـوا فـەرماني پێداوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ: ئـەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان! بـە یەكسانی و بێجیـاوازی–بە كـاری مـەردم ڕابگـەن– و بـۆ خوداش شایەتی بدەن؛ هەرچەندە شایەتی دانتان بە زیانی خۆتان و دایك و بابتان و خزمانیشتان بێ﴾النساء:١٣٥.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بۆ خوا ڕاسـت و بێخـەوش بـن بـە هەقانـەت شـایەتی بدەن، دوژمنی و قینی دەستەییێك هەڵتان نـەنێ بـە هەقانـەت ڕەفتـار نەكـەن. بـە یەكسانی و بێ جیاوازی لەگەڵ خەڵكدا ڕەفتار بكەن، دەبێتە هۆی پتر نزیـك بـوون لە پارێزكاری.﴾المائدة:٨.

كاتـێ وەكـو پێویسـت خۆمـان بۆ خـوا یـەكلا نـەكردەوە، ئـەوا لـە واقیعـی ئێستاماندا زۆر شت ڕودەدات لەوانەی ڕویداوە!

* * *

كـاری دووەم كـە دەمانـەوێت تـەركیزی بكەینـە سـەر هۆشـیارییە! ئـەو ڕۆشنبینیەیە، كە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی هاتووە:

﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ: بێژە: ئەمە ڕێگای منە، هەم خۆم و هەم ئەو كەسانەی شوێنم كەوتون–بە ڕۆشنبینی– بۆ خواناسی، بانگەواز دەكەم، خواش هەمیشە پاكە و تاكە و لەوانە نیم كە شەریكی بۆ پەیداكەم.﴾یوسف:١٠٨.

ڕۆشنبیڕی بۆ بنکەی پتەو پێویستە و بـێ ئـەو نابـێ، چونکـە ئـەو ڕۆشـنبیرنیە بڕیاری ڕێڕەوی کاری ئیسلامی دەدات، کەی بچینە بۆسەوە؟ کەی بجولێین؟ چۆن بجولێین؟ لەگەڵ دەسەلاتداران تێك بگـیرێین، یـان هودنـەی لەگـەڵدا بکـەین؟ یـان پەیمانی لەگەڵدا ببەستین؟ بە دروستکردنی بنکـە(قـاعدة) دەسـت پـێبکـەین، یـان ڕوبکەینە جەماوەر؟ کاتێ ڕو دەکەینە جـەماوەر چیـان پـێ بلێـین؟ ئایـا ((کێشـە گشتیەکان)) بە هەلێك بەکاربـهێنین، کێشـەی نـان و بێکـاری و نـرخ بـەرزی، یـان تـەرکیز بکەینـە سـەر کێشـەکانی پـەروەردە و کێشـەی عـەقیدە؟ ئایـا هێزمـان دەربخـەین لەبـەردەم دوژمنـەکانماندا، یـان ڕومـان لێ وەرگـێڕین؟ بـەڕونی دوژمنـەکانمان کێـن؟ ئایـا ئەوانـەی لـە نـاوخۆ دژایـەتیمان دەکـەن، یـان نـەفامی جیهانیە بە فراوانیەکەیـەوە: جولەکـە و دیـان و هاوبەشـدانەرەکان و دووڕوەکـانی هەموو سەر زەوین؟ ئەمەو دەیەها و سەدەها پرسیار، کە دەبێ هۆشیاری سیاسی و حـەرەکی هـەر تێدا بێت، هـەروا ڕۆشـنبیینی لەگـەڵدا بێـت بـۆ ئـەوەی -بـەپێی تواناامان- هەوڵ بدەین وێنـەی پلانێکـی سـاغ و دروسـتی حـەرەکی بکێشـین، کـە چاکترین ئەنجام بەدی بهێنێت لە ڕەوش(ظروف)ی چواردەوریدا.

با لەسەرتاوە بزانین، ئامانجی پلانی دروسـت(سـلیم)، پاراسـتنی کەسـەکانمان نیە لە ئازاردان، چونکـە بـە هـەرحاڵ جاهیلیـەت واز لـە ئـازاردان ناهێنـێ، لەسـەر بانگەوازی (لا اله الا الله)ش خۆی پێ ناگیرێ!

بەڵکو ئێمە هەوڵ دەدەین لە میانەی ڕەفتارەکانماندا بانگەوازیی ئازار نەدرێ و زیانی پێ نەکەوێ!

با لە سەرەتاوە بزانین، ئامانج لە پلانی دروست، گەیشتن بە دەسەلات نیە، یـا گەیشـتن بـە شـتێك لـە دەسـەلات بـە تـەنازولکردن لـە مەبدەئـەکانمان و بەهاکان(قیم)مان، کە بەشێکن لە ئاینمان و لـە بیروباوەڕمـان بـە بیـانوی (لەگـەڵ بارودۆخ ڕۆیشتن)، یان ئەوە لە بەرژەوەندی بانگەوازەکەدایە!

با لە سەرەتا و کۆتاییەوە بزانین، خوا یاسا و ڕێوشوێنی هەیە، کە ناگۆڕێت و موجامەلەی ناکرێت، ئەگەر خۆمان لێی بێئاگا کرد، یا وا هات بە دڵمانا دەتوانـین تێیپەڕێنین، لە بزوتنەوەکەمان ناگەینە هیچ!

ڕۆشنبینی(بصیرة) بەشێکی هەیە، کە بە فێربوون بەدەست دێت، واتە ناسینی یاسا و دەستورەکانی خوایی لە کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و، مێژوو زانین و پەند وەرگرتن لێی.. هەروا ناسینی حاڵی ئوممەتی ئێستا و ئەو هۆیانەی بووەتە هۆی ئەو واقیعەی لەم کاتەدا نەتەوەکەی تێدا دەژی.. هەروا زانینی پلانەکانی دوژمن و ئەو ڕێگایانەی دەیگرنەبەر بۆ بەرەنگاریکردنی ئیسلام و هەوڵدان بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی ئیسلامیی.

هەروەها بەشێکی هەیە بە شارەزایی لەو ئەزمونانە بەدەست دێن، کە بزوتنەوەکەی پێدا دەڕوات و، لەو ئەنجامانەی لەهەموو بزوتنەوەیەك دێتە کایەوە.

هەروەها بەشێکی تریشی هەیە بە پەروەردە بەدەست دێت، کە لەڕێگای ڕاوێژی نێوان سەرکردە و یارمەتیدەرەکانی ئەنجام دەدرێت، کە ڕایەکانی تێیدا لەکەو دەدرێن و دید و بۆچونەکان ڕون دەکرێنەوە، نەك ئەو ڕاوێژەی هەر شکڵییە و لەنێوان ژمارەیەك پیاوی دیاریکراو ئەنجام دەدرێ، لەنێوان فشاری گوێڕایەڵی و بەرفەرمانی(السمع والطاعة) و هەڕەشەکردنی دەرچوون لە کۆمەڵ لەو کەسانەی، کە ڕەخنەیان لێ دوبارە دەبێتەوە!

کاتێ ئەو ڕۆشنبینیە نەبێت، یان کەم و کوڕی هەبێت، بێسەروبەری زۆر دەبێت، وەك ئەوەی لە واقیعی ئێستاماندا ڕودەدا!

* * *

ئەوانە هەندێ سیفەتی پێویست بوون بۆ دروستکردنی بنکە(قاعدە)، جا ئایا ئێمە بەڕاستی هەموویمان تەواو کردووە؟

پێویستە لەسەرەتاوە لە هەستماندا هەبێت، کە ئێمە ئامانجمان تەنها پێکهێنانی کۆمەڵێك نیە بڕوای بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت و دروشمە خواپەرستیەکان لەسەر شێوەیەك لە شێوەکان ببات بەڕێوە، پاشان هەڵسێ بە بانگەوازیکردن، هەرچەندە ئەوە کارێکی چاکە لەخۆیدا، لەڕۆژی دواییدا گەر خوا ویستی پاداشتی لەسەرە، بەڵام ئەمە ئەوە نیە، کە ئوممەتی ئیسلامی ڕزگار بکات لەوەی تێی کەوتووە، هەروا ئەوە نیە ئەو نمونەیە دروست بکات، کە نەفامیی لەوەی تێیدایەتی، بگۆڕێت!

داواکراوی ڕاستەقینە لەکاری ئیسلامی بەدیاریکراوی ئەوەیە؛ کە نەتەوەی ئیسلامی ڕزگار بکرێت لەوەی تێی کەوتووە، هەوڵدان بۆ گۆڕینی نەفامیی لەوەی تێیدایە!

ئەو ئامانجەش بە دروستکردنی کۆمەڵێك نەبێت نایەتە دی، کە لە سەر ئاستێکی بەرز بن، لەسەر ئەو شێوەیەی، کە کۆمەڵەی یەکەم پێی هەڵسابوو لەسەر دەستی پەروەردیاری گەورەﷺ، ئەگەر لەسەر ئەو ئاستەشدا نەبێت، کە هیچ نەوەیەك لە نەوەکان پێی ناگەن.

ئەوە پێویست دەکات دەست بە دروستکردنی بنکەیەکی پتەو بکرێت و پەروەردە بکرێت لەسەر بەرزترین ئاستی پەروەردەیی، کە بۆمان بلوێ، هەروا پاك کردنەوەی لە خڵت و خاڵ بەوپەڕی هۆیەکانی پاکژی، کە بۆمان دەلوێ، پاشان دوای ئەوە بانگەوازی جەماوەر بکرێت.

هۆ(وسیلە)کانمان لە پەروەردەکردندا، هەر ئەو هۆیانەن، کە پەروەردیاری گەورەﷺ بەکاری هێنا بۆ قوڵکردنەوەی بڕوا بەخوا و ڕۆژی دوایی، قوڵکردنەوەی پەیوەندی بەخواوە، ڕاهێنانی دەرون لەسەر ژیان لەگەڵ خوادا، مەشق کردن لەسەر بەکارهێنانی ڕەفتاری ئیمانی لە جیهانی واقیعدا.. پاشان قوڵکردنەوەی هۆشیاریی، بەو هۆیانەی دەبنە هۆی قوڵکردنەوەی، کە لەلامان چەسپاو بێ، کە پێشەنگ(قدوە) هۆ(وسیلە)ی یەکەمە و -گەورە-یە لەکاری پەروەردەکردندا، پاشان وانە و ئامۆژگاری دوای ئەوانە دێن، لەگەڵ چاودێری و بەدواچون و کۆڵنەدان و ئارام گرتن، هەتا دەرونەکان بەدەمەوە دێن و پاشان ڕێك و ڕاست دەبن.

لەڕاستیدا کۆششێکی گەورەیە، ئەو کۆششە لەگەڵ ئەو گەورەییەدا لە شەو و ڕۆژێکدا بەرەکەی نادات، ناتوانرێت پەلەشی لێبکرێت، ناتوانرێت بەسەریدا تێپەڕین؛ ئەگەر ئێمە بەڕاستمان بێت بە کارێك هەڵسین، کە ئوممەت ڕزگار بکات لەوەی تێیدایە، هەروا هەوڵ بدات بۆ گۆڕینی نەفامێتی لەوەی تێدایەتی!

# فراوانكردنی بنكه

لەقۆناغێك لە قۆناغـەكانی كـارواندا، ڕۆڵـی فراوانكردنـی بنكـە دێـت لـە ڕێگـای بانگەوازیكردنی جـەماوەردا، ئـەم قۆناغـە لـەژیانی كۆمـەڵی یەكـەمدا دەنوێنرێت، كۆمەڵی پێغەمبەرﷺ، كە خەڵكی مەدینە و ئەو عەرەبانەی دەوری مەدینە بـوو كـە چونـە نـاو ئیسـلامەوە، دوای ئـەوەی بنكـە پتەوەكـە لەلایـەن كـۆچ كـەرەكان و یارمەتیدەرەكانﷺ بنیات نرا، ئەوانەی خـوا دەربارەیـان فەرمویـەتی: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ: مەدینـەیی و ئـەو عارەبـە دەشـتەكیانەی لـە دەوریـانن، نەدەبوایـە پێغەمبـەری خودایـان وەلا بنایـە و خۆیـان لـەو هەڵاواردایە.﴾التوبة: ١٢٠.

ئەوانە سەرباز و یارمەتیدەر بوون، بانگەوازەكە ڕایكێشـابوون و چونـە نـاوی و بۆی دڵسۆز بوون و خۆیـان كردبـووە سـەرباز بـۆ بـەرگریكردنی لـە دوژمنـەكانی، ئەوانە جـەماوەرێكی بـێ ڕێكخـەر نەبون، وەك ئەوانـەی نـەفامی سـەردەم پێیـان دەڵێن (رجل الشارع: پیاوی سەرجادە)، بەراستی ئـەوە ناونـانێكی ڕاستە، نـازانم لەخۆیەوە هـاتوە یـان بـە مەبەسـت بـووە! جـا پیاوی جـادە ئـەو مرۆڤەیـە، كـە مەبەستێكی دیاریكراو و هەڵوێستێكی دیاریكراوی نیە و ڕوانگەیەكی بیری نـەگۆڕی نیـە! یـان ئـەو كەسـەیە، كـە ڕای لەگـەڵ هـەموو كەسـە، كـە پێغەمبـەرﷺ باسـی كردووە، كە فەرموویەتی:

((لا تَكُونُوا إِمَّعَةً، تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ أَسَاءُوا أَسَأْنَا! وَلَكِــنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنَ النَّاس أَوْ أَسَاءُوا أَلاَّ تَظْلِمُوا: لەگـەڵ هەمووكەسدا مـەبن، بڵێن: ئەگـەر خـەڵك چاكـەی كـرد ئێمـەش چاكـە دەكـەین، ئەگـەر خراپـەیان كـرد ئێمەش خراپە دەكەین، بەڵام خۆتان ئامادە بكەن، خەڵك چاكە بكات یا خراپـە،

ستەم لە یەك مەكەن.))[1].. ئەو جۆرە كەسانە ئەوانەن كە هۆكانی ڕاگەیاندن دروستیان دەكەن و، لەسەریان ڕادێن، كاتێ لێیا بپرسیت هەڵوێستتان چیە؟ سەیر دەكەیت هەڵوێستەكەیان ئەو شتەیە، كە هۆكانی ڕاگەیاندن دەیانەوێت![2]

ئەو جۆرە كەسانە لەو پیاوانە نین، كە لە قۆناغی یەكەمی دروستكردنی بنكەدا، بنكەكەیان پێ فراوان كرا، بەڵكو لەهیچ قۆناغێك لە قۆناغەكانیدا نەبوون! بەڵكو بە سەربازی دڵسۆز فراوان كرا، ئەو سەربازانەی خۆیان دەبەخشنە بانگەوازەكە، بە ئاراستەی دڵسۆزانە بۆ خوا بەرگریان لێ دەكرد.

جا ئەگەر كەسێك بپرسێت: كەواتە جیاوازی چیە لەنێوان ئەمانەدا و لەنێوان بنكە پتەوەكەی لەوەوپێش باسمان كرد؟ بەكورتی دەڵێین: بنكە پتەوەكە ئەوە بوو، كە ئامادەكرابوو ببێتە كۆڵەگە و پایە بۆ ئایینەكەی، لەبەر ئەوە ئەو بنكەیە سەركردە بوو، ئاراستەكار بوو، پەروەردیار بوو، بەڵام ئەمانە ئەوانەن بانگەوازكراون، كە هاتون بەدەم بانگەوازەكەوە و دەستیان پێوەگرتوە و لەژێر بەیداخەكەیدا پاڵیان داوە بە یەكەوە، بون بە یەكێ لە بانگەوازەكە، لەگەڵ بانگەوازەكەدا دەبزوێن و بەهۆیەوە دەبزوێن، چاوەڕوان ناكەن بزانن كێ سەركەوتووە، تا دوای بكەون!

ئەگەر كەسێك جارێكی تر بپرسێت: چ جیاوازییەك لە بەرنامەی پەروەردە هەیە لەگەڵ چاودێری كردن و گرنگیدان و ئامادەكردنی بنكەپتەوەكە و، ئامادەكردنی ئەوانەی لەو قۆناغەدا بنكەكەیان پێ فراوان كرا؟ بەكورتی دەڵێین: جیاوازی لە پلەدا هەیە نەك لە جۆردا، مامۆستا زانستەكەی ئاراستەی هەمو فێرخوازان دەكات، بەڵام سەركەوتووەكان بە چاودێری تایبەتی تایبەت دەكات، چونكە ئامادەبونیان زۆرتر تێدایە و داوای زۆرتریان لێدەكرێت، ئەوەی لە خوێنەرێكی ئاسایی قبوڵ دەكرێت، لەوان قبوڵ ناكرێت، كە ئامادەبونەكەی لە ئاستێكی دیاریكراودایە و لەتوانای خۆی بەدەر داوای لێناكرێت، هەرچەندە دەرچوون(نجاح)

---

١ رواه الترمذي.

٢ ئەو هۆیانەی زۆر كاریگەرن ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە، هەموویان بەكاردەهێنرێت بۆ داڕشتنی عەقڵیەتی (پیاوی جادە) و ڕێنماییە گرنكەكانی.

لەهەموان دەخوازرێت، جا هەر کەس بەپێی پلەی خۆی.

جا ئەگەر کەسێك وتی: ئایا سنورێکی جیاکەرەوە هەیە ئەمانە لەوانە جیابکاتەوە؟ ئایا لە بنکە فراوانکراوەکەدا نابێت کەسانێك هەبن تواناکانی و ئامادەکاریەکانی وای لێکات ببێت بە سەرکردەی ئاراستەکار؟ یان لەناو بنکە پتەوەکەدا کەسانێك هەبن تواناکانی و ئامادەکاریەکانی ڕێیان گرتووە نایەڵن هەڵسێت بە ئەرکەکانی؟

دەڵێین: بەڵێ! دەکرێ ئەوە ڕووبدات، ئەوکاتە خاوەن بەهرەکان بۆ پلەی سەرکردەی بانگخوازی پەروەردەکەر بەرز دەبێتەوە، یان پێویستە بەرزبێتەوە، ئەو کەسە دوادەکەوێت، کە تواناکانی دایدەنیشێنن و تەنها دەبێتە ئەندامێکی ئاسایی. ئەوە مەسەلەیەکە لێپرسراوانی کارەکە بە ئیجتهادی خۆیان دایدەنێن، جاری وا دەبێت ئیجتهادەکە هەڵە دەکات و جاری واش دەبێت ڕاستی دەپێکێ.. بەڵکو وەك مەبدەء گرنگ ئەوەیە بۆ دروستکردنی بنکە پتەوەکە، پێویستە ئەوپەڕی هەوڵی بۆ بدرێت، گەورەترین چاودێری و بایەخی پێ بدرێت، جا دامەزراندنی ئەستوندە سەرەکیەکان بێگومان جیاوازن لە دامەزراندنی ئەو خشتانەی بیناکەی لێ دروست دەکرێت، هەرچەندە ئەمیش و ئەویش پێویستن بۆ دروستکردنی بیناکە، ئەوە لەسەرەتاوە کارێکە پێویست بە ڕونکردنەوە ناکات.

بەڕاستی لێرە دەمانەوێت تەرکیز بکەینە سەر کارێك که گرنگی خۆی هەیە: ئەویش ئەوەیە فراوانکردنی بنکەکە بە یارمەتیدەرانی پابەند(ملتزم)، ئەوانەی خۆیان وا دادەنێن سەربازی بانگەوازەکەن، دوای دروستبوونی بنکەپتەوەکە دێت، چونکە ئەوانەی بانگەوازەکەیان پێدەگات لەسەرەتاوە پێویستیان بە ئاراستەکاران هەیە! جا ئەگەر بانگمان کردن و هاتن و ئێمە هێشتا ئاراستەکارانمان ئامادە نەکردبێت! ئەدی کێ ئاراستەیان بکات؟!

هەروەها کارێکی تر هەیە دەمانەوێ خەڵکی لەسەر ئاگادار بکەینەوە: ئەویش ئەوەیە، که هۆیە سەرەتاییەکانمان بۆ فراوانکردنی بنکەکە -کاتێ ڕۆڵی دێت- بانگەوازێکی گشتییە، کە بەرەو ڕوی هەموو خەڵك دەکرێت، ئەوانەی بەزمانی سەردەم پێی دەوترێت ((جەماوەر)). بەڵام جەماوەر لەڕووی بەدەمەوەهاتنی

بانگەوازیی لەسەر یەك پلە نین.. بەڵکو لە ناو ئەو جەماوەرەدا کۆمەڵێك هەن - کاتێ بانگەوازەکەی بەڕونی و ڕۆشنی لەسەر شێوە ڕاستەکەی خۆی پێ دەگات- بڕوای پێ دەهێنێ بەراستی خۆیان دەکەنە سەربازی ڕێگاکەی لەبەر ڕەزامەندی خوا.. هەروەها لەناو ئەو جەماوەرەدا کۆمەڵێکیش هەن حسابی ((بەرژەوەندی)) و حسابی قازانج و زیان دەکەن.. دەڵێن ئایا ئێمە کاتێ بچین بەدەم بانگەوازەکەوە چی بەدەست دێنین و لە پێناویدا چمان لەدەست دەچێت.. هەروەها کۆمەڵێکیشی تێدایە تەنها ئەوەی لا گرنگە بزانێت کێ بڕیاری سەرکەوتنی بۆ دەدرێت بۆ ئەوەی شوێنی بکەوێت، ئەم جۆرانە دوورەپەرێز دەوەستن پاڵ نادەن بە هیچ لایەکەوە، بەڵکو چاوەڕوانی دەکەن و شوێن هەواڵی جەنگ دەکەون هەتا بڕیاری سەرکەوتن بە روونی بۆ یەکێ لە دوو لایەنەکە دەدرێت، ئنجا لایەنگری سەرکەوتوەکە دەکەن، نەك لەبەر ئەوەی بڕوایان بە ڕێبیر(مبدأ)ەکەی هەیە، نەك پەرۆشی ڕاستەقینەن بۆی، بەڵکو لەبەر قورسایی ئەو کارە کە لە هەستیاندایە. ئەو کۆمەڵە بە پێکهاتە دەرونیەکەیەوە، هەمیشە ئامادەن بۆ ئەمری واقیع ملکەچ بن، ئەو ئەمرە واقیعەی لە هەستیاندا پانتاییەکی گرتووە گەورەتر لەو کارەی هێشتا روی نەداوە، کە پێویستی بە هەوڵ هەیە بۆ ئەوەی بێتە دی، بەڵام واقیع بەکردەوە پێویستی بە هەوڵ نیە بۆ بەڕێوەبردنی. ئەو پێڕە بە پێکهاتە دەروونیەکەیەوە، ئامادەی کۆشش کردن نیە، بە تایبەتی ئەگەر کارەکە بەرەو ڕوی مەترسی بکاتەوە، لەبەر ئەوە بەدەنگ بانگەوازەکەوە ناچێت هەتا سەرکەوتنی دەبێتە ((ئەمری واقیع))، کە بەڕێوەچوونی پێویستی بەهیچ هەوڵێك نابێت و توشی مەترسی نابێت.

ئەو کۆمەڵانە بە هەرسێ جۆرەکەیەوە، لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە، تەنانەت لە کۆمەڵگاکەی پێغەمبەریشدا هەبوو.

کۆمەڵگای مەدینە نمونەی کۆمەڵی یەکەم بوو، کە بەڕاستی بڕوای هێنابوو و خۆی کردبوە سەربازی بانگەوازەکە، کە بنکە پتەوەکە ڕێنماییکەر و سەرمەشق بوو، کە پێکهاتبوو لە کۆچ کەر و پشتیوانان (المهاجرین والأنصار)، ئەو کۆمەڵەیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ

ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ: خوا لەوانەی هەر لە پێشوو ئاوارەبون و لەوانەش کە یاریدەر بوون. لەوانەش کە لەچاکەدا دایانە سەر شوێن پێی ئەوان، رازی بوە و ئەوانیش لەخوا رازین و باغاتێکی بۆ سازداون جۆباریان بەبەردا دەڕوا و تا هەتایە تێیدا دەبن و ئەمەیە دەسکەوتی گرینگ.﴾التوبة:١٠٠.

هەروەها ئەو عەرەبە دەشتەکیانەش دەگرێتەوە، کە بەراستی بڕوایان هێنابوو، ئەوانەی ئایەتەکەی پێشوو ئاماژەی بۆ کردووە:

﴿وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَـٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ: هەر لەناو ئەو دەشتەکیانەش نیوا هەیە بڕوای بە خوا و بە رۆژی قیامەت هەیە و هەرچی لەم رێیەدا دەیدا بۆ نزیکی لە خودایە و بۆ ئەمەیە کە پێغەمبەر بە نزا لەبیریان نەکا، با بزانن کە بەم زوانە نزیك دەبنەوە لە خودا و دەیانخاتە بەر بەزەیی خۆی. خودا دیارە گوناه بەخش و دلۆڤانە.﴾التوبة:٩٩.

کۆمەڵی دووەمیش ئەوانەبوون، کە پێغەمبەرﷺ بە بەخشش و شت پێدان و نزیك کردنەوە لە خۆی دڵی ڕاگرتبون، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ کردوە:

﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ: زەکات هەر دەبێ بدرێتە هەژاران و کەم دەستان و ئەو کەسانەی پێ‌ڕادەگەن، بەختیش بکرێ بۆ هۆگری نەیاران.﴾التوبة:٦٠.

بەلام کۆمەڵی سێیەم لە موسلمانەکانی فەتحدا خۆی دەنوێنێ، ئەوانەی کاتێ لە فەتحی مەککەدا بڕیاردرا ئیسلام سەرکەوتووە موسلمان بوون، لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی هەق لەگەڵ پێغەمبەردایە، بەلام دەیانوت –وەك قورئان لێیانەوە

دەگێڕێتـــــــەوە-: ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ: دەڵێن: ئەگەر لەگەڵ تۆ بین و پەیڕەوی دینەکەی تۆ بین، لە زێدی خۆمان دەرمان دەکەن.﴾القصص:٥٧.

کاتێ ئیسلام لە زەویدا بەدەسەڵات بوو، شوێنی کەوتن و پۆل پـۆل چونە نـاو ئایینی خوا وەك لە سورەتی (النصر)دا هاتووە: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا: هەرکاتێ یارمەتی خودا گەیشتە ئێـوە و سەرکەوتن خەڵکیشت دی کۆمەڵ کۆمـەڵ دێنـە نـاو دینـی خـواوە، هـەر تـاریف و شـوکری پـەروەردگارت بکـە و دوای لێبوردنـی لێبکـە، ئـەم هەمیشـە پـەژیوانی پەژیوانان قبوڵ دەکا.﴾النصر ١-٣.

ئەوەش بەپێچەوانەی دووڕووەکانەوەیە، کە کاتێ دەسەڵات خۆی گرت خۆیـان دەردەخست، ئەوانەی پێش ئەوە سەیرکەر بوون، بەڵام لەسەر کارەکە بە ڕق بون و حەزیان نەدەکرد بێنە ناویەوە، یا لەو نەیارانە بوون، کە نەیاندەوێرا بـە ئاشکرا بەرەنگاری ببن، جا لە ترسا دووڕوویيان دەکرد.

ئەگەر ئەوە کۆمەڵەکانی ناو کۆمەڵگا بووبێت -هـەموو کۆمـەڵگا- لـە قۆنـاغی یەکەمی فراوانکردنـی بنکەکـەدا، ڕوی بانگـەوازیی بکەینـە کـام کۆمەڵـەیان؟ ئێمـە بانگەوازەکـە بـەرەو ڕوی هـەموو خـەڵك دەکـەین، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا پێشـبینی بەدەنگەوە هاتن لە کۆمەڵێکی لە خەڵك دیاریکراو دەکەین، جا ئەو کاتە بەخەستی بانگـەوازیی دەکەینـە سـەری، یـان بڕوامـان وابێــت، کـە بـەرزی بانگەوازەکـە و جێگیربونی لەسـەر دەسـتی کۆمـەڵێکی دیـاریکراو لـە خـەڵك دەبێـت، ئەوکاتـەش بەخەستی بانگەوازیی دەکەین.

ئەگەر شوێن ڕێڕەوەکەی کۆمەڵی یەکەم بکەوین -کۆمەڵەکـەی پێغەمبـەرﷺ-

دەبینین بانگەوازەکە لەو کاتەوە فەرمان بە پێغەمبەرﷺ کرا بە ئاشکراکردنی[1] بەرەورووی هەموو خەڵك کراوە، بەڵام تەرکیزکردنەکە -دوای کۆچکردن- خرایە سەر خەڵکی مەدینە، ئەوانەی بە پەلە بەرەوپیری بانگەوازەکە هاتبوون و، پێغەمبەرﷺ هەڵسابوو بە پەروەردەکردنیان بە یارمەتی بنکە پتەوەکە لە کۆچکەران و پشتیوانان، کە خۆیان بوونە بانگخواز و ڕێنماییکەر، بوونە پەروەردەکار، بە سەرپەرشتی پەروەردیاری گەورەﷺ.

خەڵکی مەدینە ئەوانەبوون جیهادیان کرد و چەسپان و ئارامیان گرت لەسەر ئەرکەکانی جیهاد و ئەمان -لەگەڵ کۆچکەران و پشتیوانان- لە هەموو قۆناغەکانی داهاتودا پایەی ڕاستەقینە بوون بۆ بانگەوازەکە، بەڵام ڕووکردنە دوو تاقمەکەی تر دواخرا بۆ قۆناغی دوایی.. ئەوەش کارێکی مەنتیقی‌یە لەگەڵ ڕێڕەوی بانگەوازەکە و لەگەڵ ڕاستەقینەیی جەنگەکە و سروشتی ململانێ. بەڕاستی سروشتی ململانێی نێوان هەق و ناهەق کە دەبێ هەر ڕوبدات -شێوەی کارێکە لە شێوەی کاروباری خوا- لەو چرکەساتەی پیاوانێك بۆ حەق پەیدا دەبن، کە بڕوایان پێی دەبێت و کاردەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی و جێگیرکردنی لە زەویدا.

نەفامیی(الجاهلیة) -بەهەر شێوەیەك بێت- ناتوانێ لەسەر بانگەوازی هەق ئارام بگرێ، ناتوانێ ئاشتی لەگەڵ بکات، هەرچەندە بانگەوازەکە ڕوبەڕوی نەبێتەوە:

﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ۝٨٧ * قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ ئەگەر هێندێك لەئێوە بڕوای هێناوە بەو شتانەی کە منی پێ ڕاسپێراوە و هێندێکیشتان بڕوایان پێنەهێناوە؛ خۆڕابگرن

---

١ خوای گەورە بە پێغەمبەریﷺ ڕاگەیاند و فەرمووی: {فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ: هەر فەرمانێك بەتۆ دەدرێ، ئاشکرای کە و لە بتپەرستان وازبێنە.}الحجر:٩٤.

هـەتا خـودا بـۆ خـۆیَ لـە بەینی ئێمـــەدا داوەری کـا. خۆشـی چـاترین داوەرە. گرەگرەکانی هۆزیَ—کە لەخۆیان بایی بوبوون— گوتیان: شوعەیب! ئێمـە تـۆش و ئـەو کەسـانەی لەگـەڵ تـۆ باوەڕیـان هێنـاوە، لەشـاری خۆمـان دەردەکـەین، یـان دێنەوە سەر دینی ئێمە.﴾الأعراف:٨٧-٨٨.

بەو شێوەیە! نە ڕێـك کـەوتن هەیـە، نـە ئـارامگرتن، هـەتا خـوا حوکـم دەدات بەوەی خۆی دەیەوێت! بەڵکو دژایەتی و دەرکردن، ڕاوەدونـان و ئـازاردان هەیـە، جا لە قۆناغەکانی یەکەمی ئەو ململانێیەی، کە لـەنێوان هـەق و بـاتڵدا ڕوودەدات، کـێ وەڵامـی بانگەوازەکـە دەداتـەوە؟ ئایا ئەوانـە وەڵام دەدەنـەوە کـە بـەدوایَ بەرژەوەندی دونیـاییدا دەگـەڕێن و بـەپێی پێوانـەی ئـەو بەرژەوەندیانـە حیسـابی قـازانج و زەرەر دەکـەن؟ ئایا ئەوانـــە وەڵام دەدەنـــەوە کـــە بـــەپێی پێکهاتـــەی دەرونیـان بـۆ ئـەمری واقیـع ملکـەچن، ئەگـەر بشـزانن خراپـــەی تێدایـــە، بـــەهیچ شێوەیەك ڕوو ناکەنە ئەو کارەی پێویستە ڕوبـدات، ئەگـەر بشـزانن ئـەوە خـێرترە لەو واقیعەی تێیدا دەژین، چونکە بەدیهێنانی پێویسـتی بەکۆشـش هەیـە، ئـەوان حـەز ناکـەن کۆشـش بکـەن.. ئەگـەر ئـەو کـارە بیانخاتـــە مەترسـیەوە.. ئـەوان حەزناکەن بکەونە مەترسیەوە؟!

لە قۆناغەکانی یەکەمی ململانێدا ئەو کەسانە وەڵامی بانگەوازەکە دەدەنـەوە، کە بڕوایان بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت.. ئەوانەی قازانج و زیان بە تەرازویَ خوایی حساب دەکـەن، نـەك بـە تـەرازوی زەوی، کـە نـەفامی شـتی پیَدەکێشـێت و لـەو تەرازووە بـەولاوە تـەرازوی تـر نازانـیَ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ: ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بـە چەند بەڵگەی ئاشکراوە و وێڕای ئەوان، کتێب و هۆیَ هەڵسەنگاندنمان ناردەخوار، هەتا خەڵك بیَجیاوازیَ لەناو یەکا ڕەفتار بکەن.﴾الحديد:٢٥.

ئەو تەرازوەی دەڵێت: خۆشی دونیا کەمە و ڕۆژی دوایی چاکترە بۆ ئەوکەسەی لـــەخوا بترســـێت: ﴿قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا: بڵێ: ژیانی دونیایە کەم و کورتە و بۆ ئەوانەی کە ترسیان لەخوا

هەیە، ژیانی ئەولا زۆر باشترە و بەقەد داوی زراوی ناو دەنکە خورما، کەس ناهەقی لیٚ ناکریٚ.﴾النساء:٧٧.

ئەو ترازووەی دەڵێت: بەڕاستی چی لەسەر زەویدایە لە کەل و پەل و بەرژەوەندی و پەیوەندی؛ ناکاتە هاوتای خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد لە ڕیگای خوا: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ: بڵێ: ئەگەر باب و کوڕ و برا و ژن و خزمەکانتان و ئەو ماڵەی پەیداتان کردووەو کەل وپەلی بازرگانی-کە دەترسن لەبرەو کەویٚ- و خانوبەرەی رند و دڵخۆشکەرەی خۆتان، پیٚ بەخودا و پێغەمبەر و خەزاکردن لەڕێی خوادا گرینگترە؛ چاوەنۆڕین تا فەرمان لە خوداوە دیٚ. ئەوانەی لەڕیٚ لادەرن، خودا شارەزایان ناکا.﴾التوبة:٢٤.

ئەو تەرازووەی دەڵێت: ئەو کارە چاکانەی دەمێننەوە لە هەموو جوانی ژیانی دونیا: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا: ماڵ و منداڵ خشڵی ژینی دونیان و ئەو کارەچاکانەش کە دەمێننەوە، پاداشتەکەیان لەلای پەروەردگارتەوە هێژاترە و بێتریش جێگەی ئومێدن.﴾الكهف:٤٦.

ئەو تەرازووەی دەڵێت: بەڕاستی بازرگانی بەقازانج -ئەوەی رزگارکەرە لەسزای خوا- بڕوا بونە بەخوا و بە پێغەمبەرەکەی و جیهاد لە ڕیٚی خوادا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى

مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٍۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ۝ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٌ قَرِيبٌۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ بڵێم کە لە ئازارێکی بەژان ڕزگارتان کا؟ بڕوا بە خوا و بە پێغەمبەری ئەو بێنن و، بە دارایی و گیانی خۆتان لەڕای خودا تێبکۆشن؛ ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن، لەگوناهتان دەبورێ و دەتانباتە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوا و خانوی زۆر خۆش و خاوێنتان لە بەهەشتی هەمیشەییدا دەداتێ، ئەمە دەسکەوتی گەورەیە. شتی تریش -کە ئێوە حەزی لێ دەکەن- یاریدەدانێ لەخوداوە و سەرکەوتنێکی نزیکیش. ئەم مژدەیە بە بڕواداران بدە.﴾الصف: ١٠-١٣.

قۆناغەکانی یەکەمی بانگەوازیی، قۆناغی بەخشش و گیانفیداییە، لەبەر ئەوە ئەوانەی بۆ ناشێت، کە بەشوێن دەستکەوتی دنیاییدا دەگەڕێن، جا ماڵ بێت، سامان بێت، خۆشی هەستی بێت، یان پلەوپایە و دەرکەوتن و شوێنکەوتن و پشتیوانی بێت، ئەوانە ناشێن لە بنکەی پتەودا دامەزرێنەر بن و بنکەکەیان پێ فراوان نابێت، کاتێ وەختی فراوانکردنی بێت!

*　*　*

ئەگەر سەیری واقیعی ئێستامان بکەین پێویستە چەند کارێك بخەینە بیری خۆمان، جا چ سەبارەت بە بنکەی پتەو بێت، یا بنکە فراوانکراو بێت، بەڵکو هەتا سەبارەت بە جەماوەری فراوان کە لە کۆتاییدا بە گرۆگرۆ دەچنە ناوی، هەروەها ئەوانەش دەبێت ئیسلامەتیەکەیان بۆ ڕاست بکرێتەوە، بەبێ ڕێکخەر(ضابط) ولزیان لێنەهێنرێت، وەك نەفامیی سەردەم بە(پیاوی جادە)ی دەکات، کە کیانە ئادەمیەکەی لێ زەوت دەکات و لە هەمان کاتدا وای لێکردووە وابزانێت ئەو یەکێ لەو کۆڵەگانەیە، کە سیستەمەکەی لەسەر ڕادەوەستێت!

لە ئیسلامدا (پیاوی جادە) و (ژنی جادە) نیە، بەڵکو موسڵمانی پیاو و موسڵمانی ژن هەیە، هەموویان پابەند(ملتزم)ن -یا پێویستە پابەند بن- بە لایەنی کەمەوە بە کەمترین شێوە، کە وایان لێدەکات لە تەرازوی خوادا موسڵمان بن، ئەوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا؛ ئەرکی سەرشانی کاربەدەست(ولی الامر)ە، جا

هەرکەس لەخۆیەوە پابەندی هەبێت ئەوە وەفای کردوە بەرامبەر بەوەی، کە پێویستە لەسەری بیکات بەرامبەر پەروەردگاری، جا هەرکەس پابەندی نەبێت؛ ئەوا سوڵتان بەزۆر پابەندی دەکات، وەك ئیمامی عوسمان ﷺ وتویەتی: ((خوا ئەو کارانەی بە سوڵتان دەیکات بە قورئانی ناکات)).

پاشان هەموو خەڵك لەناو بواری بانگەوازەکەدان، بەڵام هەنگاو دوای هەنگاو، وەك لەگەڵ کۆمەڵی یەکەمدا کرا، بەپێی یاسا و دەستورەکانی پەروەردگار، کە دووبارە دەبنەوە، هەرکاتێك ڕەوش و پێویستیەکانی دووبارە بوونەوە.

* * *

ئەگەر سەیری واقیعی ئێستامان بکەین دەبینین نەتەوەکەمان -جگە لەوانەی پەروەردگارت ڕەحمی پێکردون- لەباری (کەف) دان ئەو بارەی پێغەمبەر ﷺ پێش چوارده سەدە وەسفی کردووە، کە فەرمویەتی: ((يُوشَكُ أن تَداعى عَلَيكُمُ الأُمَمُ كَما تَداعى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِها: خەریکە نەتەوەکان دەمتان تێبژەنن بتانخۆن، وەك خۆرە چۆن دەم ئەژەنێتە خواردنەکەی))، وتیان: ئەی نێرراوی خوا! ئایا ئەوە لەو کاتەدا لەبەر ژمارە کەمیمان دەبێت، فەرمووی: ((بَلْ أَنْتُم يَوْمَئِذٍ كَثِير، وَلَكِنَّكُم غُثاءٌ كَغُثاءِ السَّيل، وَلَيَنْزِعَنَّ اللهُ المَهَابَةَ مِنْ صُدُرِ أَعْدائِكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ فِي قُلُوبِكُم الوَهْن: ئەوکاتە ژمارەتان زۆرە، بەڵام وەك کەفی لافاو وان، خوا ترسی ئێوە لە دڵی دوژمنەکانتاندا دادەڕنێ و وەهن دەهاوێتە دڵی ئێوەوە))، وتیان ئەی نێرراوی خوا! وەهن چیە؟ فەرمووی: ((حُبُّ الدُّنْيا وَكَراهِيَةُ المَوْت: خۆشەویستی دونیا و ڕق بونەوە لە مردن)).[1]

ئەگەر ئەوە حاڵی ئەو ئوممەتە بێ، کە بانگەوازیی ئاڕاستە دەکرێت، جا چ بۆ دامەزراندنی بنکە پتەوەکە بێت، یا بۆ بنکە فراوانکراوەکە، یان بۆ خەڵك بەگشتی، ئەوا پێویستە ئەو هۆیانە بزانین، کە ئەم ئوممەتەی توشی ئەم ڕەوشە کردووە، هەروا بۆ ئەوەی چارەسەری چاکی بۆ دیاری بکەین. وەك پزیشك دەیکات کاتێ بانگ دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشێك، کە لەپێشەوە کاری پشکنینی بۆ دەکات بۆ ئەوەی ڕاستی نەخۆشیەکەی بزانێت، ئنجا دەرمانەکەی بۆ دیاری

١ أخرجه أحمد وأبوداود.

دەكات.

كەس وانەزانێ –لەسەرەتاوە– ئەو بنكە پتەوەی، كە ئەركی بانگەوازەكەی دەكەوێتە سەر، لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە و بێخەوشە! نا، ئەو بنكەیە بەشێكە لەم ئوممەتە، كە لە یەك ڕەوش(ظروف)دا توشی هەمان نەخۆشیەكانی دەبێت، بەلام ئەگەر پێغەمبەرﷺ فەرمویێتی: ((خِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا: باشترینتان لە جاهیلیەتدا، باشترینتانە لە ئیسلام، ئەگەر شارەزابن.))[1].. جا با بلێین: ئەوە لە جاهیلیەتدا جوزئی بووە، كە ئیبن تەیمیە وتویەتی: ئەوە لە زۆر ولاتی ئیسلامیدا هەیە، (پیاوانێكی هەلبژاردە) هەیە، دەكرێ بەو كۆششەی لە خودی خۆیاندا دەیدەن، ناوك بۆ بزوتنەوەكە پێك بهێنن، پاشان دەكرێ (هەلبژاردەیەكی) تر بە كۆششی پێویست، ئەو بنكە فراوانە پێك بێنن، كە لە دەوری ناوك(نواة) پێك دێت و چاوی لێ دەكات، پاشان دوای ئەوە ڕۆلی خەلك بەگشتی دێت، لەناو ئەوانیشدا پیاوی هەلبژاردە دەبێت، كە بە قەدەری خوا دێن بە دەنگ بانگەوازەكەوەو پابەند دەبن، ئی تریش بە سولتان دەبن بە پیاوی چاك و هەلبژاردە، ئەگەر قورئان نەیانگاتێ.

ئێستا با سەیری حال و باری ئەو نەوەیە بكەین، كە بانگەوازەكەی ئاراستە دەكرێت.. چی گەیاندویەتیە ئەو كەف(غثاء)ەی تێیدا دەژی، بۆ ئەوەی بۆمان دەركەوێت لە كوێوە دەست بە چارەسازی بكەین، هەروا بۆ ئەوەی بۆمان دەركەوێت هەنگاوە پێویستەكان بۆ چارەسەركردنی چین.

لەراستیدا لە ڕێڕەوی مێژوودا، ئوممەت توشی زۆر نەخۆشی بووە، هەندێكیان لەناوخۆوە پەیدا بووە، هەندێكیان لەلایەن دوژمنەوە هاتوون، زەحمەتیشە بە وردیی سەرژمێر بكرێت، بەلام پێمان وایە نەخۆشی دیار هەیە، كە چاوی پشكنەرەكەی هەلە ناكات.

لە دیارترین ئەو نەخۆشیانە؛ بیرۆكەی ئیرجائیە، كە دەلێت: بروا بە دل بروا كردن و بەزمان بڕیاردان، كردەوە ناچێتە ناو بڕواوە!

بڕوا بەدل و بڕیاردان بە زمان دوانی پێویستن بۆ چەسپاندنی بڕوا، كە جیاڕایی

---

[1] أخرجه البخاري.

لەسەر نیە، بەڵام کردەوە ناچێتە ناو ناوی بڕواوە، ئەوە بیدعەیەکی ترسناکە و لاڕێبونە لە حەقیقەتی ئەو ئایینەی، کە دانەمەزراوە –و نابێت دابمەزرێت– بەبێ کردەوە و کۆششی گەورە، کە لە واقیعی ئەم زەویەدا دەدرێت، هەروا ناکرێ نامۆییەکەی ئیسلام تەنها بە بەڕاست دانان و دان پیانان لابرێت، کە یەکەمجاریش تێیدابووە،[1] بەڵکو ناتوانرێت هیچ سیستەمێك لەسەر زەوی دابمەزرێت، چ جای چاکترینی هەموو سیستەمەکان، تەنها بەڕاست دانان و دان پیانان، ئەگەر کردەوەیەکی دیاریکراو نەکرێت بۆ گۆڕینی ئەو بەڕاستدانانی دڵیە و بڕیارە زمانیە بۆ واقیعی بینراو!

هۆکانی مێژوویی هەرچی بێت، کە بوەتە بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی ئیرجائی، بەڕاستی گەندەڵی گەورەی خستۆتە پێکهاتەی ئوممەتەوە، چونکە لەو کاتەوە ئەو بیرۆکەیەی وەرگرتوە؛ لە ئەرکەکان ڕادەکات، پاشان بیرۆکە ئیرجائیەکە وای لێ دەکات، خۆدزینەوەی لە ئەرکەکانی لا خراپ نەبێت، مادام دڵی بە بڕوا ئاوەدانە! جا ئوممەت وردەوردە خۆی دەدزێتەوە، هەتا دەکەوێتە هاوبەش دانانی ڕون و ئاشکرا، جا هاوبەشدانانی بڕوا بێت، یا هاوبەشدانانی پەرستن، یا هاوبەشدانانی حاکمیەت، پاشان بیرۆکە ئیرجائیەکە بەردەوام وا لە خەڵك دەکات، کە هێشتا چاکن و بڕوادارن!

با وادابنێین قوتابخانەیەك هەیە خوێندکارەکانی ئامادە بن بۆ خوێندن، پاشان دوای ماوەیەك گوێ نەدەن بە خوێندن و، پاشان لە ئامادەبونی وانەکانیش خۆبدزنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێیان بوترێت: لۆمە ناکرێن مادام نیازی ئامادەبونتان هەبووە، بەڵکو لەبەر تەمەڵی ئامادەنەبوون، نەك ئینکاریتان لە وانەخوێندن کردووە! لەبەر ئەوەی ناوتان لە تۆمارەکانی قوتابخانەدا هەیە و داوای سڕینەوەتان نەکردووە، هەر قوتابین!

ئایا دەتوانرێت لە واقیعی زەویدا بەو گیانی تەمبەڵی و پشتکردنەوە هیچ شتێك بکرێت، که لەخەیاڵدا دەژی وادەزانێ ئەوە شتێکی حەقیقەتە؟

---

١ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((بَدَأَ الإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ)) ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وەك سەرەتا هەر بە نامۆییش دەگەڕێتەوە، دە جا خۆشبەختی بۆ ئەو نامۆیانە.

جا ئەگەر بەڕەهایی نەتوانرێت بەو گیانەوە هیچ شتێك بكرێت بە گشتی، ئایا دەكرێ ئیسلام بەوجۆرە گیانەوە هەڵسێت، ئەو ئیسلامەی هاتۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی ببێتە بزوتنەوەیەكی گشتگیری(شامل)، كە هەموو ژیان بە هەموو ڕو و بوارەكانیەوە بگرێتەوە، هەموو زەوی بگرێتەوە، هەموو مرۆڤایەتی بگرێتەوە، بە ئەندازەی ئەو كۆششەی دەدرێت، بە ئەندازەی ئەوەی خوا لە زانستی پێشویدا دایناوە؟

ئایا تەنها بە بەڕاست دانان و دان پیانان (التصديق والاقرار) دەتوانرێت ئەو فیتنەیە نەهێڵرێت، كە بیروباوەڕی گەندەڵ(فاسد)ەو سیستەمی گەندەڵە و چەند سوپایەك بەرگری لێدەكات؟ ئایا دەتوانرێت فیتنە لاببرێت، كە دەكەوێتە سەر مرۆڤ، بەهۆی نەفامی خۆیەوە، بێ جیهادێك لە واقیعی زەویدا: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ لەگەڵیان شەڕكەن هەتا ئاژاوە نامێنێ و دین گشتی دینی خوا دەبێ.﴾الأنفال:٣٩.

بەڕاستی ئەو نەخۆشیە -نەخۆشی ئیرجائی- توشی هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەكانی سەر زەوی ببوایە، نەدەبوایە توشی نەتەوەی ئیسلام ببێت، چونكە بۆ پێشەوایی هاتووە، بۆ شایەتی بەسەر هەموو مرۆڤایەتی هاتووە: ﴿وَجَـٰهِدُوا۟ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَـٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ﴾ بە دڵ و داو-وەك پێویستە- لەڕای خودا بچنە خەزا، ئەو هەر خۆی ئێوەی هەڵبژارد؛ لەم دینەشدا توشی زەحمەتی نەكردون؛ هەر ئایینی ئیبراهیمی باوەتانە؛ لەپێشدا و لەم قورئانەشدا هەر ئەو ناوی نان موسڵمان؛ تا پێغەمبەر بە شایەت بێ لەسەر ئێوە و ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵك.﴾الحج:٧٨.

* * *

پاشان بیرۆكەی صۆفی هات لەسەر هێڵێكی تەریب بە بیرۆكەی ئیرجائی،

ئەگەر لەسەر شێوەیەکی تریش بوبێت..

بیرۆکەی ئیرجائی کردەوەی لەناوی بڕوا دەرهێنا، بەڵام بیرۆکەی صۆفی تەرکیزی کردە سەر یەك جۆر کردەوە، جۆرەکانی تری لە پێویستیەکانی ئیمان دەرهێنا، هەروا تەرکیزی کردە سەر خواپەرستن بە واتا تەسکەکەی و کورتهەڵاتو بە دروشمی پەرستن و یاد(ذکر)کردن، جۆرەکانی پەرستنی پشت گوێ خست هەر لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە پێی پێویستیەکانی بەرنامەی خوایی و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە و جیهادکردن لەڕێگەی خوادا، ئەوانە هەموو لە کتێبەکانی خوا و سوننەتەکەی پێغەمبەردا دەقی ڕوون و ئاشکرایان لەسەر هاتووە: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ: ئەوانەی وا ئەگەر لەم زەمینەدا دایانمەزرێنین، نوێژکەر و زەکات دەرن و فەرمان بەچاکە دەدەن و بەر لە کاری خراپ دەگرن، سەرئەنجامی هەمو کاریش هەر بۆ خوایە.﴾الحج: ٤١.

﴿فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ: با ئەوانەی بۆ قیامەتێ دەست لە دنیایە هەڵدەگرن، بچنە خەزا لەڕای خوادا..﴾النساء: ٧٤.

﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ: هەتا خوا بڕواداران هەڵاوێرێ و بێبڕوایان لەناوبەرێ. ئاخۆ ئێوە لاتان وایە هەر سەربەخۆ دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا خودا خەباتکاران و خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردوە.﴾آل عمران: ١٤١-١٤٢.

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ: ئەوە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان تێیدا بگەڕێن و لە بژێویەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك/١٥.

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئـــەو لـــەم خاكـــەی وەدیهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود: ٦١.

بەڕاستی یاد(ذکر) کردن پێویستە، پەرستن بە بێ یادکردن نابێت، بەڵام دەبێ یادکردن ئـەوەبێت، کە خـوا لـە کتێبەکـەیدا باسـی کـردووە و صەحابـەکانی پـێوەصف کـردووە لـە ئایـەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ: ئەوانەی چ بە وێستاوی و چ لە جێوە، بە دانیشتن، چ لەسـەر تەنیشت دەخەون، هەر یادی خوا دەکەن.﴾آل عمران: ١٩١. لەو یادەدا صۆفیەکان شتێکی جیاوازیان داهێناوە، کە پەرستنی تێدا کورت کراوەتـەوە، پێیـان وایە ئـەو یادە خەڵك دەگەیەنێت بە ڕەزامەندی خوا، بێ گوێدان بەو بڕوایەی تێـی کەوتووە، کـە ئەویش (اتحاد) و (حلول) و (وحدة الوجود)ە، کە هاوبەش دانانی ئاشکران.

ئەو هۆیانەی بونە هۆی بڵاوبونەوەی بیرۆکەی صۆفی هەرچیەك بێت و لـە هـەر کاتێك لە کاتەکاندا بوبێت، تاکـە دەروازەیـە بـۆ چونـە نـاو ئـایین، یـان دەروازەی سەرەکی‌یانە بۆ چونە ناو ئـایین، ئـەم بیرۆکەیـە لەپێکهاتـەی ئوممـەتدا خراپـەی زۆری دروسـت کـردووە، کـەمترینیان پشـت لێکردنـەوە و دەسـت نەگرتنـە بـە هۆیەکان، گوێ‌نەدان بە ئاوەدانکردنەوەی زەوی، لادان لە بیروباوەڕی قەزاوقەدەر، هەست نەکردنی مرۆڤ بە لێپرسینەوەی دەربارەی هەڵەکانی، کاتێ هەڵـەی کـرد، پشت کردن لە جیهاد و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە، دابڕانی دونیا و ئاخیرەت لەیەك، هەروا لە نێوان کاری دونیایی و کـار بـۆ ڕۆژی دوایـی لـە هەستی موسڵماندا، تێکدانی ئەو تەرازووە جوانە وردەی، کە ئیسلامی ڕاست لـە دەروونـدا دروستی دەکات، کە وای لە مرۆڤ کردووە بە هەموو کۆششـێ لـە واقیعـی زەویـدا کاربکات و دڵی بەسترابێت بە خوا و ڕۆژی دواییەوە، یـان بە دەستـەواژەیەکی تـر هاوسەنگ کردنی ورد لەنێوان جیهانی نادیار(غیب) و جیهانی دیاز هەیە.

* * *

پاشان کورت کردنەوەی ئیسلام لە جیهانی تاکدا بەتەنها خۆی و وازهێنان لـەو (کاروبارە گشتیانەی) خوا لەسەر کۆمەڵی موسڵمانی داناون بـۆ چارەسەرکردنی

ئەو نەخۆشیانەی توشی ئوممەت هاتون، لە کاروانە درێژە مێژووییەکەیدا..

بەڕاستی ئەم ئایینە بۆ چاك کردنی تاکە کەسەکان نەهاتۆتە خوارەوە، هەر کەسە بە تەنها خۆی، هەرچەندە ئەوە ئەو بناغەیە، کە بینا بۆئەوە دادەمەزرێت، بەڵام چاککردنی تاکەکەسەکان بەتەنها خۆیان، کۆمەڵێکی چاك پێك ناهێنن، وەك مرۆڤ لە سەرەتاوە وای بە خەیاڵدا دێ. ئەگەر بیربکەیتەوە لە بینایەك، هەموو خشتەکانی ساغ بن، بەڵام شتێك نەبێت خشتەکان بە یەکەوە ببەستێ، بینایەك دروست نابێ، کە خۆی لەبەر بومەلەرزەدا بگرێت، ئای! نمونەی ئەوە لە ژیانی نەتەوەکاندا چەندە زۆرە، بەڵکو لە ژیانی تاکەکانیشدا، بەڵام ئەوانە بەرگەی بایەك ناگرن، ئای بای گێژەلوکە چەند زۆرە!

بەڕاستی ئەم ئایینە تەرکیزێکی ئاشکرای کردۆتە سەر کۆمەڵی موسڵمان، بەڵکو تەرکیزی کردۆتە سەر نەتەوەی موسڵمانی یەکگرتووی یەکڕیز، نەك تەنها تەرکیزی کردبێتە سەر سۆزی ویژدانی، بەڵکو تەرکیزی کردۆتە سەر کارو ئەرکەکانیشی. هەروا زۆر لەو دوان(خطاب)ەی ئاراستەی بڕواداران کراوە، کە بە فەرمودەی خوا دەست پێدەکەن: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟..﴾ مەبەست لەو بانگەوازە تەنها تاکە کەسەکان نیە، هەر کەسە بە تەنها خۆی، بەڵکو مەبەستی پێی کۆمەڵە کۆبوەوەکەیە، کە هاویەشن لە لێپرسراویدا: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنە دۆستی خۆتان.﴾المائدة: ٥١.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ: ئەی گەلی خاوەن

باوەڕان! هەرکەس لە دینی خۆی پاشگەز ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێ وا دەخاتە رو، خۆشی بوێن، ئەوانیش خوایان خۆش بوێ و لە ئاست بڕواداران نەرم و نیان دەبزونەرە و لە بەرامبەر دوژمنانی دین سەربڵند و توند وتیژن، خەزا لەڕای خوا دەکەن و لە تەشەری سەرکۆنەکەران ناترسن. ئەمە زێدە خەلاتێکە لەخوداوە بەهەرکەسێ خۆی حەز بکا پێی دەبەخشێ. خوا زانایە و –لە بەخشین– زۆر دەس گوشادە. دۆستی ئێوە هەر خودا و پێغەمبەرییەتی و ئەو دەستەی بڕوادارانەن کە نوێژکەر و زەکات دەرن و بەرەو خودا لە کڕنۆشدان.﴾المائدة:٥٤-٥٥

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بە یەکسانی و بێجیاوازی–بە کاری مەردم ڕابگەن– و بۆ خوداش شایەتی بدەن؛ هەرچەندە شایەتی دانتان بە زیانی خۆتان و دایك و بابتان و خزمانیشتان بێ، –ئەگەر شایەتی بۆ دراوان– دارابن یاخۆ هەژار بن، خوا بۆ ئەوان دڵسۆزترە؛ مەکەونە شوێن ئارەزوتان، نەوا لەڕێگە لابدەن، ئەگەر زمان بخەنە لا، یا خۆتان لە شایەتی دان بدزنەوە، لە هەرکارێ ئێوە دەیکەن، خوا هەمیشە ئاگادارە.﴾النساء:١٣٥.

﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ: بڕوادارن، با جگە لە بڕواداران نەگرن بە دۆست.﴾آل عمران:٢٨.

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ: دەبێ لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك بن، فەرمان بە چاکە بدەن و ڕێ لە خراپە بگرن؛ هەر ئەوانەش ڕزگار دەبن.﴾آل عمران:١٠٤.

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ: کاروباریان بە ڕاوێژە.﴾الشوری:٣٨.

﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ: ژن و پیاوی بڕوادار دۆستی یەکترین؛ فەرمان بە چاکە دەدەن و بەر لە کاری ناشیرین دەگرن و نوێژدەکەن و زەکات دەدەن و بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خودان.﴾التوبة: ٧١.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ: خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە بۆ خەزا لەڕێی خودا، ڕیز دەبەستن، وەك دیواری قوڕقوشمە.﴾الصف: ٤.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

((مَثَلُ الْقَائِمِ فِي حُدُودِ اللَّهِ وَالْوَاقِعِ فِيهَا، كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ، فَصَارَ بَعْضُهُمْ أَعْلاَهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا، فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ، فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي مَكَانِنَا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا، فَلَو تَرَكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا، وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعًا: ئەو کەسەی هەڵدەستێت بەبەجێگەیاندنی سنورەکانی خوا و ئەو کەسەی دەکەوێتە ناویان، وەك کۆمەڵێك وان کە بە پشك خستن لەسەر کەشتیەك هەندێکیان دەکەونە ژێرەوەی و هەندێکیان دەکەونە سەرەوەی، ئەوانەی لەژێرەوەبوون کاتێ ئاویان پێویست بوایە، بۆ ئاوهێنان بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا تێدەپەڕین، جا وتیان: ئەگەر کونێك بکەینە بەشەکەی خۆمان و ئاوی لێوە بهێنین، نەك ئازاری ئەوانە بدەین لەسەرومانەوەن. ئەگەر وازیان لێ بهێنن ئەو کارە بکەن، هەموویان تیادەچن، ئەگەر دەستیان بگرن خۆیان و ئەوانیش ڕزگار دەبن.))[1]

((كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ: هەموتان سەرپەرشتیکەرن و لێپرسراون بەرامبەر ژێردەستەکانتان.))[2]

---

١ أخرجه البخاري

٢ أخرجه الشيخان.

ئەمە و گەلێکی تر وەك ئەوانە زۆرن، کە جەخت لەسەر لێپرسراوێتی کۆمەڵیی بۆ ئوممەت دەکات، جا ئەو ئەرکانەی بەندەیەك بە تاکەکەسی بەجێی دەهێنێ بۆ خوای تاك و بەرز، هەر لە یادکردن و لێترسان و ملکەچ بون و بەجێگەیاندنی فەرزەکان لە نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج، جێی ئەولێپرسراویەی کۆمەڵ ناگرێتەوە، هەرچەندە ئەوانەش هەموو پێویستن ناتوانرێت وازیان لێ بهێنرێت، بەڵام -وەك وتمان- لەخۆیەوە نەتەوەیەکی یەکگرتو کە کار بەو ئایینە بکات دانامەزرێت، ئەو ئایینە کە خوا لەسەر شێوەکەی خۆی ناردویەتیە خوارەوە و، بۆ ئەو ئامانجانەی خوا ویستویەتی لێیان، چەند تاکەکەسێکی جیاجیا ناتوانن پێی هەڵسن، ئەگەریش هەریەکەیان لەخۆیدا لە پاکترین کەس بێت، ئایین فەرزێکە جێبەجێ ناکرێت هەتا مرۆڤ بێت، کە چەندەها پاڵنەر پاڵیان پێوە بنێت و، لە دەرونیشیاندا جۆرەها کارتێکردن و هەوا و ئارەزو تێك دەچێ، هەروا مادام خوا لە هەموو شارێکدا گەورەی تاوانباری دانابێت فێڵ و تەڵەکەی تێدا بکەن کەسیش نەبێت بەرەنگاریان بوەستێت:

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ: هەروا تاوانکاری هەر کۆمەڵێکمان کردۆتە خاوەن دەسەڵات، تا لەوێدا خەڵك فریو دەن، لە ڕاستیشا هەر فێڵ لەخۆیان دەکەن و هەست پێناکەن.﴾الأنعام/١٢٣.

هەتا ئەگەر گەورە تاوانکاران تایبەت بێت بە نەفامیەوە و نەکەوێتە ناو ئیسلام، بەڕاستی (گوندی جیهانیی) کە خەڵك پێیان وایە جیهان بوەتە گوندێك، بەهۆی هۆیەکانی گەیاندن، پڕە لە گەورە تاوانکاران، ئەوانەی تەڵەکەبازی لە ئیسلام دەکەن و بۆسەیان ناوەتەوە بۆ خەڵکەکەی، جا ئایا هەڵسانی تاکەکەس - ئەگەر گشتیشیان هەڵسن- بە نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژووگرتن و حەج کردن و ملکەچی و لەخواترسان لە خۆیاندا بێننە دی، دەتوانێت فڕوفێڵی گەورە تاوانکاران بگێڕێتەوە، ئەو فیتنەیەی، کە لە نەفامیەوە بۆ سەر موسڵمانەکان هاتووە ڕەدبکاتەوە؟ یان ئەوە پێویستی بە نەتەوەیەکی یەکپارچەی یەکگرتو و هەڵساو بە لێپرسراوێتیە کۆمەڵیەکەی هەیە، کە هەر تاکە کەسەی بەشی خۆی

هەڵدەگری، کە بەڕاستی یەکگرتو نابێت ئەگەر هەرکەسە لەو کۆمەڵەدا بڵێت: خۆم، خۆم و، خۆی لە لێپرسراویەکەی بەرامبەر کۆمەڵ بکێشێتەوە.

ئایا پێغەمبەرﷺ، هاوەڵەکانی تاك تاك پەروەردە دەکرد، پاشان هەریەکەیانی لەجیهانی تایبەتی خۆیدا دادەمەزراند و، پێی دەوت: هەر بۆ خۆت بە و کارت بە کەسەوە نەبێت؟ یان هەر تاکە کەسێکیانی پەروەردە دەکرد بۆ ئەوەی ببێتە خشتێکی یەك پارچەی بەستراو بە خشتێکی ترەوە لە لاشەیەکی یەکگرتودا، ئەو شتەی دەخستە نێوانیان، کە وایان لێبکات بەیەکەوە بلکێن و ئامادەبێت یەکێکی تریش بەوەوە بلکێت.. ئەویش لکێنەری هەستی بەیەك بەستراو و لێپرسراوێتی هاوبەش بوو، ئەو دوانە هەڵقوڵاوی یەك سەرچاوەن، کە هیچیان ناتوانن واز لەویتریان بهێنن.

هاوبەرپرسیاری(التكافل) فەرزکراوە لەسەر هەموو ئەوانەی دەتوانن پێی هەڵسن بە پێی بەشی خۆیان، بەڵام ئەنجامەکەی بە ئیجابی و سەلبی دەگەڕێتەوە سەر هەموو ئوممەت، جا ئوممەتی یەکگرتو خۆشەویستیان دەکات لەناو یەکدا ئەگەر پێی هەڵسن، یا گروپەکان هەندێکیان ڕقیان لە هەندێکیان دەبێت ئەگەر خۆیان دوابخەن لێی.. جیهادیش فەرزکراوە لەسەر هەموو ئەوانەی دەتوانن پێی هەڵسن، بەڵام ئەنجامەکەی بە ئیجابی و سەلبی دەگەڕێتەوە بۆ سەر هەموو ئوممەت، جا دەمێنن و جێگیر دەبن، یان دوژمنەکانی دەیخۆن. فەرمان بە چاکە و ڕێبەستی لە خراپە فەرزکراوە لەسەر ئەوانەی دەتوانن پێی هەڵسن بەپێی بەشی خۆی، بەڵام ئەنجامەکەی بە ئیجابی و سەلبی دەگەڕێتەوە سەر هەموو ئوممەت، جا دەبن بە نەتەوەیەکی چاك، یا نەتەوەیەکی نەفرین لێکراو: ئەگەر فەرمان بەچاکە بکەن و ڕێبەستی لە خراپە بکەن ئەوا چاك و هەڵبژاردە دەبن، ئەگەریش لە واجبەکانیاندا کەمتەرخەمی بکەن، ئەوا نەفرین لێکراو دەبن: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا؛ فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن. باوەڕیشتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران: ١١٠

﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى
ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا
يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ: ئەو دەستە
لە بەنی ئیسرائیل کە لە دین لایاندا، لەسەر زمانی داود و عیسای فرزەندی مەریەمڕا نەعلەت کران، چونکە فەرمانی خوایان بەجێ نەهێنا و پیشەیان دەستدرێژی بوو. لەو رەفتارە نالەبارە وا دەیانکرد، بەرگرییان لەیەك نەکرد. ئای کە چەند خراپەیان کرد.﴾المائدة:٧٨-٧٩.

ئەو هۆیانە هەرچی بن کە بوونە هۆی بڵاوبوونەوەی گیانی خۆویستن و خۆ دورخستنەوە لە ئەرکە کۆمەڵی‌یەکان و هەست نەکردن بە لێپرسراوێتی بەرامبەر بە کۆمەڵ، ئەوا ئەم گیانە گەندی گەورەی لە جەستەی نەتەوەدا دروست کردووە، بەلایەنی کەمەوە بووەتە هۆی وازهێنان لە ئەرکی ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتداران، کە ئەو ئەرکە پێویستێکە پێغەمبەرﷺ بە بەشێك لە ئایینی داناوە، کە فەرمویەتی: ((الدِّينُ النَّصِيحَةُ: ئایین ئامۆژگاریە))، وتیان بۆ کێ ئەی نێر. ا خوا؟ فەرمووی: ((لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِعَامَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَخَاصَّتِهِمْ: بۆ .. وا و پێغەمبەرەکەی، بۆ کتێبەکەی، بۆ گشتی موسڵمانان و تایبەتیەکانیشیان)).[1]

وازهێنان لە سیاسەت و بەجێهێلانی حوکم بۆ کاربەدەست ئەگەر دادپەروەر بێت، خێر و بەرەکەتێکە لە خواوە، چونکە ئەگەر کاربەدەست ستەمکار بوو، لەناو نەتەوەدا ئامۆژگاریکەری نەبوو لە ستەم و دەستدرێژیەکەی بیگێڕێتەوە، دووڕوو خراپەکارەکان بە دەوریا کۆدەبنەوەو کارە خراپەکانی بۆ دەڕازێننەوە و نایەڵن بانگەوازی هەق بگاتە گوێی، ئەگەر پێشی بگات، دووڕووەکان هەڵدەسن بە دڵ سارد کردنی بەرامبەر بە حەقەکە و ئەوەیش کە حەقەکە دەڵێ!

لایەنی کەمیەکەش بریتی نیە لە سەرنەکەوتنی هەمو پرۆژەیەك، کە پێویستی بە هاریکاری بەکۆمەڵ هەبێ و هەمو تاکێك لەگەڵ کەسانی تردا بە بەشی خۆی هەڵسێ، هەروا کەمیەکەی بریتی نیە لە دروستکردنی گیانی تێکدانی مومتەلەکاتی

---

١ متفق عليه.

گشتی و شوێنە گشتیەکان و سامانی گشتی.

هەروا ئەو نەخۆشیانەی تووشی ئوممەت بوون: بێسەروبەری و بێبەرنامەیی و پشی کورتی‌یە.. ئەوانە هەمووی -پێم وایە- لە نەخۆشیەکانی ئەو ژینگەن، کە ئیسلام هات ڕاستی کردنەوە بەڕاهێنانی خەڵکەکە لەسەر یاسا و بیرکردنەوەو ڕامان پێش کارکردن، هەروا لەکاتی کارکردنیشدا، هەروا پشو درێژی وا، کە دوای هەنگاونانی بەپەرۆشی یەکەم سارد نابێتەوە.

پێغەمبەرﷺ زۆر بەپەرۆش بوو لەسەر ئەو کارانە و بەکاری لاوەکی، یان پەراوێزی دانەدەنان، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرێکی ئیلهام پێبەخشراو بوو، دەیزانی بینای ڕاستەقینە دانامەزرێت و بەردەوام چەسپاو نابێت، ئەگەر توشی ئەو دەرد و ئافاتانە ببێت.

لەسەر زمانی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە هاتووە وتویانە: ((پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژ ریزی دەکردین، وەك چۆن بۆ جەنگ ریزی دەکردین)).. ئەمەش دوای فەرمان کردن بە ملکەچی و هێمنی لە نوێژدا. چونکە ملکەچی(خشوع) لە نوێژدا لایەنێکی گیانیە، کە نێوانی بەندە و پەروەردگار پتەو دەکات، بانگەواز بۆ کردنیشی کارێکی بەڵگەنەویستە، بەڵام پێغەمبەرﷺ دەیزانی دەبێ بۆ بیناکردنی ئوممەت، شان بەشانی پەیوەندی پتەوی نێوان بەندە و خواوە لایەنێکی تریش هەبێت، ئەویش یاسا و نیزامە، چونکە یاسا خویەکی دەرونی هەستی‌یە دەبێ بە ڕاهێنان پەروەردە بکرێت، هەر لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ بەناو ریزەکاندا دەڕۆیشت، بە دەستی پیرۆزی ریزەکانی ڕێك دەخست، نوێژەکەی نەدەکرد هەتا ریزەکان تەواو ڕێك نەبونایە، ئەوەش بەڵگەی هەست کردنیەتی بە گرنگیەتی یاسا و نیزام.

وەك ئاشکرایە یاسا بەشێکە لەم ئایینە جیانابێتەوە، نوێژ یاسا و ڕێکخەرە، جا چ لە دیاری کردنی کات دابێت، یا لە ڕێکخستنی ریزدا بێت، یان لەوکاتەی نوێژکەران دوای ئیمام دەکەون لە ڕکوع و سوژدە و هەڵساندا، ڕۆژویش یاسا و کاتی خۆی هەیە، زەکات یاسا و کاتی خۆی هەیە، حەجیش یاسا و کاتی خۆی هەیە، سەرەڕای ڕێکخستنی ریزەکان لە جەنگدا.

بەڵام کاری لەخۆڕا و بێبەرنامەیی ڕەنگە لە دەرد و ئافاتەکانی ژینگە بێت،

بەڵام ئیسلام بەرەنگاری بوەوەو راستی کردنەوە، بە سەرنج ڕاکێشان بۆ یاسا و دەستورەکانی پەروەردگار، کە گۆڕانی بەسەردا نایەت، هەروا بە بانگەوازکردن بۆ تێڕامان و بیرکردنەوە و چەسپاوی لە هەموو کارەکاندا، هەروا سەرنج ڕاکێشان بۆ سەرەنجامی کردەوەکان و، نەوەستان بەوەی کە ئایا ئەو کارە خۆی لە خۆیدا ڕێپێدراوە، یان ڕێی پێنەدراوە، چونکە جاری وا دەبێت کارەکە لە ڕێپێدراوەکان بێت، یان لە پەسەندەکان بێت، بەڵام قەدەغە دەکرێت لەبەر ئەو ئەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە، وەك خوای بەرز فەرمانی داوە جوێن بە بتەکان نەدرێت، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی هاوبەش دانەرەکان بوێرن جنێو بەخوای پاك و بەرز بدەن:

﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾: قسەی خراپ دەربارەی ئەوانە مەکەن کە داوای یارمەتی لە غەیری خوا دەکەن؛ چونکە ئەوانەی نەزانن، لەوانەیە لەبەر دژایەتی خۆیان، خراپ لەمەڕ خودا بدوێن. الأنعام:١٠٨.

وەك پێغەمبەرﷺ پێشگری کرد لە کوشتنی عبدالله ی کوڕی ئوبەی، کە بە ئاشکرا مونافیقی دەکرد، بۆ ئەوەی خەڵك نەڵێن محمدﷺ هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت، ئەوان ئەوکاتە هاتبونە ناو ئیسلام، کە بڕواکەیان هێشتا چەسپاو نەبو، یان ڕاوەستابوون و چاودێرییان دەکرد، کە هێشتا موسڵمان نەبوبون، بڵاوبوونەوەی ئەو قسە لەنێوانیاندا، ئەوکاتە پەکی بانگەوازەکەی دەخست و دودڵی دەخستەوە!

بەڵام پشی کورتی و ساردبونەوە دوای پەرۆشی و حەماسەتی گەرم و گوڕ، ڕەنگە ئەویش هەروەها لە ئافاتەکانی ژینگە بێت، بەڵام ئیسلام بەجوانی لە هەموو لایەنێکەوە چارەسەری کردووە، لەلایەنی ڕوانگە و دڵیان بەرەو ئامانجێك، کە هەموو ژیانی دنیا تێپەڕ دەکات، هەروا هەموو زەوی ، هەروا هەموو کات، کە دەگاتە دوریەك هیچ دوریەك شان لە شانی نەدات، ئەویش ڕۆژی دوایی و ئەوەی تێیدایە لە زیندووبونەوەو کۆبوونەوە و لێپرسینەوە و پاداشت دانەوە و بەهەشت و دۆزەخ.. جا دنیا و ڕۆژی دوایی بەیەکەوە گرێدا و کارکردنی لە دنیادا کردە هۆی گەیاندنێکی دڵنیایانە بەرەو ڕۆژی دوایی، ئیتر دوای ئەوە دوریەکی تر نامێنێ، کە

کەسەکان لەپێناویدا کاربکەن، مەبەستێکیش نیە بۆی بەئومێد بیت و بەردەوام هەڵسیت بەجێبەجێکردنی پێویستیەکانی، چونکە هەر ساردبونەوەیەك لەڕێگا، دەبێتە هۆی بڕینی ڕێگاکە!

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەرﷺ پێشەنگی و نمونەیی پێشکەش کرد لە بەردەوامی و جدیەت و لەکار بەردەوام بون بە جیهاد کردنەکەی، کە ساردبونەوەی تێدا نەبو، لە ناخۆشترین و زەحمەتترین کاتدا لە بانگەوازکردندا بەردەوام بوو، نائومێد نەدەبو، کەمتەرخەمی نەدەکرد و سارد نەدەبووەوە، لە کاتێکدا هەموو ڕەوشەکە لەبار بوو بۆ نائومێد بوون و ماندوبوون و ساردبونەوە.

لایەنی سێهەمی، ئەوەبوو بەردەوام ڕێنمایی هاوەڵەکانی خۆی دەکرد و ئوممەتیش لە دوایانەوە، بۆ جدیەت و بەردەوامی ئەگەر دەریش کەوتبێ بەدەست هێنانی بەرئەنجامەکەی دورە، بۆیە دەیفەرموﷺ: ((إنْ قَامَت السَّاعَةُ وَبِيَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ فَلْيَغْرِسَهَا: ئەگەر قیامەت هەڵسا و نەمامێك بەدەستی کەسێکتانەوە بێت با بیڕوێنێ.))[1] هەروەها بۆ کاری بەردەوام هانی دەدان، هەرچەندە کەمیش بێت و بەبێ پچڕان، لەبەردەمیاندا هەمیشە پەنای بەخوا دەگرت لە تەمەڵی و پەککەوتوویی.

لەبەر ئەنجامی ئەم هەموو ئاڕاستە و ڕێنماییانەی قورئان و سوننەت لە ژیانی ئوممەتی مسوڵماندا، بریتیە لە بەردەوامی بانگەوازکردن بۆ خوا سەدە دوای سەدە، هەروا بەردەوامی جیهادکردن لەپێناوی خوادا سەدە دوای سەدە، هەروا ژیار(حضارة)ێکی بەرز و گەورە و بزوتنەوەیەکی زانستی گەورە، کە چەند سەدەیەك لە واقیعی زەمیندا بەردەوام بوو.

ئەو هۆیانەی هەرچیەك بن، کە بوونە هۆی سست کردنی گیانی پاڵنەر لەژیانی موسڵماناندا و گەڕانەوەیان بۆ سروشتی بێسەروبەرە، کە حەز بە یاسا ناکات، شتی لەخۆڕا و بێبەرنامە، کە حەز لە پلان ناکات و پشی کورتە، کە بەزویی هەڵدەچێ و بەزویی دادەمرکێتەوە، بەڕاستی ئەو نەخۆشیانە بوونە هۆی گەندی و تێکچوونی گەورەی قەوارەی ئوممەت، لەوە کەمتر نیە، کە بەزمانی سەردەم پێی

---

١ رواه أحمد

دەڵێن (دواکەوتوویی شارستانیەتی)، کەمتر نیە لە تیاچونی زۆر لە پرۆژە سودبەخشەکان پێش بەرهەم دانی، کەمتر نیە لە هەست مردویی بەرامبەر زۆر لە نەخۆشیە بیروباوەڕی و فیکری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتیەکان، هەروا هەوڵ نەدانی ڕاستەقینە بۆ گۆڕینیان، هەموو ئەمانە لەو خراپانەیە، کە خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمانیان داوە بۆ گۆڕینیان، پێغەمبەرﷺ ئوممەتیشی ترساندووە لەوەی، گەر هەڵنەستن بە گۆڕینی ئەو خراپانە، خوا سزاکەی دەدات بەسەر هەموویاندا..

* * *

کاتێك ئەو هەموو نەخۆشیانە لەقەوارەی ئوممەتدا کۆبوونەوە، دوو کاری گەورەیان بەدی هێنا، لەوانەی پێغەمبەرﷺ هەواڵی روداني داوە: نامۆبونی ئیسلام و، دەم تێژەنینی نەتەوەکان لە ئوممەتی ئیسلامی.

ئیسلام دوبارە نامۆ بووەوە، وەك لەسەرەتاوە نامۆ بوو، هەموو چەمکەکانی لەسەر ئەو شێوەیە نەماون کە لەلایەن خواوە نێرراون.

(لا الـه الا الله)یش بووەتە وشەیەك بەزمان دەوترێت، دڵیش بێئاگایە لە واتاکانی و ڕەفتاریش پێچەوانەی پێویستیەکانێتی، پەرستنیش(عبادة) لە چەند دروشمێکی پەرستندا کورت هەڵهاتوە، ئەو دروشمانەش خۆیان بوونە کردەوەیەکی تەقلیدی بێگیان، پاشان بوونە کەمتەرخەمی و تەمبەڵی تێداکرا، هەتا لەجێبەجێکردنیدا. تەنها قایل بون بە نیەتی چاك بەرامبەریان، بەڵام بیروباوەڕ بە قەزاو قەدەر بووەتە پشت بەستنی سەلبی نەخۆش، لەجیاتی پشت بەستنی ڕاست لەگەڵ عەزیمەت و دەستگرتن بەهۆکانەوە، هەروەها بوەتە هۆی پاساو بەرامبەر هەموو ئەو هەڵە و کەمتەرخەمی و تاوانانەی دەکرێن بەوەی هەمویان قەزاوقەدەری خودان!

دونیا و ئاخیرەتیش لە هەستی خەڵك جیابوونەتەوە، وای لێهاتووە کارکردن لەپێناوی دونیا، پشتگوێ خستنی ئاخیرەت بێت، کارکردن لەپێناوی ئاخیرەت پشتگوێ خستنی ژیانی دونیا و ئاوەدانکردنەوەی زەوی بێت.

چەمك(مفهوم)ی جیهادیش بەردەوام بچوك دەکرێتەوەو بەند دەکرێت، هەتا

وای لێهاتووه بوەتە بەرگری کردن و بەس، تەنانەت لە بەرگریکردنیش تەمبەڵی دەکرێ و لەپێویستیەکانی خۆ دەدزرێتەوە.

هەروا چەمکی پەروەردەش بوەتە ڕاهاتن لەسەر ڕێوڕەسم و نەریت، کە گیانێکی داهێنەر پێك ناهێنێت و ئومێدێکی بەرزی نابێت.

چەمکی ئارام گرتن و لەخواترسان بوەتە سەلبی و مل شۆڕی ڕازی بە زەبونی، کە بۆ لابردنی نابزوێ.

کاتێ ئەو تێکچوونە گەورەیەی لە چەمکەکانی ئیسلامدا ڕویدا، ((دواکەوتویی)) لە هەموو مەیدانەکان ڕویدا: دواکەوتویی سەربازی، دواکەوتوویی رامیاری، دواکەتویی زانستیی، دواکەوتویی فیکری، دواکەوتویی ئابوری، دواکەوتویی کۆمەلایەتی، دواکەوتویی ڕەوشتیی.. هەموو ئەو دواکەوتنانەی کە بەبیردا دێت، چونکە کاری هەڵقوڵاو لە هەموو ئەو مەیدانانەوە لە قۆناغی جێگیربون و دەسەلاتدا هێزی لەو سەرچاوە گەورەیە وەردەگرت، کە بریتی بوو لە بیروباوەڕی ڕاست بە خوا و بەرۆژی دوایی.

کاتێ سەرچاوەکە لەدڵی خەڵکدا وشك بوو -جگە لەوانەی پەروەردگار ڕەحمی پێکردون- شتێك نەماوە، کە کردەوە لە دەروندا تێر بکات: ((أَلاَ وَإنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ: بەڕاستی لە جەستەدا پارچەگۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو چاك بوو هەموو جەستە چاك دەبێت، ئەگەر خراپ بوو هەموو جەستە خراپ دەبێت، ئەو پارچە گۆشتەش دڵە.)).[1]

ئا ئەو کاتە نەتەوەکان دەمیان ژەندە نەتەوەی ئیسلام، کە وەك کەفی سەر ئاوی لێهاتبوو. ئەو دوژمنە چاوەڕوان کراوانە هاتن، کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ: بەهیچ شێوەیەك گاور و جولەکە ڕازی نابن لێت، هەتا شوێن ئایینەکەیان نەکەویت.﴾البقرة: ١٢٠. ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن

---

١ رواه البخاري

دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُواْ: بەردەوام دژتان دەجەنگن، هەتا ئەگەر بتوانن لە ئایینەکەتان وەرتان دەگێڕن.﴾البقرة:٢١٧.

ئەمجارەیان هاتون کە پلانەکانیان تەواوی لەناوبردنی ئەو ئایینەیە، نەك تەنها سوك کردنی و سەرکەون بەسەریا.

لەوانەیە ئەو ئامانجە لە خودی خۆیدا تازە نەبێت، بەڕاستی ئەوەش بوو (هیرەقل)ی جولان لەسەرەتای مێژووەوە بۆ هەوڵی زیندەبەچاڵ کردنی ئەو ئایینە، پێش ئەوەی کارەکەی گەورە بێت.. ئەوەش بوو لە سەردەمی ناوەڕاستی لە ئەوروپادا شەڕی خاچپەرستەکانی جولان، ئەمڕۆش هەر ئەوەیە دەیجوڵێنێت، بەڵام لەوانەیە تازەیی‌یەکە لە هێرشی خاچپەرستەکانی سەردەمدا بێت –کە لەوکاتەوە دەستی پێکردووە، کە موسڵمانەکان لە ئەندەلوس دەرپەڕێندران– بەڕاستی هاتون قەناعەتیان زۆرترە بەوەی، کە ئەمجارە ئامانجەکانیان بەجێ‌دێنن، لەبەر ئەو نەخۆشیانەی کە لە قەوارەی ئوممەت بڵاوبونەوە، هەروا لەبەر هێنانەکایەی چەکی ململانێ، جا ئامانجی جەنگی بێت، یا رامیاری، یا ئابوری، لە هەموویان ترسناکتر ئەوەیە، کە پێی دەڵێن: (داگیرکردنی بیریی: الغزو الفكري) کە هەوڵ دەدات ریشەی بڕوا لە دڵدا دەربهێنێت، کە لویسی نۆزدەهەم ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد لەسەری، دوای بەربونی لە بەندیخانەی (منصورە) و گەڕایەوە بۆ ناو نەتەوەکەی و پێی دەوتن: ئەگەر دەتانەوێت بەسەر موسڵماناندا زاڵ بن، تەنها پشت بەچەك مەبەستن، ئەوە ئێوە ئەنجامی پشت بەستنتان بەچەك بینی، بەڵکو جەنگی بیروبڕوایان لەگەڵدا بکەن، چونکە بیروبڕواکەیان هێزیانە و، کردوونیە مەترسی لەسەر ئێمە.. ئەمە و بێجگە لە چونی جولەکە بە هەموو فێڵ و تەڵەکەیەکیەوە بۆ ناو هەرەوەزی جەنگەکە، لەپێناو دروستکردنی ئیسرائیلدا.

بەڕاستی ئەوەی داگیرکردنی فیکری پێی هەڵسا، چەکێکی تر نەیتوانی ئاوا پێی هەڵسێ، لەو چەکانەی لەوەپێش دژی موسڵمانان بەکارهاتووە.

موسڵمانان چەندەها جار لەمێژوودا شکاون، بەڵام شکاندنی سەربازی کاری تێ‌نەکردوون، وایان لێ‌بکات واز لە بیروباوەڕەکەیان بهێنن، یان بە شتێکی تری بگۆڕنەوە.

لەبەردەم خاچ پەرستەکان بەزین، لە بەردەم تەتارەکان بەزین، بەلام بانگەوازی خوایی‌یە دڵی پڕ دەکردن، کە دەیفەرموو: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ: با سستی روتان تێنەکا و خەمیش مەخۆن. هەر ئێوەن کە سەر دەکەون، ئەگەر بڕواتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران: ۱۳۹.

﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ۝ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ۝ فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ: بەشی زۆر لە پێغەمبەران دەگەڵ گەلی خواپەرستانی هەڤاڵیان چونە خەزا، هەرچەند بەلای لەڕێی خوادا توشی هاتن، نە هیچیانی سستەوە کرد، نە زەبونی روی تێکردن. لەوانەی کە خۆڕاگرن، خوا خۆشی دێ.. هەر ئەوەندەیان ئەدرکاند، دەیانگوت: ئەی پەروەردگارمان! تۆ لە گوناهان و لە ئەندازە لادانمان ببورە و جێ هەنگاومان پتەوتر کە و بەسەر خودانەناساندا زاڵمان بکە.. ئەوسا خودا پاداشتی ئەم دنیا و چاکە پاداشی ئەو دنیای پێدان. خوا کارچاکانی خۆش دەوێ.﴾آل عمران:۱٤٦-۱٤۸

بەڕاستی بڕواداربوون، جەنگ لە هەستیاندا جیهاد بوو لەڕێی خوادا.. ئەوەندەی نەخایاند کۆبوونەوە دوای پەرت بون، دوای سستی گوڕیان بەبەردا هاتەوە، ئەوەی بەزایەیاندا گەڕاندیانەوە، خوایش پاداشتی دونیا و پاداشتی چاکی ڕۆژی دوایی دانەوە.

.. لەوپەڕی بەزیویدا هەرگیز بە بیریاندا نەدەهات، کە دوژمنەکانیان لەخۆیان چاکتر بن، چونکە دوژمنەکانیان بێبڕوا بوون ئەمان بڕوادار، شوێنی بەرزبونەوە و سەرکەوتنیش ئیمانە، بەچاوپۆشین لە سەرکەوتن، یا بەزیوی لە گۆڕەپانی جەنگدا..

بەلام ئەمجارەیان بەرزبونەوە و سەرکەوتن بەبڕوا نەبوو، بەڵکو بە بەزیوی

گیانی بوو لەبەردەم دوژمندا، جا ئەو داگیرکردنە فیکریە بەشێوەیەك دامەزرا، کە بە بیردا نەدەهات.

لە میانەی یەك سەدەدا –بەڵکو هەندێ جار لەنیو سەدەدا– ئوممەت گۆڕانێکی تەواو گۆڕا، وەك ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان نەتەوەی ئیسلام نەبوبێت!

سەرچاوەی وەرگرتن گۆڕا، سەرچاوەکە ئیسلام نەبوو، خواو پێغەمبەریش نەبوو، بەڵکو ((شارستانی ئەوروپی)) بوو بە سەرچاوە، بو بە نمونەی خوازراو، کە وەربگیرێ.. ئیتر هیچ شتێك نەما لە دەروندا دەنگ بداتەوە بەپێی فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئاخۆ ئەوان گەرەکیانە دابی زەمانی نەزانی بەر لە ئیسلام بژیەننەوە دەیسا لەلای ئەو کەسانەی وا لە بڕوای خۆیانا هیچ شك و گومانێکیان نیە، کامە فەرمان لە فەرمانی خوا چاترە؟﴾المائدة: ٥٠.

وای لێهاتووە گەر باسی (شارستانی) بکەیت بڵێیت: نەفامیە، بە دیدی ڕۆژئاوا پەرستەکان بە کوفر دادەنرێت، ئەوانەی غەزوی فیکری دڵ و مێشکی خواردون، ئیسلامیش لە هەستیاندا، دواکەوتویی و بەربەری و فەسادە، بالاپۆش(حجاب)ی ئافرەتی موسڵمان بەندیخانە و تاریکیە، بە بەرەڵایی و سوڕانەوەی بە ڕوتی؛ پێشکەوتن و ئازادیە، وای لێهاتووە ئیلحاد و بێبڕوایی و گاڵتەکردن بە قورئان وسوننەتی پێغەمبەرﷺ ناونیشانی (ئازادی فیکر)ە، وای لێهاتووە خۆ داماڵین لە ئیسلام و سەربە ڕۆژئاوابوون پلە و نیشانەیەکە، کە بەندەکان شانازی پێوە دەکەن.

پاشان (ڕێبازە فیکریەکان) هاتنە ناوەوە: لەوانە نیشتمان پەروەری و نەتەوەپەرستی و عنلمانیەت و سۆشیالیستی و دیموکراسی..هتد. بۆ ئەوەی لەڕوێکەوە ببێتە جێگری فیکری ئیسلام، لە ڕویەکی ترەوە بۆ ئەوەی ئەم نەتەوەیە پارچەپارچە و پەرتەوازە بکات، هەتا دوژمن بە ئاسانی قوتی بدات، دوای ئەوەی نەیدەتوانی سوك و ڕیسوای بکات، کاتێ لەژێر ئاڵای ئیسلامدا یەك پارچە بوو، هەتا ئەگەر یەك پارچەی ڕامیاری تەواویش نەبووبێت بە واتا ڕاستەکەی.

شیو و دۆلێکە، کە ئوممەتی ئیسلام لە هەموو مێژوویدا پێی نەگەیشتووە، بەلاّم شتێکی مەنتیقیە بۆ کەفی دەریا لەوە زیاتری لیّ چاوەڕوان بکرێت.

*  *  *

ئەو واقیعە ئەوەیە، کە رابونی ئیسلامی بەرەنگاری بۆتەوە -بەرەنگاریشی دەبێتەوە- بەلاّم خودی رابونەکە قەدەرێکی زالّی خوایە بەسەر هەموو فرۆفێلّەکانی دوژمندا و، بەسەر ئەو پلانانەی دایان ناوە بۆ لەناوبردنی ئیسلام: ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ: خوا لەسەر کاری خۆی زالّە، بەلاّم زۆربەی ئەم مەردمە لیّنەزانن.﴾یوسف: ٢١.

کەس پێشبینی رابونی نەدەکرد، نە دوژمنەکان، نە موسلّمانەکان خۆیان! بەلاّم دوژمنەکان چاوەڕوانی مردنی پیاوە نەخۆشەکە بوون، وەك بە خەلافەتی دوایی دەولّەتی عوسمانیان دەوت، بۆ ئەوەی پەلاماری بەجێماوەکانی بدەن و پارچەپارچەی بکەن و بەتەواوەتی بۆ دواجار ئیسلام لەناوببەن.

بەلاّم موسلّمانەکان نائومێدی و خۆدان بەدەست ئەمری واقیعەوە، بالّی بەسەر زۆریاندا کێشابوو، وایان لیّهاتبوو ئەوپەڕی ئومێدیان ئەوەبوو، ئەگەر کەمێکیش بێت لە چنگە خنکێنەرەکەی دوژمن رزگاریان بێت و دوژمن وازیان لیّبهێنیّ بژین، ئەگەر لەدوای کاروانەکەیشەوە بن و لوتیان چەقیبێتە خۆلّ..

بەلاّم قەدەری خوا زالّە و بەلّێنەکەی بەردەوامە کە لەناو ئەم نەتەوەیەدا، کەسانێك بنێرێت ئایینەکەی نویّ بکاتەوە، جا رابونی هێنا بە کوێرایی چاوی دوژمنان و هەموو فرۆفێلّ و پلانەکانیان..

ئێمە دلّخۆشین بە قەدەری خوا و دلّنیاین بە بەلّێنەکانی، کە ئەم ئایینە سەردەخات بە سەر هەموو ئایینەکاندا، ئێمە دلّنیاین کە ئایندە هەر بۆ ئیسلامە: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ: ئەو خودایە پێغەمبەری خۆی بەڕیّکرد بۆ ڕێبەری و ڕاگەیاندنی دینی ڕاست، تا سەری خا بەسەر هەموو دینەکاندا.﴾الصف: ٩.

بەلاّم لێرەدا ئەوەی ئێمە تاوتۆی دەکەین، ئەو شێوازی کارەیە، کە پێویستە

رابونەکە بیکاتە بەرنامەی کاری خۆی، چونکە هەر دەبێت مرۆڤ کارێك بکات بۆ ئەوەی قەدەری خوا بێتە ئەنجام دان، نەك خوا ناتوانێ قەدەرەکەی خۆی جێبەجێ بکات، بەڵکو یاسا و دەستوری خوا پێویست دەکات، کە لەو بوارەدا مرۆڤ هەبێت کاریکەن، بۆ ئەوەی ببنە دیوار بۆ قەدەری خوا: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ ئەگەر خودا بیویستبا، بۆ خۆی تۆڵەی لیّ دەستاندن، بەڵام ویستی بە یەکتریتان بئەزموێ.﴾محمد:٤. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ خوا لە هیچ گەلێك ناگۆڕی، تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن.﴾الرعد:١١.

کەواتە ڕێگای کارکردن چیە؟

چەندەها هۆ و شێواز بەبیریی کارکەراندا دێت، لێرەدا حەز دەکەین نیشانیان بدەین، بۆ ئەوەی بزانێن چی بۆ هەیە و چی لەسەرە، بۆ ئەوەی بەیەکەوە توێژینەوە بکەین، بزانین کامەیان سودی زیاترە، هەروا کامەیان بۆ حاڵەتی ئەو ئوممەتە گونجاوترە، کە پێشتر باسمان کرد:

ئامۆژگاری، پەروەردەی گیانی، بارگەی سۆزداریی، هۆشیاری فیکری، پەروەردەی جیهادی.

لەسەرەتاوە دەڵێین: هەموو هۆ(وسیلة)کان پێویستن، ناکرێ وازیان لیّبهێنرێت، بەڵام ئەوەی تاوتۆی دەکەین بریتی‌یە لەوەی تا چەند کەڵك و سودی هەریەکەیان هەیە، کاتێ بە تەنها بەکار دەهێنرێت، نەك لەسەر ئەوەی وەسیلەیەکە لە وەسیلەکان، بەڵام لەسەر ئەوەی، کە ئەوە وەسیلەکەیە، بەرنامە و ڕێگاکەیە.

لە سەرەتاوە باسی ئامۆژگاری(وعظ) دەکەین، چونکە وەسیلەیەکە زۆرکەسی پێ فریو دەدرێت، ئامۆژگاریکەر وادەزانێ کاریگەریەکەی بەپێی زیادی حەماسەتی و بڕواپێ‌بوونی و جوانی وشەکانی و چوستی لە دارشتنیایە، ئەوەش وەهمێکە واقیع بەدرۆی دەخەنەوە!

لە جیهانی ئیسلامیدا چەند تەن ئامۆژگاری دەدرێ بەگوێی خەڵکدا، هەر لە ئۆقیانوسەوە بۆ ئۆقیانوس، لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا لە ئۆقیانوسەوە بۆ

ئۆقیانوس، لـەڕۆژی هـەینی هـەموو هەفتەیـەكدا، چـەندی لە واقیعـی موسڵمانان گۆڕیوە؟

ئەگەر وتت هیچ، ئایا بە حەقیقەت دادەنرێت؟!

ئامۆژگاری كردن لـە بانگـەوازیدا فـەرمانێكی پـەروەردگارە: ﴿ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ: بە كارزانی و ئامۆژگاری پەسند، مـەردم بەرەو ڕێگەی پەروەردگارت بانگ بكە.﴾النحل:١٢٥.

بەڵام خوا نەیفەرموو ئامۆژگاری تەنها وەسیلەیە بۆ بانگـەوازیی، نەیفـەرمووە كاتێ بە تەنها بەكارهات بەرەكەی دەدات! بەڵكو بەرنامەی پـەروەردگار ئەوەیـە، كە نێرراوێك بە ئامۆژگاریەوە دەنێرێ، كـە خـۆی بـۆ خـەڵك پێشـەنگ دەبێت، بـۆ ئەوەی یەكەم جار ئامۆژگاریەكە وەربگـرن، پاشـان پێویسـتیەكانی پیـادە بكـەن: ((كان خلقه قرآن: ڕەوشتی قورئان بوو..)) بەو شێوەیە عائیشە –خوا لێـی ڕازی بێت– وەسفی ڕەوشتی پێغەمبەری دەكرد. پێغەمبەرﷺ بەتەنها وتـاربێژ نـەبووە، كە لەسەر دوانگە ئامۆژگاری خەڵك بكات، بەڵكو پێش ئەوە پـەروەردیارێك بـووە، خـۆی بووەتـە پێشـەنگ، ئامۆژگـاریش وەسیلەیەك لــە وەسـیلەكانی بـووە بـۆ گـەیاندنی بانگەوازەكـە بـە خەڵكـەوە.. بـەڵكو صەحابـەكان دەربـارەی خـودی پێغەمبـەرﷺ وتویانـە: جاروبـاری ئامۆژگـاریێ دەكردیـن، نـەك بێتاقــەت بـین! بێتاقـەتی لــەچی؟ لــە ئامۆژگاریـەكانیﷺ، لـە دەرونـی كێـدا؟ لـە دەروونـی صەحابـەكاندا! كـە هـەر وشـەیەكیان لـە پێغەمبـەرﷺ ببیسـتایە بـە حـەز و خۆشەویسـتیەوە وەریـان دەگـرت، چونكـە بڕوایـان وابـوو ئـەو وشـانە ڕێگـای بەهەشتیانە! ئەدی دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێت، كە مرۆڤی ئاسایین و كاتێ هەموو كەلوپەلەكانمان ئامۆژگاری و (ڕێنمایی) بێت!

ئایا ئامۆژگاری و ڕێنمایی بەتەنها دەشێت فەرز بكرێت، خــەڵك وەری بگرێـت و لێی بێزار نەبن، ئەو فەرزكردنە ڕاست نیە، ئایا دەشێت بەتەنها بەكاری بهێنین بـۆ چارەسەركردنی ئـەو نەخۆشـیانەی لـەوەپێش باسمـان كـردن، ئـەو نەخۆشـیانەی پێش ئەو داگیركاریەی لەوەو پێش و ئێستای چونە ناو قەدەری ئوممەتەوە؟ ئایا دەشێت بۆ چارەسـەركردنی بیرۆكـەی ئیرجائی، كـە كـردەوەی لـەناوی بـڕوادا

دەرهێناوە، خەڵکشیان بۆ ماوەیەکی دووردرێژ واتێگەیاندبوو، کە دەکرێ بڕواداربن، با کردەوەیەکیش لە کردەوەکانی ئیسلام نەکەن؟ ئایا ئامۆژگاری – بەتەنها– دەتوانێ ئەوانە بۆ کارکردن بەپێی پێویستیەکانی بڕوا بگوێزێتەوە، بەوەی کە بڕوا پێویستی بە هەوڵی زۆر و خۆگرتن لەبەر ناخۆشی و هەڵگرتنی باری لێپرسراوی هەیە و پێویستی بە پابەندی و ڕێك و پێکی هەیە؟!

ئەگەر ئەوە ببوایە، ئەدی بۆچی ڕووی نەداوە، خۆ ئێمە کەمتەرخەمیمان نەکردوە لە ئامۆژگاریکردن لە هەموو ڕۆژانێکی هەینی، لە بۆنەکان، لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا؟

ئایا ئامۆژگاری –بەتەنها– دەشێت بۆ دەرهێنانی ئەو کەسەی لە بیرۆکەی صۆفیدا نقوم بووە، هەروا بۆ تەبەڕوك کردن بە گۆڕەکان و بڕوابوون بەتوانای ئەولیا لەسەر دەرخستنی غەیب و کردنی کاری پەرجو(معجزة) کە پێی دەڵێن کەرامات؟ ئایا دەشێت بەتەنها بۆ دەرهێنانی ئەوانەی، کە نقوم بوون لە لارێبوندا؟

ئایا دەشێت بۆ گۆڕینی ئەوەی، کە خەڵك تێی کەوتون لەو بێسەروبەرییەی کە حەز بە یاسا ناکات و ئەکار لەخۆوەکردنەی کە حەز بە پلان دانان ناکات، هەروا بۆ ئەو پشی کورتیەی، کە خێرا هەڵدەچێت و خێرا دادەمرکێتەوە؟

ئایا دەشێت بۆ گۆڕینی ئەوەی کاربەدەستان تێی کەوتون لە گوێنەدان بەکارکردن و دواخستنی و بەحەڵاڵ دانانی موچە تەنها لەسەر ئامادەبوون لەکاتی دەوام و دوای کات و ڕۆیشتنەوە لەکاتی تەواوبوونی دەوامدا، یان پێش تەواوبوونی؟ هەروا دەشێت بۆ گۆڕینی کرێکار کە لەسەری ڕاهاتوون لە غەش و فێڵ کردن لەکاردا و دڵسۆزی نەکردن تێیدا بێچاودێری، لەگەڵ بەحەڵاڵ زانینی موچە، کە دانراوە بەپێی کاری تەواو بدرێت و کەموکوڕی تێدا نەبێت؟ هەروا دەشێت بۆ گۆڕینی ئەوەی خەڵك تێی کەوتون لە دواخستنی بەڵێن و پابەندبون پێی و هەست نەکردن بە تاوانباری لە دواخستنی نەك بۆ چەند چرکەیەك، بەڵام هەندێجار بۆ چەند سەعات، یان چەند ڕۆژ، یا چەند هەفتە و هەندێ جار هەتا کۆتایی ژیان؟!

وە ئایا.. ئایا.. ئایا..

ئامۆژگاریکەر دەڵێت: جگە لە ئامۆژگاری چیمان هەیە؟ ئێمە بەکاری خۆمان هەڵدەسین، تۆ ناتوانی هیدایەتی کەس بدەیت، هیدایەت لەخواوەیە!

بەڵێ هیدایەت لەخواوەیە! بەڵام خوا بەرنامەیەکی بۆ بانگەوازیی داناوە، پایەکانی پێشەنگی و پەروەردەیە، لەوەسیلەکانیشی ئامۆژگاریکردنە لەگەڵ پێشەنگی و پەروەردە، جا ئەو کاتە بە فەرمانی خوا ئامۆژگاری، بەروبومەکەی دەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا ناڵێین ئامۆژگاری بە تەنها هەرگیز بەرنادات، بەڵکو دەڵێین ئامۆژگاری بە تەنها ئەگەر، لە هەندێ باری کەم وێنەدا بشێت بۆ چاك کردنی خەڵك، ناشێت بۆ چاك کردنی ئوممەتێك، کە فەساد تێیدا گەیشتبێتە ئەوپەڕی، هەروا بۆ دامەزراندنی بانگەوازێك ناشێت، بیەوێت ئوممەتێك دروست بکاتەوە، کە گەیشتبێتە پلەی کەفی دەریا!

پەروەردەکردنی گیانیی(روحی) پێویستێکە، کە لە بنیاتناندا ناکرێ وازی لێبهێنرێت.. بەڵکو نایەتە بەر نیگا، کە کاری بانگەواز بێئەو بەرەهایی دابمەزرێت. ئەگەر بایەخماندا بە پەروەردەی گیانیی، بە قوڵکردنەوەی پەیوەندیکردن بەخوا و، دڵ نەرم کردن بۆ پەرستنی و، بیرخستنەوەی ڕۆژی دوایی و ، پەیوەست کردنی هەستەکانی بەو شوێنەی بەخوا دەکات.. بەڕاستی ئەوە بەشێکی دیار و بنەڕەتی بووە، لە کاری پێغەمبەرﷺ لە پەروەردەکردنی صەحابەدا﷢، بەتایبەتی لە مەککە کاتێ شەونوێژیان لەسەر فەرز کرابوو بۆ قوڵکردنەوەی ئەو پەیوەندیە و چەسپاندنی و ریشەداکوتانی.. بەڵام ئەوانە هەموو ئامادەکردن بوو، بۆ فەرمانێکی تر، ئەوە لەخۆیدا مەبەست نەبوو!

گەر باش سەرنجی سورەتی (المزمل) بدرێت، دەردەکەوێت، کە لەگەڵ فەرمان کردن بە شەونوێژ، ئاماژەیەکی ڕوون هەیە بۆ چەند ئەرکێکی داهاتوو، شەونوێژ کراوە بە پێشەکیەك بۆی و ئامادەکردن بۆ پێهەڵسانی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ۝٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا: ئەی ئەو کەسەی خۆت بە

جلكان داپۆشیوه ! شەو هەستەوه؛ مەگین کەمێ، لـه نیمەکەی؛ یان کـەمێکی لێ دابرە؛ یان کەمێکی دەسـەر بخە. ئـەم قورئانـه بـه لەسـەرخۆیی بخوێنـەوه و بـه ڕەوانی. بەم زوانه ئێمه وتارێ گرانت دەخەینه سەر.﴾المزمل:١-٥.

هەروەك حیکمەتی خوا له هەڵبژاردنی شەونوێژ بۆ ئەوەیـه ببێتـه ئـامرازێك بـۆ ئامـــــادەبوونی خـــــوازراو: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـًٔا وَأَقۡوَمُ قِيلًا: شەونخونی بـۆ ڕامانـێ جێدارتـره و بـۆ وتـاریش لـەبارتره.﴾المزمـل:٦، بـە واتـای کاریگەریی قوڵتره بۆ ئامادەکردنی دەرونەکان بۆ بەرگەگرتنی له ئەرکەکاندا.

کورتەی کارەکە ئەوەیه، کـه دەبێـت پـەیوەندی بـەخواوه قـوڵ بکرێتـەوه بـۆ ئەوەی مرۆڤ هەڵسێ بەو ئەرکانەی ئەو ئایینه بەشێوەیەکی تەواو لەسـەری فـەرز کردوون.

تایبەتمەندترینیان جیهاد و ئارامگرتنه لەسـەر تاقیکردنـەوەکان.. بـەڵام کاتـێ پەروەردەی ڕۆحی خۆی لەخۆیدا مەبەست بێت، یا کاتێ کۆتـایی هـەنگاو بێـت لـه کرداری پەروەردەدا چی دەبێت؟! وەك –چواندنەکـه جیاوازیـەکی کـەمی هەیـه– ئەو سەربازەی لێدێت، کـه لەسـەر هـەموو هونـەرەکانی جـەنگ مەشـقی کردبێـت، بەڵام نیازت نەبێت هەرگیز بینێریته جەنگەوه ! یان وەك ئەو بناغەیەی لێدێت، که باش بکوترێتەوه و نیازت نەبێت هیچ بینایەکی لەسەر دروست بکرێت!

بەڕاستی ئەم ئایینه کارەکەی گەورەیه.. ئەم ئایینه بەرنامەی پەروەردکاره بۆ چاکسازی هەموو ژیان و دروست کردنی مرۆڤی چاك، که هەڵسێت بە جێنشینیەتی لەرێ شارەزا له زەویدا.. ئەو ئایینه تەنهای زیکر و یادی ڕۆحـی نیـه، جـا قوڵایـی ئەو زیکر و یادانه هەرچەند بـن و، ئـەو یادانـه هەرچـەند ڕۆشـن بـن.. بـەڵکو ئـەو ئایینه تێکۆشان و جیهادە، ململانێیەکی توندوتیژه لەگـەڵ ناهـەقدا، بنیاتنانێکـه، که ناهەق دەڕوخێنێ و هەق بنیات دەنێ.. پەروەردەی ڕۆحیـش توێشـوی هـەموو ئەوانەیه، نەك مەبەستی مەبەستان بێت.

مرۆڤ لـه مـەیدانی ململانێـدا تێدەکۆشـێ و مـاندوو دەبێـت، پێویستیشـی بـه پاڵپشـتێك هەیـه گـوڕ و تینـی بداتـێ و نەیـەڵێت بکـەوێت و ئـەو سسـتیەی لێ دوربخاتەوه که توشی دەبێـت، ئـا لـێرەدا ئـەو وزه گیانیـه دەردەکـەوێت، که لـه

سستی دەپارێزێ و توانای خۆڕاگرتنی دەداتێ بەو وزەیەی پێی دەبەخشێ، کە لە کیانیشیدا پرشنگ دەداتەوە.

زۆرجار مرۆڤ لە مەیدانی جەنگدا هەست بە ترس دەکات، کاتێ دوژمنەکانی زۆر دەبێت و خۆی بەتەنها دەبینێ، یا ئەوانەی دەورووپشتی وەک خۆی بە لاواز دەبینێ و توانایان نیە سەری بخەن، جا لێرەدا ئەو وزە ڕۆحیە دەردەکەوێت، کە بە یادی خواوە خۆشی دی، ئیتر ترسی نامێنێ، بەروبومەکانی بەهەشتی لە ڕۆژی دوایی وەبیردێنێتەوە، ئەوکاتەش بە جدیەت تێدەکۆشێت.

ڕەنگە مرۆڤ لە مەیدانی ململانێدا خۆشی هەستداری و کەس و کار و هاوەڵ و کەلوپەلی نوستن و خواردنی تەواو لەدەست بدات، کە دڵی بۆ هەموو ئەمانە دەچێت، یان بە کەمێکیان و خۆی بە زەویەوە دەنوسێنێ. ئا لێرەدا وزە ڕۆحیەکە دەردەکەوێت، کە لە هەستیدا خۆ نوساندن بە زەوی هاوسەنگ دەکات و، قەرەبوی بێبەشبونی لەم خۆشیانە بە خۆشیەکی بەرزتر دەکاتەوە؛ ئەویش لەگەڵ خوابوون و، ڕەزامەندی خوا و، بەهەشتە.

ئەو وزە ڕۆحیە ئەو توێشووەیە، کە ڕێبوار پێویستی پێی هەیە بۆ ئەوەی گەشتەکەی بەدڵنیاییەوە تەواو بکات.. بەلام ئەگەر دانیشت و نەجولا نرخی توێشووەکە چیە!

ئایا پەروەردەی ڕۆحی -بەتەنها- هیچی لە واقیعی ئەو ئوممەتە گۆڕیوە، کە بەرەو نزمی ڕۆیشتوە؟

بەڵێ ڕاستە چەندەها کەس لە لەناوچوون ڕزگار دەکات و پەرژینیان بەدەوردا دەکات و دەیانپارێزێ لە لەناوچوون، بەلام ئوممەت لە لەناوچوون ڕزگار ناکات، چونکە سەربازەکانی پاڵ نانێت بچن بۆ مەیدانی ململانێ، هاوبەش نابن لەو پاڵنانەی، کە خوا فەرمویەتی: ئەو پاڵنان و لەناوبردنە ئامرازی پەروەردگارن بۆ پاراستنی زەوی لە خراپەکاری: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾: ئەگەر خودا هێندێکانی لەو ئاپۆرە بەهێندێکان تەرت و تونا نەکردایە، ئەم زەمینە خراببو؛ بەلام خودا چاکەی لەسەر هەمو خەڵکی دنیا هەیە.﴾البقرة: ٢٥١.

بارگـه(شـحن)ی سـۆزداریی لـه بانگـەوازیدا خـوازراوه.. خـوازراوه خـەڵك حەماسەتیان هەبێت بۆ ئەو شتەی، کە بڕوایان پێی هەیە وەك داری کلۆر نەبن نـە دەجوڵێ و نە جوڵان دروست دەکات، بانگەوازیی بەوێنـەی ئەوانـە بـڵاو نابێتـەوە، ئەگەر خۆیشیان بەدەمەوە بێن و پابەند(ملتزم) بن، بەڵام حەماسەتیش بـە تەنـها ناتگەیەنێ بە هیچ، بەڵکو زیانی زۆرتر دەبێت لەوەی سـودی هـەبێت! حەماسـەت زۆرجار لەسەر حسابی هۆشیاری(وعـی) دەبێـت و لەسـەر حسابی زانسـتی ڕاسـت دەبێت و لەسـەر حسـابی شـارەزایی(خـبرە) دەبێـت، لـێرەدا زۆر لـه چـاکی و جیاکاریەکەی لەدەست دەدات و، زیانی زۆری لێ‌پێك دێت، بەتایبەتی ئەگەر ببێـت بە دەمارگیری بۆ کەسێك، یا کۆمەڵێك، یا حزبێك، یا بیرۆکەیەك، یا مەزهەبێك، ئەو کاتە ئەو حەماسەتە دەروازەکانی زانستی بەکەڵك بەڕوی خاوەنەکەیدا دادەخات و کەللـەڕەقی و توندوتیـژی لـه دژایـەتی کـردن بڵاودەکاتـەوەو، پـاڵی دەنێـت بـۆ دەمەقاڵێ و مشتومڕی ناپەسند.

زۆر لـەو شـتانەی لــه گۆڕەپـانی ئـەمڕۆ ڕوودەدات، لــه پەرتـەوازەیی و پارچەپارچەیی و دژایەتی‌کردن، سەرچاوەکەی حەماسەتی زیاد لـه سنوری خۆی بۆ شتێکە، کە خاوەنەکەی وا دەزانێت هەقە و هەمو هەقە، جگـه لـەویش ناهـەقی تەواوە..

* * *

بەڕاستی هۆشـیاری فیکـری لـه گشـت کـاتێکدا هـەرە پێویسـتیە گرنگـەکانی بانگەوازە و لەم کاتەی ئێستاماندا لەهەموو کاتێك پێویستترە، جـا ئـەو تاریکیـەی چواردەوری ئیسلام و حەقیقەتەکانی گرتووە لە دەرونـی خـەڵکدا، لـەم نامۆییـەی دووەمدا تـەمێکی خەستی گشتگیرە، پێویستی بە هۆشیاریەکی گشـتگیر هەیـە بـە حەقیقەتـەکان و چەمکـەکانی ئیسـلام، لـه سـەرەتاوە بـه چـەمکی (لا الـه الا الله) دەست پـێ‌بکرێت و هۆشـیاریەکی خەسـت بـه پێویسـتیەکانی (لا الـه الا الله) و هەڵوەشێنەرەکانی (لا الـه الا الله)، هەرچـەندە هۆشـیاریی سـەبارەت بـه هـەموو چەمکـەکان خـوازراوە، جـا چـەمکی پەرسـتن بێـت، یـا چـەمکی قەزاوقـەدەر، یـا

چەمکی دونیا و ئاخیرەت، یا چەمکی ئاوەدانکردنەوەی زەوی، یـا چـەمکی پەروەردە، یا چەمکی جیهاد بێت، بەڵام ئەوەندەی تاریکی دەوری چەمکی (لا اله الا الله)ی داوە، ئەوەندە دەوری هیچ لە چەمکەکانی ئیسلامی نەداوە...

هەروەها هۆشیاریی بۆ زانینی واقیعی ئوممەت و زانینی ئەو هۆیانـەی بوونەتـە هۆی ئەو واقیعە خوازراوە، بەبێ ئەو زانینە، ناتوانین بەرنامەیەکی گونجاو دابنێین بۆ بانگەوازیی و ناتوانین هۆیەکانی چارەسـەرکردن دابنێین، زۆر کەسیش لـە زۆر حاڵەتی ڕاستەقینەی ئوممەت نازانن و ئاگادار نین، ئەگەر بـە گشتیش بزانن، کـە ئوممـەت لـە وێنـەی ڕاستی خـۆی لایداوە و، بەگشتی ئەمـەش پـاڵ بدەنە پـاڵ دورکەوتنەوە لـە حەقیقـەتی ئیسـلامەوە، بـەڵام مـاوەی دوریەکە لـە زۆر کـەس شاراوەتەوە و زۆربـەیان مەترسـی لادانەکـەیان دیـاری نـەکردووە، کـە چـەندە مەترسیدارە!

جارێکی تریش هۆشیاری پێویستە بۆ ئەوەی خەڵك لە فێڵ و پلانەکانی دوژمـن بۆ لەناوبردنی ئیسلام ئاگادار بن. زۆر خەڵك –لە بانگخوازەکان خۆشیان– بەدوای ئەوانەدا نـاچن، کـە لـە گۆڕەپانەکـەدا چ ڕوودەدات، بـەڵکو ئـەو پیلانـە نوێیانـەی دروستی دەکەن، بە پاڵپشتی ئەو زانیاریە گشتیەی، کە وا جولەکە و گاور دوژمنن و واز لە فرت و فێڵ کردن لە ئیسلام ناهێنن! ئەوەش بەتەنها بـەس نیە! چونکـە زۆر لـەو شتانەی خـەڵك و کۆمەڵــە ئیسـلامیەکان بەرەبـەرە چونـە نـاوی ئـەو هەڵوێستانەیە، کە خزمەتی بانگەوازەکە ناکەن، هۆکەشی بێئاگاییە لـەو فێڵانـەی دوژمنـان بـیری لێ دەکەنـەوە و پلانـی بـۆ دادەنێـن، بـەڵام دوژمنـان –بـە وەسیلەکانیان– ئاگادارن و دەزانن بە نـهێنی و ئاشکراکانی موسڵمانان، چـی بـە وردی بەدوای ئەوانەدا دەچن، کە لە جیهانی ئیسلامیدا پەیدا دەبێت، لـە بزاف و فیکرەکـان، جـا بەزانینـەوە خۆیـان پـلان دادەنێـن، ئێمـەش تەنـها لێدانـەکانمان بەردەکەوێت!

بەڕاستی هۆشیاری فیکری لەم کاتەدا، لە هەرە پێویستیەکان پێویست ترە بۆ بانگـەوازیی، بـەڵام –بەتەنـها– نابێتـە هـۆی شـتێکی حـەقیقی لـە واقیعـی بزوتنەوەکەدا، ئەگەر نەبێتە توێشو بۆ بیروباوەڕێکی ڕاست و بزافێکی هۆشیار، کە

زانستی زیاد بکات و خلیسکانەکانی ڕێگای نیشان بدات، بەڵام کاتێ هۆشیاریەکە دەگۆڕێت بۆ ڕۆشنبیری –ڕۆشنبیریەکی ڕووت– ئەوا بۆ خۆشیەکی ژیریی دەبێت، کە واقیعی دەروونەکان ناگۆڕێت.

*　*　*

پەروەردەی جیهادی لە پێویستیەکانی بزوتنەوەیە، جا ئەو کەسانەی دەرون خاو و شلن، توانای ئەرکەکانی جیهادیان نیە، شیاوی بانگەوازگرتنە ئەستۆی نین، شیاو نین بۆ جوڵان لە ناو دڕك وداڵ و بەرەنگاربوونەوەی ئەو دڕندانەی دەمیان کردۆتەوە و کەڵبەکانیان درێژ کردووە بۆ خواردنی سەربازانی بانگەوازیی و، کوشتنیان دوای ئەوەی سزای بەئێشیان دەدەن.

بەڵام پەروەردەی جیهادی –بەتەنها– بەس نیە بۆ دامەزراندنی بانگەوازیی، تەنانەت سزادانی بە ئێش و ئازار بانگەوازەکەی لە دوژمن پێ ناپارێزرێت، بەڵکو زۆرجار دەبێتە هۆی ئەوەی لەلایەن دوژمنەوە بە توندوتیژی لێی بدرێت، کاتێ شارەزایی رامیاری و بزاڤی کەم بێت و بێئاگا بێت بە راستیی جەنگ و راستیی دوژمنان و نەزانێت چەند هەوڵ و کۆششی پێویستە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن ئەو هەوڵەش کە پێویستە بۆ جەنگەکە. هەروا نەزانێت کام روداو مەترسیدارە کە لەو بزوتنەوانەدا ڕوودەدات، کە پشت بە پەروەردەی جیهادی دەبەستن. یان لە هەموو پێویستیەکانی تری پەروەردە زیاتر تەرکیز دەکاتە سەر لایەنی پەروەردەی جیهاد و پەلە دەکات لە بەیەك داندا –یان وردەوردە دەچنە ناو بەیەکدادان– پێش ئەوەی راستی کێشەکە بۆ خەڵك ڕون ببێتەوە، ئەویش کێشەی (لا اله الا الله)یە، هەروەها پێش ئەوەی ڕێگای تاوانکاران ڕون بێتەوە، وەك لە قورئاندا باسکراوە. ئەو کاتە بزوتنەوەکە بەر لێدانی کوشندە دەکەوێت و خەڵکیش لەولاوە سەیری دەکەن، ڕێ بۆ ستەمکارەکانیش خۆش دەبێت گاڵتە بە ((جەماوەر)) بکەن و پێیان بڵێن: ئێمە دژی ئیسلام ناجەنگین، بەڵکو دژی ئیرهاب دەجەنگین..

*　*　*

جا لەپێناوی هەمو ئەمانەدا بەو شێوەیە بەسەر پەروەردەی لەسەرخۆی

گشتگیردا سەرکەوت، ئەو پەروەردەیەی بە دروستکردنی بنکەی پتەو دەست پێدەکات و پاشان هێدی هێدی فراوان دەبێت، ئەگەرچی چەند نەوەیەکیش بخایەنێت!

بەڕاستی سەرجەم ئەو نەخۆشیانەی توشی ئوممەت بوو، گوڕی بە کەفێك وەك کەفی لافاو، پاشان دوژمنیان بۆ هێنا و دەمیان تێژەنی، وەك چۆن چەند کەسێك بکەونە سەر قاپێك خواردن، ترسناکترە لەوەی بە ئامۆژگاری و ڕێنمایی گیانی یان بارگەی سۆزداری، یان هۆشیاری فیکری، یان پەروەردەی جیهادیی، چارەسەر بکرێت، ئەگەر هەریەکەیان بە تەنها بەکارهات لەسەر ئەو بنەڕەتەی، کە چارەسەرکردنی خێرایە و ئوممەت ڕزگار دەکات لەوەی تێیکەوتووە و لە بارێکە و دەیگۆڕێت بۆ بارێکی تر.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان نۆژەنکردنەوەی بەشێکی بینایەکی دامەزراو نیە، بەڵکو مەبەستمان نوێکردنەوەی بناغەکەیە بۆ ئەو بینایەی، لە ڕوخاندایە، هەموو نۆژەنکردنەوەیەکیش نرخ و سودەکەی لەدەست دەدات، ئەگەر بناغەکەی نوێ نەکرێتەوە.

بناغەی ئەم ئایینە (لا اله الا الله)یە.

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۝ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ: نەتدی خودا چلۆن نمونە دێنێتەوە؟ قسەیەکی بەڕێ وجێ، بە شەنگە دارێك دەشبهێ، ڕەگی قایم داکوتاوە و لقی لە تەشقی ئاسمانە. بە ئیزنی ڕاهێنەرەکەی خۆی چوار فەسڵە میوەی دەبێ. خوا نەزیلان بۆ ئەو خەڵکە دێنێتەوە، بەشکو پەندی لێ وەرگرن.﴾ابراهیم: ٢٤–٢٥.

پرسیارێك کێشەکە بەڕونی و بڕاوەیی و بێتەم دیاری دەکات: ئایا خەڵك – جگە لەوانەی پەروەردگارت ڕەحمی پێکردوون– ئاگایان لە حەقیقەتی (لا اله الا الله) هەیە؟

وەڵامەکەی لای من ڕوون و ئاشکرایە..

بەڕاستی زۆر لە بانگخوازان خۆیان تەم و تاریکی چڕیان دەربارەی کێشـەی (لا الـە الا اللە) لەدڵدایـە، بەتایبـەتی دەربـارەی هەڵوەشـێنەرەکانی (لا الـە الا اللە)، چونکە خۆیان هێشتا ڕزگار نەکردووە لە بیرۆکـەی (ئیرجائی)، کـە کـردەوەی لـە ئیمان دەرهێناوە.

زۆر لـە بـانگخوازانیش هێشـتا گرفتـی ڕاسـتەقینەی (جـەماوەر)یـان نـەزانیوە، هەروا ماوەی دووریان لە حەقیقەتی ئیسـلامەوە، لەبـەر ئـەوە لـە کۆکردنـەوەیان و جوڵاندنیاندا پەلەیان کردووە، پێـش ئـەوەی حەقیقـەتی ئـەو کێشـەیەیان بـۆ ڕوون بێتەوە کە بانگەوازی بۆ دەکەن و لەپێناویدا کۆدەبنەوە!

جا لەپێناو ئەمەدا پێداگیری دەکەین لەسەر ئەوەی، کە خاڵی دەست پێکردن؛ دروسـتکردنی بنکەیـەکی پتـەوە لەسـەر ئـەو بەرنامەیـەی پێغەمبـەرﷺ بنکـە پتەوەکەی پێدروست کرد، هەرچەندە مەحاڵە ئەمە بگاتە ئـەو ئاسـتەی، کـە ئـەو بنکەیە پێی گەیشت! لەهیچ نەوەیـەك داوا نـاکرێت بگاتـە ئاستی ئـەو نەوەیـە.. بەڵام پەیڕەو و بەرنامـە(منـهج) شـتێکی تـرە ..، مەنهـەج چەسـپاوە و نـاگۆڕێت و پـەروەردە لەسـەر بنەڕەتیـەکانی ئـەرکێکی هەمیشـەییە نـاگۆڕێت، جـا ئاسـتی پەروەردیارەکە و ئەوانەی پەروەردەکەیان پێدەدرێت، گەیشتنبێتە هەر ئاسـتێك، هەریەکەش بە پێی کردەوەکەی چەند پلەیەکی هەیە.

وانـەی یەکـەم لـە دروسـتکردنی بنکـەی پتـەودا، وانـەی (لا الـە الا اللە) بـە بـە زانستیەوە، هەروەها پەروەردەکردن لەسەر پێویستیەکانی، بۆ ئامـادەکردنی ئـەو بانگخوازانـەی بنکــە فراوانەکـە ڕێنمـایی دەکـەن، کاتــێ ڕۆڵــی ئاڕاسـتەکردنی بانگەوازەکە دێت، کە بەرەو ڕووی جەماوەر بکرێتەوە..

# واقیع و نمونە

وەك رون و ئاشكرایە واقیع و نمونە زۆر لەیەك جیاوازن.

پێشتر هەندێ لە هۆیەكانی ئـەو جیاوازیـەمان خستەڕوو، كـە لـەنێوان ڕوداو و نمونـە هەیـە، ئـەو روداوانـەی بـە كـردەوە ڕوویـداوە و، ئـەو نمونەیـەی پێویسـتە كارەكانی لەسەر بڕوات و، هەندێ لەو ئەنجامانەی، كە لەسەر ئەو جیاوازیە بـەدی هاتبوو.

لـێرەدا دوای ئـەوەی بـەدرێژی دوایـن لەسـەر بەرنامـەی پێغەمبـەرﷺ بـۆ دروستكردنی بنكەی پتەو و، پاشان فراوان كردنی بنكە(قاعدة)، بە یارمـەتی بنكـە پتەوەكە، لەژێر سەرپەرشتی خۆیداﷺ، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ كەمێك درێژەدان بـە دروست بوونی جیاوازی نێوان و واقیع و نمونە.

دیارە پەلەكردن سروشتی گشتی بزاوتنی رابونی ئیسلامیە، هەر لەو كاتەوە كە دامەزراوە، هەروا لە دروست كردنی بنكە(قاعدە)دا پەلەكراوە.

ئەگەر لە سەرەتاوە بەڕاستی بیرمان بكردایەتەوە لەو كەلێنانەی كەوتبونە نـاو ئوممەتـەوە و ئـەو كەلێنانـەی نامۆییەكـەی ئیسـلامی دروسـت كردبـوو لـەنێو ئەهلەكەیدا و، بیرمان بكردایەتەوە لەوەی چۆن نەتەوەكانی تر لە هەموو لایەكەوە دەمیان ژەنـی بـۆ ئیسـلام، بـیرێكی ڕاسـتمان وەربگرتبـا دەربـارەی ئـەو هەوڵـەی پێویست بوو بۆ چاك كردن و گرتنی ئـەو كەلێنـە گەورەیـەی، كـە كەوتبوونـە نـاو پێكهاتەی ئوممەتەوە. هەروەها بیرێكی ڕاستمان وەربگرتبا دەربارەی ئـەو هەوڵـە گەورەیەی دوژمن داوێتی بۆ لەناوبردنی ئیسلام لـە پـلان و خۆئامـادەكردن؛ ئـەوا بۆمان دەردەكەوت، كـە دەبوایـە لـە بزوتنـەوەدا زۆر لەسـەرخۆ بوینایـە و لـە ڕێ ڕۆیشتن دا پەلەمان نەكردایە.

لێرەدا دەپرسین دەڵێین ئایا كاتێ بانگەوازمان دەست پێكـرد ئـەو شـێوازانەی پێویستێ لە بنكە پتەوەكەدا لـەناو مێشـكماندا ڕوون و ئاشـكرا بـوون؟ ئایـا پێـش

ئامـادەکردنی بنکەکـە ئـەوەشمان لا ڕوون بـوو، ئەگـەر بانگـەواز بـەرەوڕوی ((جـەماوەر)) بکرێـت توشـی چ هەڵوێـستێکی بەزەحمـەتمان دەکات، کاتـێ ئـەو جەماوەرە رادەپەڕێت بەسۆزە شەحن کراوەکەیەوە؟ پاشان نە ڕێنماییکەر و نە پـەروەردیارانیان دەسـت دەکـەوێت، چونکـە ئێمـە نـە ڕێنماییکـەرین و نـە پەروەردیارین بۆ ئەوەی جەماوەر بکەینـە هـی خۆمـان؟ ئایا لـە بیرماندا ڕوونـە، کۆکردنـەوەی جـەماوەر بـە عاتیفـەوە، بـەبێ پـەروەردەکردنی ڕاسـت، ئـەنجامی ترسناکی دەبێـت لـە ڕێـڕەوی بانگەوازەکـەدا، کاتـێ کاربەدەسـتانی نـاوەخۆ و جیهانیی هەراسان دەبن، توڕە دەبن و دەکەونە لێدانـی ئـەو خەڵکـە، لـە کاتێکدا خەڵکەکە هێشتا ئامادە نەبوون لێیان بدرێت، تەنانەت بنکەکە خۆی هێشتا ئامادە نەبووە، بۆ ئەوەی وەبەر لێدان بکەوێت؟

بڕوام وایە لەدیدی واقیعی کاروانەکەدا، ئەم کارانە بـەپێی پێویسـت ڕوون نیـە، چونکە بنکە کە خۆی لەسەر ئەو کەرەسەخاوانە پێکهاتووە، کە ئەو کاتە هەبووە. شتێکی ڕاسـتە، کـە نـابێت هیـچ کـاتێك، بانگـەواز بـەو کەرەسـەخاوانەی ئەوکاتـە هـەبوون دەسـت پێبکـات، ئـەوەش شـتێکی بەڵگەنەویستە. بـەڵام دەبێـت ئـەو کەرەسە خاوانە بەچاکی پاکبکرێنـەوە، پێویسـتە بایـەخ و گرنگـی زۆر بدەین بـۆ ئامـادەکردن و پاککردنـەوەی لـە خڵـت و خاڵـەکانی، پێـش ئـەوەی ئـەرکی کـاری بانگەوازەکـەی بخرێتـە ئەسـتۆ، بەتایبـەتی ئەگـەر بانگەوازەکـە لـە هـەمان ئـەو نامۆییەدا بێت، کە ئیسلام لەسەری بوە و، ڕووبەڕووی هەمان دژایەتی ببێتەوە، کە لەلایەن دوژمنەکانەوە بەرەو ڕوی کراوە..

ئێستا ئێمە لۆمە و سەرزەنشتی کەس ناکـەین، هـەموو کردەوەیـەکیش لـەڕێی خوادا بێت، بە ئیزنی خوا پاداشتی هەیە، بەڵام ئێمە تەنها ماوەی جیاوازی نێـوان ئەوەی بووەو، ئەوەی پێویستە ببێت ڕون دەکەینەوە.

بێگومـان بـانگخوازی یەکــەم –رەحمــەتیخوای لەســەربێت و، خــوا جــەزای بەخێری بداتەوە بەوەیپێشکەشی کردووە– بەڕاستی هەوڵێکی بەرچاوی داوە بـۆ پاڵفتەکردنی کەرەسەخاوەکان لەو شتە خراپانـەی کە بـە کۆمەڵگە هەڵواسراوە، پاشـان هاتووەتـە سـەر کۆمـەڵ، جا لــە دەرونیـاندا ئـەو شـتە تـاك(فـرد)یـە

بەرتەسکانەی قەتیس بوون بەدەرناوە و، پەروەردەی کردوون لەسەر گیانی گەلەکۆمەیی یەکتروێست و یەکڕیز و یارمەتیدەر و، بە شێوەیەك برایەتی ئیسلام بیانبەستێ بەیەکەوە و، دەریان بێنێ لە سەرقاڵبوون بە پەرستنە تاکیەکانی کورت هەڵاتو لە دروشمەکانی پەرستندا، بۆ پەرستن بەو واتا فراوانەی، کە کاری فەرمان بەچاکە و بەربەستی لەخراپە دەچێتە ناوی و، دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان، کە بە شەریعەتی خوا حوکم بکات، وەك چۆن پەروەردەی کردن لەسەر زۆر ڕەوشتە جوان و پەسندەکان، لەسەر گیان بەخت کردن بۆ ئایینی خوا.

بەڵام واقیعی کاروانەکە پیشانمان دەدات کە ئەوەی کەموکوڕی گەورە هەیە، لە هۆشیاری ڕامیاری و هۆشیاری حەرەکی.. لەوەش ترسناکتر بوونی کەموکوڕی لە هەستکردن بە ڕاستی کێشەکە و ڕاستی ئەو ئامانجەی هەوڵی بۆ دەدەین.

ئێمە هەوڵمان داوە بۆ پێکهێنانی بنکەیەکی جەماوەری فراوان، بۆ ئەوەی پشتیان پێببەستین بۆ گەیشتن بە حوکم، لەسەر ئەو بناغەیەی کاتێ گەیشتین بە حوکم، شەریعەتی خوا جێبەجێ بکەین..

ئەوە خۆی لەخۆیدا ئامانجێکی مەشروعە، تۆ واز بێنە لەو هەڵوێستە جاهیلیەی، کە دەڵێت هەموو مرۆڤێك مافی هەیە هەوڵ بدات بۆ گەیشتن بە حوکم.. جگە لە ئیسلامیەکان! دەڵێت ئەوان بە تەنها کاتێ هەوڵ بدەن بگەن بە حوکم دەبنە تاوانکار! تۆ لەوە گەڕێ، ئەوە هەڵوێستێکی ناسراوی جاهیلیەتە بەرامبەر بە هەق، لەو کاتەوە نەفامی لە زەویدا هەیە و بانگخوازان بانگەواز دەکەن بۆ هەق (شنشنة نعرفها من اخزم: خووڕەوشتێکە لە ئەخزەمیەوە دەناسین) وەك پەندێکی عەرەبی بەناوبانگ دەڵێت! جا ئەو ((ئەخزەمە)) چ لە ڕۆژهەڵاتەوە بێت، یا لە ڕۆژئاواوە، یا لە ناوخۆی وڵاتەوە بێت!

بەڵام کێشەکە لە مەشروعیەتی ئامانجەکەدا نیە.. بەڵکو لە پرسیارێکی بنەڕەتیدایە: ئایا پیادەکردنی شەریعەت بەسە بۆ چاکسازی حاڵی ئەو ئوممەتەی، کە گەیشتۆتە ئەوەی ببێتە کەفێك وەك کەفی لافاو، یا کارەکە پێویستی بە شتی تر هەیە، پێش ئەوە و دوای ئەوە و لە کاتی ئەوەدا؟!

ئەگەر بانگخوازی یەکەم -ڕەحمەتی خوای لێبێت- ئەوەی بۆ کۆمەڵە

پاكیزه(صفوة)كەی هەڵبژێردرابوو ببێتە دەستەی دامەزرێنەری كۆمەڵەكەی ئاشكرا بكردایە، كە لە ساڵی ١٩٤٨ز بۆ ((جەماوەر))ی ئاشكراكرد (واتە دوای بیست ساڵ لە دەست پێكردنی بانگەوازەكە)، ئەوا لە هێڵی بەرەوپێش چوندا زۆر شت دەگۆڕا.

لەساڵی ١٣٦٧ك(١٩٤٨ز)دا و لەژێر ناونیشانی (معركة المصحف)دا پێشەوای شەهید وتویەتی: ((گومان لەوەدا نیە ئیسلام ئایینە و دەوڵەتیشە، بەڕوونی واتای ئەو دەربڕینە ئەوەیە، كە ئیسلام یاسایەكی خواییە بە فێركاریەكانی مرۆڤایەتی و یاساكانی كۆمەڵایەتی‌یەوە هاتووە، كە پاراستنی و بڵاوكردنەوەی و سەرپەرشتی جێبەجێ‌كردنی خراوەتە ئەستۆی ئەوانەی بڕوایان پێی هەیە و، گەیاندنی بەوانەی بڕوایان پێ‌نەهێناوە؛ لە ئەستۆی دەوڵەتدایە، واتە خراوەتە ئەستۆی ئەو حاكمەی بووەتە سەرۆكی كۆمەڵی موسڵمانان و حوكمی ئوممەتەكەیان دەكات، ئەگەر حاكمەكە كەمتەرخەمی كرد لە پاراستنی ئەو یاسایانەدا، ئەوا بە حاكمی موسڵمانان دانانرێت، ئەگەر یاساكانی دەوڵەت ئەو ئەركەی پشت گوێ خست، ئەوە بە دەوڵەتی ئیسلامی ناژمێردرێت.. ئەگەر كۆمەڵەكە، یا ئوممەت ڕازی بن بەو پشت گوێ خستنە و ڕەزامەندی دەرببڕن، ئەویش بە ئیسلامی ناژمێررێت، با بەدەم بڵێت ئیسلامیم.

لە مەرجەكانی حاكمی موسڵمان ئەوەیە، كە خۆی دەستی بە فەرزەكانی ئیسلامەوە گرتبێت، دوربێت لەو شتانەی خوا حەرامی كردون، تاوانە گەورەكان نەكاتن ئەوەش بە تەنها بەس نیە، بۆ ئەوەی بە حاكمی ئیسلام دابنرێت، هەتا مەرجەكانی دەوڵەتەكەی لەگەڵ خۆ، یا پاراستنی حوكمەكانی ئیسلامی لەنێوان موسڵماناندا نەخرابێتە ئەستۆ و، هەتا هەڵوێستی دەوڵەتەكەی لەوانەوە بۆ دیاری نەكرێت، كە خۆیان لە بانگخوازانی ئیسلام بن)).[1]

ئاخۆ ئەگەر لەسەرەتاوە ئەوەی ئاشكرا بكردایە، ئایا جەماوەر بەو شێوەیە لەڕێگای عاتیفەوە دەردەپەڕین و بەدەوریا كۆدەبونەوە، هەتا گەیشتە نیو ملیۆن

---

١ سەیری ژمارە ٦٢٧ ڕۆژنامەی (الاخوان المسلمین)ی ڕۆژانە بكە، ساڵی سێیەم، یەك شەممە ٧ی ڕەجەبی ساڵی ١٣٦٧، ١٦/ مایو/١٩٤٨ بكە.

کەس، کە بەشی زۆریان گەنج بوون، لەناو گەلێکدا، کە ئەو کاتە لە نۆزدە ملیۆن کەس تێنەدەپەڕی؟ یان ئایا ئەو کۆمەڵە(پاکیزە) خۆی بەو ئاسانیە ئاوا کۆدەبونەوە. ئایا بەخۆیان و عاتیفەیانەوە بەرەو ئامانجە گەورەکە دەڕۆیشتن؟

بڕوا ناکەم..

پاشان ئایا هەر لەو کەسانە پێك دەهات، کە لەوان پێکهاتبوون، یان کەسانی تر دەبوون؟

نازانم! کەسیش بە دڵنیاییەوە ناتوانێ بڕیاری لەسەر بدات.

بەڵام هەر کەسێکی ئەوانە بونایە، کە ئەو کاتە بنکە(قاعدە)یان لێ پێکدەهات، ئەوا توندوتۆڵتر و ڕاوەستاوتر دەبوون، زیاتر بەئاگاتر دەبوون، پشی درێژتر دەبوون، کەمتر پەلەیان دەکرد لەوەی، کە لەپێشەوە کردبویان، ئەوا بە عاتیفەکانیانەوە ملیان نەدەنا و بڕوایان وا نەدەبوو، ئامانجەکە بە ئاسانی بەدەست دێت و بەدەست هێنانی نزیك دەبێت، ئەو کاتەش خۆیان و ئەعصابیان دەکردە سەرباز، وەك زۆریان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کردیان، بڕوایان وادەبوو، کە هەموو شتێك لە میانەیدا دێتە ئەنجام بەهۆی ئەو وەسیلانەی ئامادەیان کردوە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە.

هەروەها دەیانزانی ڕێگا دووروودرێژە، کۆششی خوازراویش لەوپەڕی گەورەییدایە، هۆ(وسیلة) خوازراوەکان زۆر زۆرترن لەوەی ئامادەکراوە.. چونکە مەبەست تەنها نۆژەن کردنەوەی ئەو بینایە نیە کە هەیە، بەڵکو دوبارە چەسپاندنی بناغەکەیە.

بڕوا ناکەم لەگەڵ ئاشکراکردنی ڕێبیرەکاندا، جەماوەر ئاوا بێتە پێشەوە! چونکە دەیانزانی کێشەیەکە زۆر ترسناکترە لەوەی تەنها گوێگرتن بێت لە قسەی کاریگەر و سۆزی دەروون پڕکردن، کە پێیان دەوت (الرّوحانیة)[1] و خۆشی وەرگرتن لە بەیەك گەیشتنی خۆشەویستان و گەشانەوە بەو زۆریەی بەردەوام زۆر دەبوو.

هەروەها جەماوەر دەیزانی ئەوە ململانێیەکە لەگەڵ نەفامیدا، کە مرۆڤ توشی

---

١ ڕاستیەکەی بریتیە لە (الرُّحانیة) کە بۆ گیان دەگەڕێتەوە.

زۆر مەترسی دەكات، كە نابێ بابای ژیر(العاقل) خۆی بخاتە بەر ئەو مەترسیانە: ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ: دەڵێن: ئەگەر لەگەڵ تۆ بین و پەیڕەوی دینەكەی تۆ بین، لە زێدی خۆمان دەرمان دەكەن.﴾القصص:٥٧.

ئەوكاتەش بزوتنەوەكە لەسەرخۆ بەرەوپێش هەنگاو دەنێت، بەڵام لەسەر بەرنامەیەكی ڕاستتر! ئەو كاتە بنكەی پتەو لەسەرخۆ لەو پیاوانە پێكدێت، كە بەچاوی وردبینیەوە هەڵیدەبژاردن، كە چاكترین كەرەسەی خاو نەبوایە هەڵی نەدەبژارد، پاشان بۆ ئامادەكردنیان هەوڵی پێویستی دەدا بۆ ئەوەی ببنە ناوكێكی چاك، بۆ كاركردن بە پەروەردەی گیانی و ڕەوشتی و فیكری و دەرونی، هەروا پەروەردە بە زانستی شەرعی ڕاست، لە سێبەری بەرنامەی خوای گەورەدا: ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ: هەتا لە مەككەن شەڕ مەكەن، نوێژ بكەن و زەكات بدەن..﴾النساء:٧٧.

كاتێ بنكەكە فراوان دەبوو، كە كاتی فراوان بوونی بهاتایە، دوای ئامادەكردنی بنكەی پتەو بەو سەربازانەی، كە خۆیان كردبووە سەرباز بۆ بانگەوازەكە بە ڕۆشنبینی لە حەقیقەتی كێشەكە و پێویستیەكانی و، بە هۆشیاریەكی ڕاست لە حاڵی ئوممەت و ئەو نەخۆشیانەی دوچاری بووە و، ئەندازەگیریەكی دروست بۆ سروشتی كاركردن، بۆ هەر قۆناغێك لە قۆناغەكانی بزوتنەوەدا، ئەوەش پێش ئەوەی ڕوو بكرێتە جەماوەر بەگشتی، بۆ ئەوەی پەیوەندی بكەن بە بانگەوازەكە و لەژێر ئاڵاكەیدا بن.

(كاری سیاسی) واتا كاركردن بۆ كێشە نیشتمانیەكان و كۆمەڵایەتیەكان و هاوشێوەكانیان، بەڵام ماوەیەك دوادەكەوێت، هەتا بنەما ڕاستەكە بە تەواوەتی جێگیری ڕاست دەبێت، كە تێیدا بیروباوەڕی ڕاست و پەروەردە لەسەر پێویستیەكانی، خۆی دەنوێنێت لە چواردەورەی ئەوانەی وەڵامی بانگەوازەكەیان داوەتەوە و، خۆیان كردۆتە سەرباز (وەك ئەوەی كۆمەڵەكەی پێغەمبەرﷺ لە مەدینە لەسەری بون).

پاشان ململانێیەكە دروست دەبوو! ئەوەش كارێكە ڕاكردن نیە لە

دروستبوونی، بەپێی ئەو ڕێوشوێنانەی خوا دایناوە لەژیانی مرۆڤایەتیدا! ئەو ململانێیەش هەمیشە لە لایەنی جاهیلیەتەوە دەست پێدەکات، کاتێ هەست دەکات بە مەترسی بونی کۆمەڵێك بڕوادار لە زەویدا، با ژمارەشیان کەم بێت، ئەگەریش لەلایەنی خۆیەوە حەزنەکات بچێتە ناو ئەو ململانێیەوە: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٌ قَلِيلُونَ ۝ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ ۝ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ: ئەوان کۆمەڵەیەکی هێندکن، بەڕاستی کە ئێمەیان تورە کردوە، ئێمە هەموو وریایانین.﴾الشعراء:٥٤-٥٦.

بەڵام پێشبینی دەکرا ململانێکە لە ژوان(موعد)ی خۆی دوابکەوتایە لەو کاتەی کە تێیدا ڕوویدا، کە هەلێکی گەورەی دەبەخشی، بۆ پەروەردەکردنی بنکەی پتەو، پاشانیش پەروەردەکردنی بنکە فراوانەکە بە ئەندازەی ئەو پەروەردەیەی کە دەڕەخسێ.

پاشان ئەگەر ئەو ململانێیە بکەوتبایە سەر ئەوانەی جەنگ ناکەن، هیچ شتێکیان نەدەکرد، تەنها دەیانوت: (خوا پەروەردگاری ئێمەیە)، جا ئەوە دەبووە هۆی ئەوەی هۆشیاری (جەماوەر) بەڕاستی کێشەکە زو گەشە بکات، ئەو کێشەیە لە زەینیاندا لەگەڵ کێشەی تر تێکەڵ نابێت، وەك چۆن بەو کێشانە تێکەڵ بوون.. هەروەها زەحمەت دەبوو لەسەر ستەمکاران، وا لە خەڵك بکەن بچن بەدەمیانەوە، جا چ بە زۆر بێت، یا بەهۆی هۆکانی ڕاگەیاندنی سەختەکارەوە. کاتێ ڕێگای ستەمکاران بە ئایەتەکانی خوا و، لەسەر بەرنامەی ڕێکی پەروەردگار بۆ خەڵك ڕون دەبێتەوە، ئەو کاتە خەڵك دەزانن لەسەر چ بنەمایەك بڕیاری هەڵوێستی خۆیان بدەن: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ: ئێمە ئاوا نیشانەکانی خۆمانیان بۆ شی دەکەینەوە و دەمانەوێ ڕێبازی تاوانباران ڕون بێتەوە.﴾الأنعام:٥٥.

*　　*　　*

بەڵام ئەوەی ڕوویدا پێچەوانەی ئەوەبوو.

ڕاگەیاندنەکە لە وادەکەی خۆی بیست ساڵی تەواو دواکەوت، لەو ساڵانەدا

جەماوەرێکی زۆر بە لێشاو هاتنە ناو بزوتنەوە، بۆ ئەوەی هەست بکەن چەند مەترسی دەوری‌داون! بانگەوازەکە تێکەڵی زۆر کێشەی رامیاری و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بووە، کە هێشتا بۆ (لا اله الا الله) دڵڕاست و یەکلا نەبۆتەوە، بەڵام بە بڕوای ئەوانەی بە بانگەوازیی هەڵدەستن، کە ئەمە بانگەوازەکە جێگیر دەکات بە فراوان کردنی بنکە جەماوەریەکەی و، دەبێت لە کارەکەدا جەماوەر بەشدار بکرێت، ئەویش بە لێکۆڵینەوەی ئەو کێشانەی لەو کاتەدا جەماوەر سەرقاڵ دەکات، هەتا لە ساڵی ١٩٤٨ز لە فەلەستین بۆمبایەك هەموو هەڵوێستەکانی تەقاندەوە.

لەو کاتەدا هێرشی دڕندە بۆ سەر بزوتنەوەکە دەستی پێکرد بە دڕندەترین شێوە، کە بە زەیندا بێت.

بەڵێ جەنگ بۆ سەر بانگەوازەکە پێشبینی کراو بوو، چونکە وەك وتمان شێوەی کارێکە لە شێوەکارەکان(سنة)ی خوایە، پێشەوای شەهید بە هاوەڵەکانی و شوێنکەوتوەکانی دەوت: (حەز دەکەم بەڕاستی پێتان بڵێم، کە بانگەوازەکەتان هێشتا لای بەشی زۆری خەڵك نادیارە، کاتێ بیناسن و مەرام و ئامانجەکانی بزانن، دژایەتیەکی توندوتیژمان بەرامبەر دەکەن، زەحمەتی و ناخۆشی زۆر دێتە رێگاتان، زۆر لەمپەر و ئاستەنگ رێتان پێدەگرێت، جا تەنها لەو کاتەدا دەست دەکەن بە بانگەوازەکەتان و رێگای خاوەن بانگەوازان دەگرن.)[1]

بەڵام ئەو شێوەیەی جەنگەکەی پێتەواو بوو، بەبیری کەسدا نەدەهات.

جا هەر لەو کاتەوە و تا ئێستاش، بەدوای یەکدا سەربڕین دەستی پێکرد.

بەڕاستی رۆژئاوای خاچپەرست بە دیاریکراوی شوێنی ترسناکی بۆ دەرکەوت، کە ئەویش ئیسلامی سیاسی‌یە، کە قەناعەت ناکات ئیسلام تەنها دروشمی پەرستن و هەستی دڵ بێت، بەڵکو دەیەوێت بەرنامەیەکی پیادەکراو بێت لە واقیعی زەویدا، کە حوکمی هەموو ژیانی خەڵك بکات: لە سیاسەتیدا، لە ئابوریدا، لە کۆمەڵایەتیدا، لە فیکریدا، لە رەوشت و ئاکاریدا، لە هەموو بوارێك لە بوارەکانیدا! جا ئایا —لە

---

١ کۆمەڵێك لە نامەکانی شەهید حەسەن البنا، دامەزراوی ئیسلامی بۆ چاپکردن و رۆژنامە و بڵاوکردنەوە—بیروت— چاپی ٣، ١٤٠٣ك ١٩٨٣ز ل١٠٨

روانینی ڕۆژئاوادا– لەسەر ڕوی زەوی لەوە مەترسیدارتر هەیە ؟[1]

کەواتە دەبێ لەناوببرێت.. دەبێ هەموو هێزەکان دژی بوەستن.. دەبێ سۆراخ بکرێت و ڕاوەدو بنرێت.. دەبێ سەرچاوەکانی بنبڕ بکرێت.. دەبێ شێوەکەی بشێوێنرێ، بۆ ئەوەی لاوەکان ڕوی تێنەکەن، کە بەوەش مەترسیەکەی زیاد دەبێت !

دوو شت لە یەك کاتدا ئاگری ڕق و قینی لە دڵی صەلیبی و صەهیۆنیدا هەڵگیرساند: یەکەم ئەو کت وپڕیەی بەسەر صەلیبیەت داهات، کە دووسەد ساڵ زیاتر دوای پلان دانان پێشبینی دەکرد لە لەناویردنی ئیسلام سەرکەوێت، کەچی لەپڕ بینی ئیسلام لە خەوی بێئاگایی خەبەری بۆتەوە !

دووەم ئامادەیی جولەکەی جیهانیی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەی لەسەر زەوی ئیسلام، دوای تێکۆشانی زۆر بۆ مراندنی، هەتا دەوڵەتەکەی دروست بکات، دوربێت لە مەترسیەکان، جا کاتێکی زانی لەپڕ بەر مەترسی‌یەکە کەوت و ڕوبەڕوو بووەوە ! لەبەر ئەوە هەردوولا ڕێك کەوتن لەسەر پێویستی لەناوبردنی دوژمنە هاوبەشە پڕمەترسیەکەیان.

ئایا بزوتنەوەی ئیسلامیی پێشبینی دەکرد، ڕزگاریبێت لە دوژمنایەتی صەلیبی و صەهیۆنی و فرت و فێڵیان و هەوڵیان بۆ لەناوبردنی؟

وادەزانین ئەوە مەحاڵە !

بەڵام بڕوامان وایە لەگەڵ ئەوەشدا شێوەیەکی تر چاکتر بوو ڕوویدات، ئەگەر کارەکان لەسەر بەرنامەی ڕاست بڕۆیشتایە، ئەگەر جەماوەریش پێش کات بەشداریان بکردایە لە ململانێکە، بە هۆشیاریەوە بە حەقیقەتی کێشەکە و، حەقیقەتی ململانێیەکە ! بەڵام جەماوەرەکە لەسەر ئەو هۆشیاریە نابێت، هەتا

---

١ ڕۆژئاوا پێی وایە تەنها دژی ئیسلامی چەکدارە کە شەڕ دەکات، کە ناوی ناوە (ئیرهاب)، جەنگ دژی خودی‌ئیسلام ناکات. ئەوەی ئەو قسەیە بەدرۆ دەخاتەوە، هەڵوێستی ڕۆژئاوا بوو بەرامبەر بزوتنەوەکەی جەزائیر، خۆ ئەوان شەڕخواز نەبوون و بەرنامەکەیان شەڕخوازی نەبوو، بەڵکو لەڕێگای سندوقی هەڵبژاردنەکانەوە گەیشتنە حوکم لەسەر بەرنامەی ڕۆژئاوا خۆی، بەڵام ڕۆژئاوا نەیتوانی قبوڵی بکات. ئەوەش دەبێتە بەڵگەی ئەوەی نایەوێت ئیسلام حوکم بکات بە چاوپۆشین لەو وەسیلەیەی پێی دەگاتە حوکم!

لەوەوپێش پەروەردە نەکرابێت! پەروەردەی خوازراویش نایەتە دی هەتا بنکەکـە لەسەر پەیڕەو(منهج)ێکی ساغ دروست نـەبوبێت، هـەروەها ئـەو کەموکوڕیـەی لـە هەلقەی یەکەم بووە هۆی کەموکوڕی زنجیرەیی لە هەلقەکانی دواییدا!

پاشان ئەوەبوو کە لە بەشەکانی یەکەمدا ئاماژەمان بـۆ کـرد، لـە کاردانـەوەی لێدانە دڕندانەکەی دوژمنەوە بەرەو ڕویان کرا، تەمومژی لە بنکە و جەماوەردا زیاد کـرد، مەبەسـتمان لـەوە چوونـی هـەندێ لـە کۆمەڵـە ئیسـلامیەکان بـوو بـۆ نـاو پەرلەمان، ئەوەی بووە هۆی توانەوەی کێشەی شـەرعیەت و، کێشـەی سـەپاندنی حوکم کردن بە شەریعەتی خوا، هەروا چەند کۆمەڵێکی تریان چونـە نـاو ململانێـی چـەکداری دژی کاربەدەسـتان، کـە بـووە هـۆی بـە پـەراوێز کردنـــی کێشـــە بنەڕەتیەکان، کارەکـەش لـە هەسـتی خـەڵکدا گۆڕا بـۆ کێشـەی لێـدەر و لێـدراو، سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو![1]

پاشان کۆمەڵانێکی تر لە کۆمەڵانی کـاری ئیسـلامی زێدەڕەوییـان کـرد لەگـەڵ خەڵك.. لەگەڵ ((جەماوەر)) کەوتنە جەنگێکی خوێناویەوە.. لەسەر ئەو بنەمایەی کافرن کوشتنیان دروستە مادام ناچنە ناو ((کۆمەڵی موسڵمان))ەوە!

ئەم کارە شوێنەوارێکی خراپی هەبوو لەسەر هـەموو کـاری ئیسـلامیدا. بێجگـە لەوەی خەڵکی بەگشتی لەو کارانە دورخستەوە کە لـە شـەرعی خـوادا پاڵپشـتیان نیە، جا هەلێکی چاك رەخسا بۆ هۆیەکانی ڕاگەیاندن، ئەوانەی خۆیان مەڵاسدابوو بۆ بزوتنەوەی ئیسلامیی بۆ ڕەنگ کردنی هەموو مەیدانەکە بەڕەنگی خوێنـی ڕژاو، هەرچەندە لـە بەشـێکی کـەمی گۆڕەپانەکەدا خـۆی دەنوێنـێ، هـەروەها هـەموو کـارێکی ئیسـلامی عـەیبدار کـرد، جـا جۆرەکـەی هـەرچی بووبـێ نـاوی نـا کـاری تۆقێنەر(ارهابی) پێویستە جەنگ دژیان بکرێت و سەرچاوەکانی بنبڕ بکرێن!

هۆیەکانی ڕاگەیاندن پێویستیان بە کەسێك نەبوو ئاگاداریان بکاتەوە، یا پاڵیان پێوەبنێ بـۆ هـەل قوازتنـەوە، چونکـە -بـە هەڵوێسـتی دژایـەتی بـۆ ئیسـلام- ئامادەیە بۆ قۆزتنەوەی ئەو هەلە و تا ئەوپەڕی بەکارهێنانی!

وەك چۆن کاردانەوەکە، سەبارەت بەو تەم و تاریکیەی دەوری کێشەی (لا الـە

---

١ بگەڕێوە بە بەشی (هۆیەکانی پەلەکردن) لە سەرەتای کتێبەکەدا.

الا الله)ی دابوو، جا چ سەبارەت بە بنکەکە بێت، یان جەماوەر. بەڕاستی هەڵگرانی بیرۆکەی ئیرجائی بەتوندی بەرگری لە بیرۆکەکەیان دەکەن و بە هەموو هۆیەك بڵاوی دەکەنەوە، هەتا (زاناکان)یش کەوتنە گێژاوەکەوە، ئەوانەی خەڵك بە ئەهلی زیکری داناون و لەکاروبارلیاندا بۆ لایان دەگەڕێنەوە، جا ئەوانیش بەگەرمی و گوڕی نەریی شیرك دەکەن لەوانەی کەوتونەتە ناو شیرك و، بڕوانامەی بڕوا پتەویان پێدەبەخشن! لە هەستی خەڵکدا ئەو تاوانە گەورەیە، کە دەربارەی خوا دەکرێت ئاسان دەکەن، ئەویش پشت کردنە لە شەریعەتەکەی و، حوکم کردن بە شەریعەتی نەفامی لەجیاتی خوا، گۆیا ئەو کارە تەنها سەرپێچییەکە شایستەی ئەوە نیە هەتا بە ئینکاریەوە ئاماژەشی بۆ بکرێت! بەڕاستی باشتر وابوو، کە کێشەی ڕێڕەوەکە درێژتر بێت لەسەر هێڵی فێرکاریی، کە لە بنکەوە دەست پێدەکات پاشان –لەسەرخۆ– فراوان دەبێت بە فراوان کردنی بنکەکە، بێئەوەی جەنگ لەگەڵ ((جەماوەر)) بکرێت.

*   *   *

پاشان کاری ئیسلامی لەبەر چەند هۆیەك پارچەپارچە بوو.. لەوانە نەبوونی سەرکردەیەکی گەورە، کە کاری ئیسلامی لەخۆ بگرێ و یەکی بخاتەوە، یان بە لایەنی کەمەوە لە یەکیان نزیك بخاتەوە، هەروا بوونی سەرکردەی بچووك، هەریەکەیان بەخۆی و ڕای خۆی کاریان دەکرد، هەریەکەیان وای دادەنا، کە خۆی لەسەر هەقە و هەموو ئەوانی تر بەهەڵەداچوون.

هەر لەو هۆیانە زۆر لەو لاو و گەنجانەی بە بانگەوازیی هەڵدەستان، لەناو کۆمەڵێکدا دروست نەبووبوون، کە گیان و پەیوەندی برایەتی تێیدا پەروەردەکرابێت، بەڵکو لەسەر پەیوەندیەکی فیکری بێهێز دروست بووبوون، کە هەڵوەشاندنەوەی ئاسان بوو، لە کاتی ڕودانی هەر جیاوازیەك لە تەفسیر، یا تەئویل، یا تێگەیشتندا. جا ئەوە بووە هۆی پارچەپارچەبوونی کۆمەڵەکە بەخێرایی و، هەندێکیان لە هەندێکیان هەڵدەگەڕانەوە.

هەر لەو هۆیانە کەمی زانستی شەرعی بوو، کە ڕێسا و ڕێکخەری پێویست بۆ فیکر و ڕەفتار پێك دێنێت.

هەر لەو هۆیانە کاری بەردەوام لەلایەن ئەوانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن، بۆ قوڵکردنەوەی جیاوازیەکانیان و پچڕاندنی پەیوەندیەکانی نێوان خەڵك.

جا ئایا ئەو حاڵە ئومێدی چاککردنی هەیە؟ ئایا ئومێد دەکرێت لە هەموو روەکانەوە لەوانەی پەلەیان کرد بەڕێڕەوەکەدا بچنەوە و، ئەو هەڵانە راست بکەنەوە، کە تێی کەوتوون و لەسەرەوە دەست پێبکەنەوە لەسەر ڕێنمایی لە بەرنامەی ڕاستی پێغەمبەر؟

بەراستی ئەوەی ڕویدا قەدەرێك بوو لە قەدەرەکانی خوا.. بەڵام ئێمە لە کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرﷺ فێربووین، کە بڕوا بوون بە قەزاو قەدەری خوا، لێپرسراوێتی مرۆڤ بەرامبەر هەڵەکانی رەت ناکاتەوە، کاتێ هەڵەی کرد، ڕێش ناگرێت لە هەوڵدان بۆ ڕاستکردنەوەی ئەوەی هەڵەی تێداکردوە.

جا ئایا ئومێد هەیە کاری ئیسلامی ڕێڕەوەکانی راست بکاتەوە و، جەولەیەکی نوێ دەست پێبکاتەوە، کە لە ڕاستیەوە نزیکتر بێت؟!

بەراستی ڕاستکردنەوەی ڕێڕەو بە هەموو بارێکەوە پێویستە.. بەڵام لەوانەیە یەکێ بڵێ: دوژمنەکان واز لە کاری ئیسلامی ناهێنن ڕێڕەوی خۆی راست بکاتەوە، پێش ئەوەی بتوانێ ڕاستی بکاتەوە، جەنگی لەگەڵدا دەکەن. ئێمەش پێیان دەڵێین جەنگ وازناهێنێ، بەڵام کاری ئیسلامی بۆ لەناو نابرێت، بەڵکو لەوانەیە ببێتە هۆی تیژبوونەوە و زیادکردنی هۆشیاریی لای خەڵك بە حەقیقەتی جەنگی نێوان جاهیلیەت و ئیسلام.

دیارە ئەرکی ئامۆژگاری بە پێویستی دەمێنێتەوە لە هەموو بارەکاندا: ((الدِّينُ النَّصِيحَةُ: ئایین ئامۆژگاریە))، وتیان بۆ کێ ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: ((لِلَّــهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِعَامَّةِ الْمُسْــلِمِينَ وَخَاصَّتِـهِمْ: بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، بۆ کتێبەکەی، بۆ گشتی موسڵمانان و تایبەتیەکانیشیان)).[1]

---

١ متفق عليه.

# ڕوانینێک بۆ ئاینده

زۆر کەس کاتێ دەڕوانننە ئەم واقیعەی ئێستا بێزار دەبن، جا چ بەرامبەر بەو جەنگە دڕندانەیە بێت، کە بەرەو ڕوی بزوتنەوە ئیسلامیەکان بۆتەوە لە هەموو زەویدا، یان بەرامبەر بەوەی رویداوە –بەردەوامیشە– لە شپرزەیی ڕاڕەوی بزوتنەوەکەدا. لە رویەکی ترەوە وای دادەنێن، کە کاری ئیسلامی ئاییندەی رونی نیە، ئەو واقیعە خراپەی ئەمڕۆ موسڵمانانی تێدا دەژین بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو خراپیەی کە تێیدایەتی، یان بەرەو خراپتر دەچێت.

بەڵام ئێمە بیروباوەڕمان وایە کە ئایینده هەر بۆ ئیسلامە.

دیدەکەشمان لەسەر شتی خەیاڵی و خەو بنیات نانێین، چاویشمان داناخەین بەرامبەر ئەو بەربەستانەی لە ڕوی کاری ئیسلامیدا هەن و بەردەوامن، جا لە ناوخۆوە بێت، یان لە دەرەوەی و بە کەمیان دانانێین و کاریگەرییان لەسەر کاری ئیسلامی هەر بە کەم دانانێین.

بەڵام بڕوایکی چەسپاومان هەیە، کە مرۆڤ ئەوە نیە قەدەرەکان دابنێت، جا دۆست بن، یا دوژمن، بەڵکو خوا قەدەر دادەنێ، لەوەپێش و لەدواییشدا خۆی خاوەنی فەرمانە، ویستی ئەو جێبەجێکەرە و قەدەری ئەو زاڵە؛ ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ: خوا لەسەر کاری خۆی زاڵە، بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە لێنەزانن.﴾یوسف:٢١.

خوا خۆی بۆ ئەم ئایینەی داناوە، کە لەم زەویەدا بمێنێتەوەو سەرکەوێت بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ: ئەو خودایە پێغەمبەری خۆی بەڕێکرد بۆ ڕێبەری و ڕاگەیاندنی دینی ڕاست، تا سەری خا بەسەر هەموو دینەکاندا. ، جا با بتپەرستەکانیش خۆشیان نەیە.﴾الصف:٩.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((لَيَبْلُغَنَّ هَذَا الأَمْرُ مَا بَلَغَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ: کوێ شەو و ڕۆژی پێبگات ئەم ئایینەشی پێدەگات.))[1]

قەدەری خوا لە میانەی دەستورەکانی دەڕوات، کە گۆڕانی بەسەردا نایێت، هەروەها لە میانەی بەڵێن و هەڕەشەکانیدا و لە میانەی ویستی بەربڵاویدا دەڕوات، کە بە هەر شتێك بفەرموێت ببە دەبێت، ئەو هۆیانەش دروست دەکات، کە هەموو شتی پێ جێبەجێ دەبێت کاتێ بیەوێ ببێت.

* * *

ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی شێوەکارەکانی خوا و لەبەر ڕۆشنایی بەڵێنی خوا و هەڕەشەکانی، بڕوانینە هەڵوێستەکان، لەسەر گۆڕەپانەکەدا دوو رەگەزی دژ بەیەك دەبینین: بزوتنەوە ئیسلامیەکان لەلایەکەوە، دوژمنەکانی ئیسلام لە صەهیۆنیەکان و صەلیبیەکان و یارمەتیدەرانیان لەلایەکی ترەوە. لە ئاییندەیەکی نزیکدا، یان لە ئاییندەیەکی دوردا چی لەو دوانە پێشبینی دەکرێت؟

بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش، لەکاری ئیسلامیدا هاوبەشیان کردووە بە هەوڵێکی دیار، کە گومانی تێدا نیە. بڵاوبوونەوەی گیانی ئیسلامەتی لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئیسلامی و، بە ئارەزو و حەزی گەرم و گوڕ بۆ گەڕانەوەی ئیسلام لە چوارچێوەی لاوەکاندا بەتایبەتی، ئەو دوانە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو هەوڵەی بزوتنەوەکە داوێتی لە ماوەی نیو سەدە زیاتر، هەر لەکاتی ڕوخانی خەلافەت هەتا ئێستا، دوای فەزڵی خوا و ویستی خوا. بەڵام ئەو سەلبیاتانەی لە کاری ئیسلامیدا هەیە ئاستەنگ و لەمپەرێکی ئاشکران، کە زۆر لە وزەکانی کارکردن بە فیڕۆ دەدەن و پەرت و بڵاوی دەکەن، نایەڵن کۆششەکەبەرووبومەکەی بدات، جا ئایا رەوشەکە هەر بەو بارەوە بەردەوام دەبێت؟

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ: بڵێ: ئەوانەی وا لە ئاسمانەکان و زەمینەدا هەن -لەخوا بەدەر- لەپیوار(غەیب) بێخەبەرن.﴾النمل:٦٥.

بەڵام کارەکە لە یەکێ لەم دوو شیمان(احتمال)ە دەرناچێت: یان ڕەوشەکە

---

[1] رواه أحمد

لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام دەبێت، یان دەگۆڕێت.

ئێمە هیوامان وایە –بەو تاقیکردنەوە تاڵانـەی کاری ئیسـلامی پێدا دەڕوات– ڕەوشەکە بگۆڕێت بۆ شێوەیەکی ڕاست و ئەو هەڵانەش کە لێی کەوتونەوە نەمێنن و، ڕاڕەوێکی ساغ لەسەر بەرنامەیەکی ساغ دەست پێبکات.

بەڵام ئێمە گریمانەی شتێکی خراپتر دەکەین، کە ئەویش ئەوەیە ئەوانەی کاری بانگەواز دەکـەن لەسـەر هەڵوێسـتی خۆیـان پێداگـری دەکـەن، کـەوا بەرنامـە هەریەکەیان بەرنامەی ڕاستە و ڕاسـتی پێکـاوە، ئـەوەی جگـە لـەو بانگـەوازی بـۆ دەکـات دورە لـە ڕاسـتیەوە، یـان لەسـەر ئـەو بناغەیـەی گەڕانـەوە نـابێت، دوای ئەوەی هەر بزوتنەوەیەك چەند هەنگاوێکی باشـی نـاوە بـۆ پێشـەوە، یـان لەسـەر بناغەیەکی تر، کە هـەر بزوتنـەوەیـەك بتوانێـت پاسـاوی بـەردەوامی خـۆی لەسـەر هەڵوێستەکەی پێبکات.

جا ئەوکاتە چی ڕودەدات؟ ئایا پەکی خوا دەخـەن؟ یـان خـوا قـەدەری خـۆی جێبەجێ دەکات، جا خەڵك ڕازی بێت، یان ڕازی نەبێت؟

بەڕاستی لەشێوەی کاروباری خوادا، ئامرازی گۆڕان بەردەوام هەیە:

﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَـٰلَكُم: ئەگـەر پشتیشـی تێبکـەن، چینێکـی تـر بـە ئێـوە دەگۆڕێتـەوە، کـە هـەرگیز وەك ئێـوە نەچن.﴾محمد:٣٨.

جا ئەگـەر قـەدەری خـوا وابێت ئـەم ئایینـە هـەر بمێنێت و بەسـەر هـەموو ئایینەکانی تردا سەری بخات، وەك خۆی ڕایگـەیاندووە لـە قورئانەکـەیدا و لەسـەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە، ئەوا سەلبیاتی کاری ئیسلامی ئێستا لەبەردەم قـەدەری خوا و ویستی خوادا خۆی بۆ ڕاناگیرێت.

خوا بەڵێنی خۆی جێبەجێدەکات، بۆ جێبەجێ کردنیشی هەر هۆیـەکی ویسـت دروستی دەکـات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا: خـوا بـە مەبەستی خۆی دەگا، دیارە خودا بۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە.﴾الطلاق:٣.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ

بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەرکەس لە دینی خۆی پاشگەز ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێ وا دەخات ڕو، خۆشی بوێن، ئەوانیش خوایان خۆش بوێ و لە ئاست بڕواداران نەرم و نیان دەبزونەوە و لە بەرامبەر دوژمنانی دیندا سەربڵند و توند وتیژن، خەزا لەڕای خوا دەکەن و لە تەشەری سەرکۆنەکەران ناترسن. ئەمە زێدە خەڵاتێکە لەخوداوە بەهەرکەسێ خۆی حەز بکا پێی دەبەخشێ. خوا زانایە و -لە بەخشین- زۆر دەس گوشادە.﴾المائدة:٥٤.

*　　*　　*

بەڵام با بڕوانین دوژمنان، لە یاسا و دەستوری خوا و لە بەڵێن و هەڕەشەکانی‌دا، چی بەوانەوە تایبەتە.

توندترین شتێك لەشێوەی کارەکانی خوا، کە بەسەر ڕۆژئاوای خاچپەرست پیادە ببێت، ئەو فەرمایشتەی خوایە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ: جا وەختێ ئەو هەمو ئامۆژگاریانەیان -کە کرابون- لەبیرەوچو، هەمو دەرگای بەختەوەریمان بۆ کردنەوە.﴾الأنعام:٤٤.

ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەوان ژیانی دونیایان ویستووەو لەپێناویدا کاریان کردووەو هەوڵیان داوە، خوایش پاداشتی کارەکانیانی لە دونیادا داونەوە، بەپێی شێوەکارێك لە شێوەی کاروبارەکانی: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ: هەرکێ ژینی ئەم دنیایە و زەرق و بەرقی ئەوی دەوێ، ئێمە مزەی کردەوەیان -بەتەواوی- هەر لەم دنیایە دەدەینێ و چیشیان لێ کەمەوە ناکەین.﴾هود:١٥. هەروا ئەوەش دووبارە بەپێی ویستی خوایە، کە پێشتر ویستی لەسەر بوە، کەوا خوا دونیا وەك یەك دەدات بە کافر و بڕوادار، هەر یەکە بەپێی هەوڵ و کۆششەکەی، لە بێبڕوا ناگرێتەوە، بەڵکو بۆیان زیاد دەکات هەتا بێبڕوایان زیادبێت: ﴿كُلًّا نُّمِدُّ

هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا: هـــەموو لایان- چ ئەوان و چ ئەمانە- لە خەڵاتی پـەروەردگارت بێبەش ناکەین، خـەڵاتی پەروەردگاری تۆ هیچ لەمپەری لەبەر نیە.﴾الأسراء: ٢٠.

﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ: با ئەوانـەی خوانەناسن، وا بیر نەبەن ئەو مۆڵەتەی دەیاندەینێ چاکەیە بۆیان، هەر بۆیە مۆڵەتیان دەدەین تـا تاوانیـان فرەبێ، ئازارێکی ئاورِوبەریش بەشیان دەبێ.﴾آل عمران:١٧٨.

جا ئەگەر رۆژئاوای ئەمڕۆ بەدەسـەڵات بێـت لەسـەر زەویدا، سـەرکەوتوو بێـت تێیدا بەپێی ئەو یاسا و دەستورانەی خوا؛ ئەوا خۆیان دەڵێـن ئـەو مۆڵـەت پێدانـە هەتا هەتایە بەردەوام نابێت، بـەڵکو کـاتێکی دیاریکراوی بۆدانـراوە، کـە لەلایـەن خـواوە دێــت لەکاتەدانراوەکـەی خۆیـدا: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَـٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ: جا وەختێ ئەو هەمو ئامۆژگاریانەیان-کە کرابون- لـەبیرەوچو، هـەمو دەرگای بەختەوەریمان بۆ کردنەوە، هەتا کەوتنە خۆشی و شادی؛ ئەوسا لە پـڕ و نەکاوێك بەر تورەیی خۆمان خستن و هەموو ناهومێد مانەوە. ئیتر ئـەو کەسانەی پیشـەیان هـەر ناهـەقی بـو، دوابـڕاو بـون و سـپاس بـۆ خــوای ڕاهێنــەری هــەمو دنیا﴾الأنعام: ٤٤-٤٥.

لەگـەڵ ئـەوەی دەروازەی هـەموو شـتێکیان لەسـەر کراوەتـەوە، کـــەچی لـەو تەنگەدەستیەدا دەژین کە خوا بەڵێنی داوە توشی ئەوانەی بکات کە پشت دەکەنە قورئانەکەی.

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ: هەرکەسێکیش پشـت لـە بەرنامـە و یـادی مـن بکـات، ژینـی لـە

تەنگانەدایە و ڕۆژی سەلاش کوێرە لەگۆڕی دەردەخەین.﴾طه:١٢٤.

ئەو تەنگانەیەی ڕۆژئاوا تێیدا دەژی -کە دەروازەی هەموو شتەکانیان بۆ کراوەتەوە لە هۆیەکانی دەسەلاتی مادیی- کە لە دڵەڕاوکێ و شێتی و خۆکوشتندا خۆی دەنوێنێ، لە نەخۆشیەکانی دەروونی و عارەق و مادەسڕکەرەکان و تاوان و، لە نەخۆشی (ئایدز)دا خۆی دەنوێنێ و، نەخۆشی وا لەناویاندا سەری هەڵداوە، کە لەوەوپێش نەبووە، یان بەو شێوەیە بڵاو نەبووە وەك ئەمڕۆ بڵاودەبێتەوە، هەروا خۆی دەنوێنێ لەناو ئەو قەیران(أزمە)انەی دەوری هەموو جیهانی داوە، لە قەیرانی ئابوری و سیاسی و جەنگی و فیکری، یا پێچەوانەی ئەوانە.. ئەوەش لەبەر ئەوەیە، کە دەروازەی بەرەکەت و دەروازەی ئاسودەیی و دڵنیایی، لەو دەروازانە نین بۆ ئەو بێبڕوایانە بکرێنەوە، کاتێ ئەوەیان لەیاد دەچێت کە ئامۆژگاریان کراوە، چونکە ئەوانە تایبەتن بە بڕوادارانەوە، خوا بە فەزڵی خۆی لەژیانی دونیا پێیان دەبەخشێت، جگە لە خۆشی ڕۆژی دوایی، کە بە فەزڵی خۆی پێیان دەبەخشێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ: نیشتەجێی ئەو بازێڕانە ئەگەر خوایان بناسیبا و خۆپارێزیان، دەروازەی بەرەکەتانمان لە ئاسمان و زەمینەوە بەڕویاندا دەکردەوە.﴾الأعراف:٩٦.

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ: ئەوکەسانەی کە بڕوایان بەخوا هەیە و بە یادی خوا دڵیان ئارام دەبێتەوە، باش بزانن کە یادی خوا ئۆقرە و ئارامی دڵانە. ئەوانەی خاوەن باوەڕن و ئاکارچاکن، خۆشی لەوان کە دواڕۆژی باشیان هەیە.﴾الرعد:٢٨-٢٩.

پوختەی قسان ئەوەیە: ڕۆژئاوا ئەمڕۆ خاوەنی هەموو وەسیلەیەکی مادی بەهێزە، بەڵام خاوەنی توانای بەردەوام نیە، چونکە ئەو هۆکارانەی نیە، کە خوا بەردەوامی بۆ خاوەنەکانی نوسیوە، ئەویش بڕوابوونە بەخوا و ڕۆژی دوایی و، کردەوەی چاکە..

گومان لەوەدا نیە، ئەوان کاری چاکیش دەکەن، وەك خزمەتە تەندروستیەکان و ئاسانکردنی ڕێگاکانی ژیان، بەلابردنی بەشێك لەو زەحمەتیانەی مرۆڤ لەزەویدا پێوەی دەناڵێنێ. هیچ نەفامیەك لە نەفامیەکانی مێژوو نیە کە هەندێ لە ئەندامەکانی بە کردەوەی چاك هەڵنەسن، بەڵام ئەوە سیفەتی نەفامی‌یان لەسەر لانابات لە رویەکەوە، چونکە ئەو سیفەتە لە مرۆڤ نابێتەوە هەتا بڕوا نەهێنێ بە خوا و ڕۆژی دوایی و پەیڕەوی ئەوە نەکات کە خوا نادرویەتیە خوارەوە. لە رویەکی ترەوە ئەو خاڵە سپیانەی لەسەر کراسێکی ڕەشی پڕ لە خراپەکاری پەرت و بڵاون، هیچ فریای خاوەنەکانیان ناکەون، ئەو لەناچوونەشیان لێ‌دورناخاتەوە، کە یاسا و دەستورەکانی خوا بڕیاری لەسەر دەدات، هەرچەندە مۆڵەت دانەکە بۆیان درێژە بکێشێت.

بەڕاستی ئەو ئیلحادەی ژیار(حضارة)ی ڕۆژئاوا بڵاوی دەکاتەوە، ئەو لێك هەڵوەشانەوە ڕەوشتیەی هۆیەکانی ڕاگەیاندنیان بڵاوی دەکەنەوە، ئەو بۆشایی‌یە گیانیە نیە و، لە نقوم بون لەوپەڕی خۆشی هەستیی و، ڕازاندنەوەی ژیانی دونیا و، لەبیرچونەوەی ئاخیرەت بە تەواوەتی و، بێ‌ئاگایی لەوەی خوا کردەوەکانی مرۆڤ دەژمێرێ و لێیان دەپرسێتەوە؛ هەموو ئەوانە ژیارێکی ڕاست دروست ناکەن، کە خوا بەردەوامی بۆ نوسیبێت لە زەویدا، ئەگەر ماوەیەك مۆڵەتی خاوەنەکانیشی بدات، ئەوا لەبەر حیکمەتێکی خۆیەتی.

ئێمە لەوانە نین ئەو قسانە بۆ ڕازیکردنی سۆزەکانمان بکەین، یان بۆ ڕاستگێڕانی خەونەکانمان! چەند ساڵ لەمەوپێش (برتزاندرسل) وتویەتی: (بەڕاستی شارستانێتی پیاوە سپیەکە کۆتایی هاتووە، چونکە هیچی بەدەستەوە نەماوە پیبەخشێت).

لەوەپێشیش (ئەلکسیس کاریل) وتویەتی: (ئەم شارستانیە بەرەو ڕوخان دەچێت).

دوێنێ روخانی شیوعیەکانمان بینی، لەم کاتەشدا ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکان دەنوسن –ئەمریکاییەکانیش لەنێوانیاندا– دەڵێن: ئایا روخانی ئەمریکاش دەستی پێکردووە؟ ئەوەندەش سادە نین بڕوامان وابێت ئەوە سبەینێیەکی نزیك ڕوودەدات! چونکە هێشتا لەناو ئەو شارستانی‌یە نەفامیەدا ئەوەندە هۆکار هەیە،

که ماوەیەکی تریش درێژەی پێبدات، بەپێی شێوەی کاری پەروەردگار. لەوانە بلیمەتی لە رێکخستندا، جدیەت لەکاردا، سوربون لەسەر وردکاریی، بەتوانایی لەسەر پلان دانان. سەرەڕای جێگری ژیاریی(حضاري)، کە دەرکەوتنی دەبێتە هۆی ڕوخاندنی بەپەلەی ئەو ژیارەی هێشتا دەرنەکەوتوە!

بەلاّم هەموو ئەوانە چارەنوس ناگۆڕن، چونکە شێوەکارێکە لە شێوەی کاروباری خوا!

* * *

بەلاّم جولەکە کاری جیاوازی تریان هەیە..

بەڕاستی خوا زەبونی و چارەڕەشی لەسەر نوسیون بەهۆی کردەوەکانیانەوە، بەلاّم بۆ ئەوە هەلاوێردن(استثناء)ی داناوە .. یان چەند هەلاوێردنێك.

﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا: هەر لەناو کتێبەکەدا ئاگاییمان بە نەوەی ئیسرائیل دا، کە ئێوە لەم سەرزەمینە-لە دوو هەلدا- مل لە بەدفەڕی دەنێن و زۆر بە توندی بادی هەوایی دەنوێنن، هەرکە یەکەم لەم دو هەلانە هاتە بەر، چەند عەبدێکی هەرەئازای خۆمان ناردنە سەر، گشت ولاّتیان لێ ئاژنین. ئەم بڕیارەش جێبەجێ بوو.. لەپاشان کارێ وامان کرد ئێوە لەوان بەهێزتر بن؛ هەژماریشتان زۆرتر بێ و بەدارایی و منداڵیش بن، یارمەتیمان پێ گەیاندن.. ئەگەر ئێوە چاکە بکەن، چاکە لەگەڵ خۆتان دەکەن؛ ئەگەریش خراپەتان کرد، لە خۆتانە. هەرکاتێکی بەڵێنی

پاشین هاتەجێ، دیسان دەنێرینە سەرتان، واتان لێکەن پەژارە و خەم لە روخسارتانا دیاربێ هەتا بشچنە مزگەوتەوە–وەك جاری پێشوشی چونێ– و هەرچێکیشیان دەسکەوێ تەفروتونای کەن. بەشکو پەروەردگاری خۆتان بتانخاتە بەر بەزەیی. ئەگەریش تێهەڵچنەوە. ئێمەش تێهەڵدەچینەوە﴾الأسراء:٤-٨

﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ: هەر ژێرچەپۆکی و زەبونی بۆتە بەشیان، جا لەهەر جێ بن؛ مەگەر هەر پەیمان لەگەڵ خودا و خەڵکا بگاتە فریایان.﴾آل عمران:١١٢.

جولەکە ئێستا لەسەر لوتکەی ئەو جیاکردنەوە و هەڵاوێردنە، کە خوا بەڵێنی پێداون.. دەستیان بەسەر هەموو زەویدا گرتووە، جگە لەوانەی پەروەردگارت رەحمی پێکردوون، سەرۆك کۆمارەکان بەئارەزوی خۆیان دادەنێن و سیاسەتەکانیانی بەسەردا دەسەپێنن، ئەوانە لادەبەن، کە لێیان تورەدەبن و دەسەلاتەکەیان لێدەسەننەوە، ئەوانەش دەکوژن، کە لە رێگایاندا دەوەستن، وەك چۆن (کیندی) و گەلێ خەڵکی تریان کوشت.. بەلام هەموو ئەمە لە بنکەکە هەلاوێردراوە!

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ: ئەوکاتەشتان لەبیر بێ کە پەروەردگاری تۆ رایگەیاند: دەیانکەمە بەرفەرمانی کەسانی وا کە تا قیامەت–بەتوندی– ئازاریان دەن.﴾الأعراف:١٦٧.

ئەوە ئەو رێسا(قاعدة) هەمیشەییەیە، جگە لەو هەلاوێردراو(استثناء)ە، هەلاوێردراویش زۆر دەوام ناکات، چونکە پێچەوانەی رێسایە!

رێسا لە ئەندازەی خوای پاك و بەرزە، هەلاوێردنیش هەر بە قەدەری ئەوە، بەلام سروشتی کارەکان وایە، کە هەلاوێردن کۆتایی دێ و کارەکە دەگەرێتەوە سەر ئەوەی لە رێساکەدا بریاری لەسەر دەدرێ، بەپێی بەڵێنی خوا و هەرەشەکانی.

بەراستی ئێمە نازانین حیکمەتی خوا چیە لەو هەلاوێردنانەی لە ئایەتەکانی قورئاندا باسکراون، بەلام روداني هەر دەبێت، جا لە حیکمەتەکەی گەیشتبین، یان

حیکمەتەکەیمان نەزانیبێت.. گرنگ ئەوەیە ئێمە هەستی پێبکەین، کە ئەوە لە ڕێساکە جیایە و، کاتی دیاریکراوی بۆ دانراوە.

جولەکە خۆشیان ئەوە دەزانن! لە خودی کتێبەکەیاندا دەیزانن، نەك لە سەرچاوەکانی بێگانەوە.

کاتێ نەفامی سەردەم بەپێی ڕێوشوێنی خوایی دادەتەپێ، بە حوکمی ئەوەی خراپە و گەندەڵیان لێ دروست بووە و هەیە، ئەوکاتە مرۆڤایەتی پێویستی بە جێگر(بدیل) هەیە، کە ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە.

هەر ئیسلامیش جێگر(بدیل)ی ئەوەیە، هەر ئیسلامە هیدایەت و ڕێی ڕاست بۆ زەوی دەگێڕێتەوە و حاڵ و بارەکانی چاك دەکات و لە نەخۆشییەکانی چاکی دەکاتەوە: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ ۝ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەی ئەهلی کتێب! بزانن ئەوەی کە هاتۆتە لاتان پێغەمبەرێکی ئێمەیە؛ زۆر لەو مەبەست و باس و خواسەی کە ئێوە لە کتێبی خۆتان حەشارتان دا، ئەو بۆتانی دەردەخات و لێتانی ئاشکرا دەکا و لە زۆرانیشی وازدێنێ. لەلای خوداوە روناکی و کتێبێکی دیاریدەرتان بۆ هاتوە.. بەو قورئانە، خوا ئەوانەی شوێنی ڕەزای ئەو دەکەون، دەخاتە سەر ڕێی هێمنی و بە ئیزنی خۆی لە تاریکی دەریان دەخا و بەرەو روناکیان دەبا و ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدا. ﴿المائدة:١٥-١٦.

ئیسلام ئەو بەرنامە و پەیڕەوە تەواوە ڕاستەیە، کە خواروخێچی تێدا نیە، بەرنامەی نەفامیەکانیش هەمیشە کەموکوڕی و لاریان تێدایە.

ئەمڕۆ سەدەها هەزار خەڵك، هەموو ساڵێك لەو تاریکاییەی تێیدا دەژین هەڵدێن و بەرەو ڕۆشنایی ئیسلام دێن، نەك بە شوێنکەوتنی ئەو نمونەی هەیە، چونکە موسڵمانان لە واقیعی ئێستادا نابنە نمونەیەك چاویان لێبکرێت، بەڵکو نمونەیەکن،

که خەڵك لە ئیسلام دەرەوێننەوە! بەڵام چزانْ و داخکردنی ون بوون پاڵ بە هەندێ خەڵکەوە دەنێت بۆگەڕان بەدوای ڕێگای ڕزگاربووندا، ئەو ڕێگایەش لە ئیسلامدا دەدۆزنەوە!

بەڕاستی ڕۆژئاوای ون بوو خاوەنی زانست و شارستانیەتەکی مادی گەورەیە، بەڵام گیانی تێدا نیە.. ئەو گیانەی بەرەو خوا بڕوات، ئەو گیانەی ڕێنمایی بەهیدایەتی خوا دەکرێت. هەر ئیسلامە خاوەنی ئەو گیانەیە، لەهەمان کاتیشدا نایکاتە جێگری زانست و شارستانیەتی مادیی بەڵکو دوانە(توأم)یەکی تەواون:
﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ۝ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ: کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی ڕاگەیاند: وا خەریکم مرۆیەك لە قوڕ دروست دەکەم، کاتێ لەشیم تەواوکرد و لە گیانی خۆم فوم پێداکرد، هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص:٧١-٧٢

مستەقوڕێك و فویەك لە گیان هەردوکیان لەگەڵ یەکدا (مرۆڤن). مرۆڤی تەواوی بەیەکەوەبەستراوی هاوسەنگ، مرۆڤی پێگەیشتوو، کە هەڵدەسێت بە ئاوەدانکردنەوەی زەوی لە سەر ڕێنمایی و ڕۆشنبینی، هەر لەو کاتەدا چاو دەبڕێتە ڕۆژی دوایی، کە ژیانی تێدا تەواو(کامل) دەبێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ: ئەوە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان تێیدا بگەڕێن و لە بژێویەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك:١٥.

﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا: بەوەی خوا بەتۆی داوە بەشوێن ماڵی دواییەوە بن! بەشی خۆشت لەم دنیایە لەبیر مەکە.﴾القصص:٧٧.

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ: خوا بەڵێنی بە پیاوان و ژنانی بڕوادار داوە،

باغاتێکیان خەڵات دەکا، جۆباریان بەبەردا دەڕوا و هەر لەوێدا دەمێننەوە. چەندین خانوی هەرەباشی لەناو باغاتی عەدندا بۆ داناون. رەزای خوداش، کە لە گشتی هێژاترە؛ دەسکەوتی مەزن ئەوەیە.﴾التوبة:٧٢.

ئیسلام ئەو رزگارکەرەیە کە خاوەنی هەموو ئەوانەیە مرۆڤایەتی پێویستی پێی هەیە و چاوی تێدەبڕێ.

(ئەمیر تشارلس) وەلی عەهدی بەریتانی، لە موحازەرەیەکی بەنرخیدا، کە لە هۆڵی گۆنگرەکان لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، لە دێسەمبەری ساڵی ١٩٦٦دا داویێتی، کە دەلالەتێکی روونە بۆ ئەو واتایەی ئاماژەمان پێدا! کە وتویەتی: (ماددیەتی سەردەم پێویستی بە هاوسەنگیی هەیە. زیانی ئەنجامەکانی دورخایەنی لە زیادبوندایە)..

بەڕاستی سێسەدەکەی ئەم دواییە، شایەتی دەدات –لەجیهانی ڕۆژئاوادا بەلایەنی کەمەوە– بەشبونێکی ترسناك هەیە لەشێوەی دیدمان بۆ جیهانی دەوروپشتمان. بەڕاستی زانست هەوڵی داوە دەسەلات بەسەر جیهاندا بگرێت لەسەر شێوەی تێگەیشتنمان بۆ جیهان. جا ئایین و زانست لەیەك جیابوونەوە، بەشێوەیەك ئێستا وامان لێهاتووە، وەك (ورد زورث)ی شاعیر دەڵێ: (کەمێك نەبێت لەم سروشتەی کە هەمانە هیچی تر نابینین).

بەڕاستی زانست هەوڵی داوە سروشت لە خوای بەدیهێنەر داماڵێت، بوونەوەری کردووە بە چەند کۆمەڵێك، (المقدس)ی لە گۆشەیەکی دووری ناسەرەکیی تێگەیشتنمان داناوە و، لەبونی کردەیمانی دور خستۆتەوە.

جا ئێستا دەستمان کردوە بە تەقدیرکردنی سەرەنجامە تێکدەرەکان، وا دەردەکەوێت ئێمەش –ڕۆڵەکانی جیهانی ڕۆژئاوا– هەستمان لەدەست دابێت بە واتا تەواوەکەی بەرامبەر ژینگەکەمان و بەرپرسیمان بەرامبەر هەموو ئەو بوونەوەری خوا دروستی کردووە، ئەوەش بەرەو سەرنەکەوتنێکی خراپی بردین لە ئەندازەگیری یا زانینی کەلەپور و حیکمەتی پێشینەکان، ئەو کەلەپورە بەسەر یەك کەوتوانەی لە دێرزەمانەوە بۆمان ماوەتەوە، بەڕاستی چەند زەحمەتیەکی

توند هەیە، وەك گولی‌یەكی[1] كۆمەڵایەتی‌یە، كە خەڵك لێی دەتەكێتەوە.

بەدیدی من شتێكی تر هەیە، كە پێویستی بە بەرامبەر پێكردنێكی گشتگیر(شامل) هەیە. بەڕاستی زانست خزمەتێكی گەورەی نواند و دەریخست بۆمان، كە جیهان زۆر ئاڵۆزترە لەوەی ئێمە بیرمان لێدەكردەوە. بەڵام زانست بەشێوە مادیە تازە تاكەكەی، توانای لێكدانەوەی هەمو شتی نیە. بەدیهێنەری بونەوەر ئەو زانا ماتماتیكی‌یە نیە كە (نیوتن) بیری لێدەكردەوە، دروستكەری سەعاتی یەكەمیش نیە.[2]

بەڕاستی جیابوونەوەی زانست و تەكنۆلۆجیا لە بەها(قیم) و ترازووە ڕەوشتی‌یەكان و پیرۆزەكان گەیشتۆتە ڕادەیەكی زۆر ترسناك. ئەوەش دەبینین لە یاری‌كردن بە بۆماوەییەكان یان لە ئەنجامەكانی هەڵە زانستی‌یەكاندا، كە لە ناشیرینترین وێنەیدا خۆی دەردەخات لە نەخۆشی شێتی مانگا.

من هەمیشە هەستم بەوە دەكرد كەلەپور(تراث) لە ژیانماندا دەستكردی مرۆڤ نیە، بەڵكو ئیلهامێكی خۆرسكی‌یە خوا پێی داوین بۆ زانینی ڕووداوەكانی سروشت و نەغمەی جەوهەری دروست بوو لە یەكەی دژ بەیەكی جیاجیا خۆی نواندووە لەناو هەر دیمەنێك لە دیمەنەكانی سروشتیدا. چونكە كەلەپور ڕەنگدانەوەی یاسای هەمیشەیی بونەوەرە و، پاڵمان دەنێت بۆ زانینی نهێنی‌یە گەورەكانی بونەوەری فراوان بەشێوەیەك بتوانین –وەك (ولیم بلیك)ی شاعیر وتویەتی: هەموو بونەوەر لە گەردیلەیەكدا و هەمیشەیی(أبدية) لە چركەیەكدا ببینین..

بەڕاستی ڕۆشنبیری ئیسلامی لەشێوە كەلەپوریەكەیدا بۆ پاراستنی ئەو دیدە گیانی‌یە تەواوە بۆ جیهان تێكۆشاوە، بەڕێگایەك ئێمە نەمانبینیوە لە نەوەكانی دواییدا لە ڕۆژئاوا پیادە بكرێت. لێرەدا شت زۆرە، كە لە ڕوانینی جیهانی ئیسلامیەوە بۆ ئەو شێوەیە فێر ببین.

---

١ گولی: گرو

٢ نیوتن دەڵێت خوا ئەم بونەوەرەی لەسەر شێوەی سەعاتێكی بونەوەری جوڵە ڕێك و پێك دروست كردووە، بەڵام شتێكی وانیە خەڵك نوێژ بۆ ئەو خوایە بكات كە دروستكەری سەعاتە كەونیە گەورەكەیە، چونكە خۆی ناتوانێ ڕێڕەوەكەی بگۆڕێت ئەگەر بیەوێت بیگۆڕێت! (لەكتێبی: منشأ الفكر الحديث، دانانی بریتون ص١٥١ لە وەرگێڕانەكەدا.

ئێمە –ڕۆڵەکانی ڕۆژئاوا– پێویستمان بە چەندەها مامۆستای موسڵمان، هەیە فێرمان بکات چۆن بەدڵمان فێری شت ببین، هەروەك چۆن بە مێشکمان فێری شت دەبین. نزیك بوونەوەی هەزارەی سێ، دەبێ بە پاڵنەرێکی نمونەیی کە پاڵمان دەنێت بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندیانەو بەرەوپێشبردنی. هیوادارم ئەو هەلەی بۆمان ڕەخساوە لەدەست نەدەین، بۆ گێڕانەوەی دۆزینەوەی لایەنی ڕۆحی، لە دیدمان بۆ بونمان بە گشتی).[1]

*   *   *

هەر ئیسلام ڕزگارکەرە، هەر ئەویش جێگری داهاتووە بە فەرمانی خوا!

قەدەری خواش نادیار(غیب)ە، بەڵام چەند پەلەکردنێکی هەیە.

ئەگەر لە قەدەری خوا بوایە، کە ئەم ئایینە لەسەر زەوی کۆتایی بێت، ئەوا فێڵ و تەڵەکەکەی صەلیبی دەستەبەری لەناوبردنی بوو، ئەو ڕۆژەی دەوڵەتی عوسمانی ڕماند و خەلافەتی لابرد، ئەو ڕۆژە صەلیبی صەهیۆنی وایزانی، کە لە کۆتاییدا سەرکەوتووە بەسەر دوژمنە سەرسەختەکەیدا، بۆیە هێرشی کردە سەری! بەڵام قەدەری خوا شتێکی تر بوو، ئەویش ڕابونە ئیسلامیەکە بوو هاتە کایەوە!

کاتێ صەلیبی صەهیۆنی توشی هیستریا بوو لە صەحوەکەدا، هەڵسان بە لێدانی بە هەمو هۆیە توند و تیژەکەیان کە هەیانبوو، بە گرتن و دەربەدەرکردن و سزادان و کوشتن، وایان دەزانی ئەوە ڕێگەی ڕزگاربونە لەو دوژمنەی، کە وایان دەزانی لێدانەکەی کۆتاییهێنەرە. بەڵام قەدەری خوا شتێکی تر بوو، کە بڵاوبوونەوەی صەحوەکە بوو لە هەموو زەویدا.

هەموویان دەڵێن: ئیسلام بەتەنها جێگر(بدیل)ی داهاتووە، ئەوەی نەفامی لەزەوی خراپی کردووەو تێکیداوە، چاکی دەکات!

*   *   *

ئیسلام لە یەکێ لە دووریانەکەوە هەر دێت. ئەو ڕێگایەی هێمنە و لەسەرخۆیە و پلەپلەیە، کە خۆشمان دەوێ و ڕازین پێی و بانگەوازی بۆ دەکەین، ئەگەر

---

١ وەرگیراو لە ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط) ژمارە ٦٥٩٢ بەرواری ١٩٩٦/١٢/١٥.

تەواوبوونی چەندەها ئەوەش بخایەنێت، یا ئەو ڕێگا توندوتیـژەی کـە کـارە بێئاوەزییەکانی ڕۆژئاواو ئیسرائیل لە دواوەیەتی.

بەڕاستی صەلیبی صەهیۆنی، کـە ئـەمڕۆ دەسـەلاتی بەسـەر زەویدا گرتـووە، بەبێ ئاوەزی گەوجانە کار دژی بەرژەوەندییەکانی دەکات! چونکە ئـەو کارانـەی بەو توندوتیژیەی دژی بزوتنەوە ئیسلامیەکان دەیکات، ئەوە لـە کـاری ئیسلامیدا دروست دەکات، پشت ئەستورتر و پشـی درێژتـر و تێگەیشـتوتر و بەهێزتر دەبن لەوانەی ئەمڕۆ دژیان دەجەنگن.

خاوەن ئاوەزەکانیان ئەوە دەزانن، خەڵکەکەی خۆیانی لێدەترسێنن، بەڵام ئەو رق و قینەی لە دڵیاندایە، کوێری کردون، ئەو ڕاستیە نابینن و گوێیانی کەڕکردوە لەبیسـتنی ئامۆژگـاری، ئەگـەر ئـەو ئامۆژگاریـەش لـە خـاوەن ئاوەزەکـانی خۆیشیانەوە بێت!

ئـەوەش بەقـەدەری خـوا دێتـە ئـەنجام بەپێی شـێوەی کـارێك لـە شـێوەی کاروبارەکانی خوا: ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ۝ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ: هەر چونە جێگەی ئەوانەش کە ناهەقیان لەخۆ دەکرد و تێش گەیشتن کە چیمان بەسـەروان هێنـاو زۆر نەزیلـەشمان بـۆ گوتـون.. مـەکری خۆیـان بەکارهێنا.﴾ابراهیم: ٤٥-٤٦.

ئـەو تەقینـەوە گەورانـەی، کـە هـەردەم لـەمێژوو ڕوودەدات، لەوکاتەیـە، کـە ستەمکاران فشـار دەخەنـە سـەر ڕەوت و تـەوژم(تیـار)ێکـی بـەرز و بڵنـدا. جـا ستەمکاران فشاری دەخەنە سەر، تا دایمرکێننەوە و خەفـەی بکەن، خـودی ئـەم فشارەشـە، تەقینـەوە دروست دەکـات، ئـەوەی لەمەشدا دەبێتـە قوربانی هـەر ستەمکار و تاغوتانن.

ئەو کارەی ئەمڕۆ خاچپەرستی زایۆنی-بەگەوجانە- دەکات، ئا ئەو فشـارەیە، کە تەقینەوە دروست دەکات.

* * *

بە یەك لێدان و جەربەزەی قـەدەر، سێ کـار لەیـەك کـاتدا ئـەنجام دەدرێ.

یەکەم، سزادانی ئوممەی ئیسلامی، لەسەر کەمتەرخەمیان لە ئایینی خوادا.

خوا سپاردەیەکی بەم ئوممەتە سپاردووە، کە لەمێژوودا بەهیچ ئوممەتێکی پێشوی نەسپاردووە، کاتێ ڕێزی گرتووە بەوەی ببێتە ئوممەتی کۆتاهێنەری پێغەمبەران، بە سپاردنی ئەم سپاردەیە کردویەتی بە باشترین ئوممەت و فەزڵی داوە بەسەر ئوممەتەکانی پێشوو: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا؛ فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن. باوەڕیشتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران:١١٠.

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ: بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بکا.﴾البقرة:١٤٣.

بەڵام ئەم ئوممەتە ماوەیەك غافلگیر بوو، پەیامەکەشی لەبیر کرد، نەك تەنها بەرامبەر بە مرۆڤایەتی، بەڵکو بەرامبەر بە خۆیشی.. ئەو کاتەش خوا ئەندازەی دانا کە لەسەر دەستی دوژمنانی سزا وەربگرێ، هەروەك پێغەمبەری ئوممەت ترساندنی: ((يُوشَكُ أن تَداعى عَلَيكُمُ الأُمَمُ كَما تَدَاعى الأَكَلَةُ عَلَى قَصعَتِها: خەریکە نەتەوەکان دەمتان تێبژەنن بتانخۆن، وەك خۆرە چۆن دمم ئەژەنێتە خواردنەکەی))، وتیان: ئەی نێرراوی خوا! ئایا ئەوە لەو کاتەدا لەبەر ژمارە کەمیمان دەبێت، فەرمووی: ((بَلْ أَنْتُم يَوْمَئِذ كَثير، وَلَكِنَّكُم غُثاءٌ كَغُثاءِ السَّيل، وَلَيَنْزِعَنَّ اللهُ المَهَابَةَ مِنْ صُدُرِ أَعْدائِكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ في قُلُوبِكُم الوَهْن: ئەوکاتە ژمارەتان زۆرە، بەڵام وەك کەفی لافاو وان، خوا ترسی ئێوە لە دڵی دوژمنەکانتاندا دادەڕنێ و وەهن دەهاوێتە دڵی ئێوەوە))، وتیان ئەی نێرراوی خوا! وەهن چیە؟ فەرمووی: ((حُبُّ الدُّنْيا وَكَراهِيَةُ المَوْت: خۆشەویستی دونیا و ڕق بونەوە لە مردن)).[1]

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود.

لەوکاتەی خوا ئەندازەی کرد، کە ئەم ئوممەتە لەسەردەستی دوژمنانی سزا وەرگرێ، ئەم دوژمنانەی لەسەر زەوی بە دەسەلات کرد، بەپێی دەستوری خۆی لەبەر ئەوەی ئەوەیان لەبیر کرد، کە ئامۆژگاریان پێکرابوو.

هەروا تا دەربارەیان قەدەرێکی تر بێتە ئەنجام، ئەویش تێك و پێکدانە لەو ژوان(موعد)ەی خوای ئەندازەی کردووە، کە سزایەك بێت بۆ بڕوایان، لەبەر پشت کردن و ستەم کردن و لوتبەرزیان، جگە لەو قەدەرەی لە ڕۆژی قیامەت بۆیان دانراوە، کە خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ: دەسا باڕۆژی قیامەت باری تاوانی خۆیان و ئەو کەسانەش هەلگرن کە بەبێ زانست ئەوان بەڕێیان لادەدەن، ئای چەند باریّ نالەبارە!﴾النحل/٢٥. ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ: با ئەوانەی خوانەناسن، وا بیر نەبەن ئەو مۆڵەتەی دەیاندەینێ چاکەیە بۆیان، هەر بۆیە مۆڵەتیان دەدەین تا تاوانیان فرەوبێ، ئازارێکی ئاوڕوبەریش بەشیان دەبێ.﴾آل عمران/١٧٨.

هەروەها لەهەمان کاتدا پاككردنەوە و هەلاوێردنی بڕوادارانسی لیّ بێتە ئەنجام: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمْحَقَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ: هەتا خوا بڕواداران هەلاوێرێ و بێبڕوایان لەناوبەرێ. ئاخۆ ئێوە لاتان وایە هەر سەربەخۆ دەچنە بەهەشت؟﴾آل عمران: ١٤١-١٤٢.

هەروەك چۆن بەقەدەری خوا موسا لە تەلاری فیرعەون پەروەردەبوو، ئەمڕۆش بەقەدەری خوا نەوەیەکی نوێ دێتە کایەوە، نەوەیەکی دوای کەفی زۆر بێسود، لەسەر دەستی ئەو دوژمنانەی فێل و تەڵەکە بۆ ئەم ئایینە دادەنێن: ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ: خوا لەسەر کاری خۆی زاڵە، بەلام زۆربەی ئەم مەردمە لیّنەزانن.﴾یوسف: ٢١.

ئەم کارەش بۆ موسڵمانان گەشت و سەیران نیە.. بەڵکو قوربانیدانە، خوێن و فرمێسکە، ئازار و مەینەتیە، ناخۆشی و تاقیکردنەوەیە، کۆششێکی بەردەوامە: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ: تا خوا بزانێ بەوانەی بڕوایان هێناوە، کە جیاببنەوە لە بێبڕوا و ناپاکان، لەئێوەش چەند کەسێك هەڵدەبژێرێ و بەشەهید دەیگێڕێ.﴾ال عمران/١٤٠.

دەبێ موسڵمانان لەبری درێغیان بەرامبەر بەدینی خوا، نرخ و باجەکەی بدەن، دەشبێ هەوڵ و کۆشش بدەن، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ڕاستەڕێ.

بەلام ئارامگرانیان، شەهیدان پێشکەش دەکەن، لەبەرامبەر سزا و ئازار خۆگرن، خوێن دەدەن و فرمێسك دەڕێژن، لەپێناوی خوا جیهاد دەکەن، تا وشەی (الله) بەرزبێ، تا ببنە پەرژین بۆ قەدەری ئەو خوایەی، کە ئەم دینە بەدەسەلات دەکات.

هەروا ئارام گرانیان لەرۆژی دوایی بەهەشتیان پاداشتە لەگەڵ ڕەزامەندی خوا: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ: خوا بەڵێنی بە پیاوان و ژنانی بڕوادار داوە، باغاتێکیان خەلات دەکا، جۆباریان بەبەردا دەڕوا و هەر لەوێدا دەمێننەوە. چەندین خانوی هەرەباشی لەناو باغاتی عەدندا بۆ داناون. ڕەزای خوداش، کە لە گشتی هێژاترە؛ دەسکەوتی مەزن ئەوەیە.﴾التوبة:٧٢.

# ناوەرۆك